# ناوەرۆك

## • فیکر و فەلسەفە



## • ڕەخنە و لێکۆڵینەوە



## • گفتوگۆ



## • لە ئەدەبی گەلانەوە



## • وێستگەکانی سەردەم

# ئازادی لێکۆڵینەوە و ئازادی سیاسی

فرانز نویمان

لە فارسییەوە: نەوزاد حارس

–1–

لە یەکەم ڕوانینەوە لەوانەیە وا بێتە بەرچاو کە دروستکردنی پەیوەندییەك لە نێوان لێکۆڵینەوەی زانستی (*Forschung*) و ئازادی مرۆڤدا، هەرگیز نەشێت. ئەم مەسەلەیە بە ڕووکەش دەرئەنجامی تێگەیشتنی ئێستایە لە ئازادی و لێکۆڵینەوەی زانستی، چونکە ئەمڕۆ هەروەك چەند دەیەیەکی ڕابوردوو، پێناسەیەکی بە گشتی سەلبی و یاسایی، بە واتای زۆرلێنەکردن و ناچارنەکردن، بۆ ئازادی دەکەن و پێیان وایە کە هەرچەند ناچارکردنی سیاسی کەمتر بێت، مرۆڤ بە هەمان ئەندازە ئازادتر دەبێت. "ناچارکردن"یش بە جۆرێك پێناسە دەکرێت کە تەنیا کارەکانی دەوڵەت بە سەرچاوەی بزانرێت. هەرچەندێك دەوڵەت کەمتر دەست تێوەربدات، ئازادی زیاتر دەبێت، بە پێچەوانەشەوە. ئەنجامگیرییەکە بەم جۆرەیە ئازادی یاسایی، هەموو سیفەتەکانی ئازادی سیاسی لە خۆی دەگرێت و تەواویان دەکات و، بەهرەمەندبوون لە مافە بنچینەییەکان و مافە مەدەنییەکان کە لە کۆنەوە هەوڵی بۆ دراوە، بە تەنیایی بەڵگەی ئازادبوونە. هەرجۆرە دەستێوەردانێکی ئەم مافانە، شتێکی پێچەوانەی ڕێساکان وخراپەیەکی ئاوارتەیە کە دەبێت ئاڕاستە بکرێتە. دوا ئامانج، کۆمەڵگەیەکی بێ دەوڵەتە، چونکە دەوڵەت دوژمنی ئازادییە.

ئەوەی تێپەڕی بە باوەڕی من، تێگەیشتنی زۆربەیە لە ئازادی سیاسی. منیش لەگەڵ ئەم تێگەیشتنەدام، بەڵام بە سێ مەرج:

یەکەم، هاوڕا نیم کە دەوڵەت هەمیشە دوژمنی ئازادی بێت. لە بنچینەدا هەرچەند زۆر هەن کە دەڵێن دوژمنی ئازادییە، بەڵام ژمارەی ئەوانەی کە بە ڕاستی باوەڕیان بەمە هەیە زۆر کەمن، چونکە دەتوانرێت وێنای ئەوە بکرێت کە دەوڵەت، چ لە دەرەوە و چ لە ناوەوە، بەرگری لە ئازادی بکات. ئەمە یەکەمین ڕاستکردنەوەیە کە دەبێت لە فۆرمەلەکردنی لیبراڵەکاندا ئەنجامی بدەم.

ئەم ڕاستكردنەوەیە لەم ڕوانگەیەشەوە پێویستە كە ڕاست نییە كەسێك بانگەشەی ئەوە بكات كە دەوڵەت تەنیا سەرچاوەی مەترسییە بۆ ئازادی. بۆ ئەم مەترسییە هەروەها لە لایەن بەرژەوەندی و هێزە تایبەتییەكانەوە سەرچاوە نەگرێت، یان لە لایەن ئەوانەوە كە ئابووری یان كۆمەڵایەتی یان فەرهەنگی یان ئاینیان قۆرخ كردووە؟ هەر كەسێك مێژووی خوێندبێتەوە دەزانێت لە زۆر بواردا گروپە تایبەتییەكان هەوڵیان داوە سیستەمی بەهاكانی خۆیان بە زۆر بەسەر خەڵكدا بسەپێنن، كەواتە پرسیارەكە ئەمەیە كە كەمینەكان چۆن دەبێت دڵنیایی پەیدا بكەن؟ ئایا ئەركی دەوڵەت نییە كە وەك نوێنەری بەرژەوەندییە گشتییەكان، ئەو هاوسەنگییەی كە بەرژەوەندی خۆپەسەندنەی گروپە تایبەتییەكانی خستۆتە مەترسییەوە، دووبارە بگەڕێنێتەوە؟

بەڵام لەگەڵ بوونی ئەم دوو مەرجەدا، ئەم فۆرمەلەیە كە ئازادی یەكسانە بە زۆرلێنەكردن و ناچارنەكردن، ڕاستە، -واتە پێویستە، بەڵام بەس نییە. پێویستە چونكە سەرتاسەری سیستەمی مافە ئەقڵانییەكانی جیهانی مەدەنی دەرئەنجامی هەمان فۆرمەلەیە. كاتێك ئازادی بریتی بێت لە ناچارنەكردن. بە وتەی مافناسان، گریمان بوونی ئازادی و ڕێگرتن لە ناچاركردن لە لایەن دەوڵەتەوەیە مەگەر پێچەوانەی ئەمە بسەلمێنرێت. لەوە بەدواوە لەسەر دەوڵەتە كە لە یەك بەیەكی ئەو نموونانەدا، هەرجۆرە دەست تێوەردانێك لە ئازادی ئاڕاستە بكات. ئەم ئاڕاستەكردنە دەبێت تەنیا بە پێی یاسا و لە بەرامبەر دادگا سەربەخۆكاندا ئەنجام بدرێت.

لێرەدا ناچمە ناو باسی ئەوەی كە وترا (بەش بە بەشی بە چ مانایەك دێت. لە ڕووی مەبەستی ئێمەوە، ئەوەندە بەسە بوترێت كە ئەم ئازادییە نێگەتیڤ و یاساییە، لە جەمسەرە پێویستەكانی ئازادی ئێمەیە و خاڵی ئیمتیازی دەوڵەتی مەدەنییە بەسەر دەوڵەتی توتالیتاردا و دەبێت بە لایەنێكی چاوپۆشی لێنەكراوی چەمكی ئازادیش بژمێررێت. بەڵام ئەم لایەنە یاساییە هەرچەندە پێویست و قابیلی لەدەستدان نییە، بەڵام بەس نییە و وەڵامی ئەم پرسیارە-كە لە ڕاستیدا سێیەمین ڕاستكردنەوەیە لە هاوكێشە دراوەكەدا- ناداتەوە كە "دەمانەوێت بۆ چ مەبەستێك سوود لەم ئازادییە وەربگرین؟" و "گەوهەر و ناوەڕۆكی ئازادی ئێمە بریار وایە چی بێت؟!".

پایەی بەڵگەكانی من تێگەیشتنی پەیڕەوانی ئایدیالیزمە لە ئازادی؛ چەمكی دیاریكراوی خودبوونی مرۆڤە كە دەبێت توانای ئەوەی هەبێت بەهرەكانی خۆی گەشە پێبدات، بەڵام كاتێك مرۆڤ خۆی نەناسێت، چۆن دەتوانێت خودی خۆی دیاری بكات و بەهرە و ئامادەییەكانی خۆی گەشە پێبدات؟

دواجار، خۆناسین بە چ مانایەك دێت؟ بە بۆچوونی من، لەم مەسەلەیەدا سێ شت لە ئارادایە:

ناسینی سروشتی دەرەكی؛

ناسینی سروشتی مرۆڤ؛

ناسینی پرۆسەی مێژوو؛

بوارم پێبدەن سەرەتا ئەم مەسەلە سێ بەشییە بەبێ پەیوەست كردنیان بە چەمكی یاسایی ئازادییەوە بخەمە ژێر لێكۆڵینەوەوە و لە كۆتایی وتارەكەدا لەو پەیوەندی و پەیوەستییە بكۆڵمەوە.

بەڵام لە سەرەتاوە دەبێت جەخت بكەم كە لە دیاریكردنی چەمكی ئازادیدا، بۆ هەر سێ پرسیارەكە كە ئێستا دێنە پێشەوە گرنگی وەك یەك

و یەکسان دادەنێم: سەرەتا، سروشتی دەرەکی لە چی پێک دێت؟ دووەم، پرۆسەی مێژوو چۆن دەڕوات؟ سێهەم، پاڵنەری کردارەکانی مرۆڤ چییە؟ کەواتە زانای زانستە سروشتییەکان و زانای زانستە مرۆییەکان و کۆمەڵایەتییەکان و دەروونناس هەموویان لە ڕووی پلە و گرنگییەوە یەکسانن.

پێدەچێ پەیوەندی نێوان زانست و ئازادی ئەمڕۆ لەبەرچاو ون بووە. چی دی کەس ئەم پرسیارە ناخاتە ڕوو. ئەوەی ئەمڕۆ بیری مرۆڤ چەندین جار زیاتر سەرقاڵ دەکات، سەلماندنی سوودمەندی و کەڵکی پراکتیکیی لێکۆڵینەوەی زانستی (*Forschung*)ە کە بۆ زانای زانستە سروشتییەکان زۆر ئاسان و بۆ زانای زانستە مرۆییەکان زۆر دژوارە. لە ئەمەریکادا سوودی لێکۆڵینەوەکانی زانایانی زانستە کۆمەڵایەتییەکان ماوەیەکی زۆر بەر لە ئێستا ناسراوبووە. لە ئەڵمانیادا ئێستا لە جاران زیاتر گرنگی پێ دەدرێت. بەڵام لێرەدا ئەمجۆرە بەهادانانە بە پێی کەڵکی پراکتیکی جێی سەرنجی من نییە و لەوانەیە لە بنەڕەتەوە تا ڕادەیەک مەترسیدار بێت، چونکە تێگەیشتنی ئەم خاڵە گران و هەندێک نامومکین دەکات کە: بۆچی لێکۆڵینەوەی زانستی بناغەی بنچینەیی ئازادی سیاسی مرۆڤە.

ئەم مەسەلەیە لەبەر هۆیەکی تریش گرنگی هەیە، ئەگەر مەیلی ڕوناکبیرانی هاوچەرخ بە ڕاستی تێگەیشتبم، سەرقاڵبوون بە دیاریکردنی سنووری ناسینی زانستیی چەندین جار زیاترە لە سەرقاڵبوون بەو خزمەتەی ناسینی زانستی بە پێناسەکردنی ئازادی مرۆڤ دەیکات. هەڵبەتە ئەگەر مەبەست خەبات دژی زانستپەرستی بێت —واتە ئەم وێنایە کە لێکۆڵینەوەی زانستی تەنیا چارەی گرفتە مرۆییەکانە— من بە تەواوی لەگەڵ ئەمەدا هاوڕام. بەڵام ڕەخنە لە زانستپەرستی زۆرجار بە بەشێک لە تاریکبینی تازە دەرکەوتوو و مەترسیدار پەیوەستە کە وشیارانە یان نائاگایانە، دەبێتە ئامێری دەستی لایەنگرانی سنووردارکردنی لێکۆڵینەوەی زانستی بە پێی تێبینییە سیاسییەکان.

(*1*)بەڵام ئەم مەسەلەیە —واتە خەباتی لێکۆڵەرەوە زانستییەکان دژ بە تاریکبیران— درووست هەمان ئەو جەمسەرەیە کە چەمکی ناسینی ئازادی (یان بە زاراوەی من، دووەمین جەمسەری چەمکی ئازادی) لە ڕێی حیکمەتی سروشتی ڕۆم و فەلسەفەی ئەپیکۆرۆسەوە دەخاتە مێژووی جیهانەوە. پەیوەندیی ئازادی بە زانستە سروشتییەکانەوە سەرەتا چەندین جار باشتر لەمڕۆ دەرکی پێدەکرا. هەڵسەنگاندنی دەستکەوتە زانستییەکانی ئایۆنیاییەکان و ئەپیکۆرۆس کاری من نییە، چونکە شارەزاییم لەم مەسەلانەدا نییە. تەنیا دەمەوێت پەیوەستیی نێوان ئازادیی سیاسی و لێکۆڵینەوەی زانستی دیاری بکەم. ئەپیکۆرۆس و خوێندکارە ناودارەکەی (لۆکەرتیۆس) ئەم مەسەلەیەیان زۆر بە ڕوونی دەستەبەندی کرد و لە بەرامبەر ئەو کەسانەی کە دیاردەکانی سروشتیان بە کاری سەربەخۆی خواوەندەکان دادەنا، دەستیان کرد بە لایەنگرتن و بەرگریکردن لەم بۆچوونە کە ناچاری یان پێویستیی هۆکاری ئەم دیاردانەن و ئەرکی مرۆڤ ئەوەیە لەم ناچارییە تێ بگات و دانی پیادا بنێت. ئەپیکۆرۆس مەسەلەی گەورەی نێوان پێویستی و ئازادی یان ناچاری و هەڵبژاردنی، بە شێوەیەک خستەڕوو و وەڵامی بۆ دانا کە دەزانرا تێگەیشتن لە پێویستی "یان ناچاری–ضرورت"، ئەگەری ئازادی دابین دەکا. بە باوەڕی ئەو کەسێک کە ئەوەی لا ڕوون دەبووەوە، هەورەتریشقە و برووسکە و هەڵکشان و داکشای ئاو و دیاردە

سروشــتییەکانی تــر بــە ناچــاری "ضــرورت" ڕوو دەدەن و ئــەنجامی ئــارەزووی خواوەندەکــان نییــە، بــەو دەرککردنــەی کــە بــەمجۆرە بــە دەســتی دەهێنــا دەیتوانــی لــە بــەندی تــرس لــە خواوەندەکـان ئـازاد ببێـت و بـەبێ دڵەڕاوکـە ژیـان بەسەر بەرێت.

ئـەم نەریتـە بەرفراوانـە کـە لـە پشـت چـەمکی ئازادییـەوە هەیـە –چـەمکێك کـە سـپینۆزا و هیگـڵ و مارکس جار لە دوای جار لێوەی دواون– هەتا ئەمڕۆ هـەر زینـدووە و ئیلـهام بـەو کۆمەڵـە زانـا گەورانـەی زانسـتە سروشـتییەکان دەدات کـە لـە جـەنگ لەگـەڵ سروشتی دەرەکیدا، نە تەنیا لەوەدان کە سروشت بۆ سـوودوەرگرتن ملکـەچی مـرۆڤ بکـەن، بـەڵکو ئـەم هــەوڵ و تەقەلایــە بــۆ تێگەیشــتن لــە پێویســتی (زەرورەت)، بە خزمـەتێك بۆ ئازادی مرۆڤ دەزانـن. کەواتـە زانسـتە سروشـتییەکان هەرچـەندە دەشـێت بخرێنـە خزمـەتی چـەند ئامـانجێکی دژ بـە ئـازادی مرۆڤـەوە، بـەڵام لـە ڕووی دەربڕینـی چـەمکی ئـازادی چاوی لێ ناپۆشرێت و پێویستە. بە وتـەی مامۆسـتا جیمز کۆنانت لـە زنجیرە وتارەکـانیدا کـە لـە سـاڵی *1952*دا لــە زانکــۆی کۆڵۆمبیــا پێشکەشــی کــرد، زانسـتە سروشـتییەکان نـە سـیحر و جـادوون و نـە بەشێکی بیرکارییـن –زانستی سروشت واتە چالاکی: چالاکییـەك: کـاتێك کـە دەگاتـە خـوارەوە و زیـاتر پەرشـــوبڵاو دەبێتـــەوە، ســـنووری جیـــهانی بۆچوونەکانی خەڵکی ئاسایی دەستنیشان دەکات و بـەم شـێوەیە، هەرچـەندە بـە شـێوەیەکی شـێواو و کەموکوڕیش بێ، تێگەیشـتنیان بۆ ئازادی و ڕێـزی مرۆڤ فۆرمەلە دەکات.

کەواتـە زانسـتە سروشـتییەکان تەنانـەت لـەو کاتەشدا کە ئەنجامەکانی بە شێوەیەکی دیاریکراو و هەسـتپێکرا و بـۆ مەبەسـتی زیانبـەخش بـە ئـازادی سـوودی لێ وەردەگـیرێت، دەبێـت بـە پێشـەکیەکانی پێناسی ئازادی مرۆڤ بژمێردرێت.

گۆتـە لـە بەشـی سـێیەمی "مێـژووی تیـۆری ڕەنگـــەکان"، بـــەمجۆرە دەربـــارەی کارەکـــانی کۆپـەرنیکۆس داوەری دەکــات: "لەوانەیــە هیــچ دۆزینەوەیەك نەگەیشتبێتە ئاستی ئەو کاریگەرییەی کـە ڕێنماییـەکانی کۆپـەرنیکۆس لـە گیـانی مرۆڤـدا کـردی.. بـەم ڕوانینـەی کۆپرنیگـۆس دەرکـەوت چەندان شت هەن کە جگـە لـە وەهـم و خـەیاڵ هیچی دی نـین: بەهەشـتی دووەم، جیـهانی پـاکیزەیی و شـیعر و پـاکژی، شـایەتی هەسـتەکان، بـاوەڕە چەسپیوە نیوە شاعیرانە و نیوە ئاینییەکان. کەواتە سەیر نییـە کـە مرۆ نەیدەویسـت دەسـت لـە هـەموو ئەمانە بەربدات و بە هەموو هێز و توانایـەوە جەنگ لەگــەڵ تیۆرەیــەکی وادا بکــات –تیۆرێــك ئــەو (دانبپیانەرانـەی)؟! کـە تـا ئـەو ڕۆژە ئـەو هــەموو ئازادیی ئەندێشە و مەزنی هەستانەیان لە خەونیشدا نەدەدی، کردنی بە شایستەی ئازادی و مەزنییـەکی ئاوا و بانگی کردنە مەیدان تا شایستەیی خۆیـان بۆ خاوەندارێتی ئەمانە بسەلمێنن".

*(2)*دووەمین لایـەنی ئـەوەی جەمسـەری ئـەقڵی یـان ناسینی ئازادی ناوبرا، پەیوەندی بـە پاڵنـەری کردەوەکانی ئێمـەوە هەیـە. سپینۆزا لـەو ڕووەوە بـە دامەزرێنـەری ڕاسـتەقینەی دەروونناسـی زانسـتی دادەنرێت کە وتوویەتی دەیەوێت "دەربارەی کردەوە و ئارەزووەکـانی مـرۆڤ بـە جۆرێـك بکۆڵێتـەوە وەك ئـەوەی لەگـەڵ هێـڵ و ڕووبـەر و قـەوارە ڕووبـەڕوو بووبێتـەوە". سپینۆزا ئامانجی خۆی بـەبێ تـەمومژ بەم دەستەواژەیە دەربڕی: تەنیا ڕێگەی جێگیربوونی حکومـــەتی ئـــەقڵ، تێگەیشـــتنی ســـەرچاوەی کاریگەرییـەکان و هەڵچوونـەکان و ئارەزووەکانـە کـە ڕەفتـاری ئەقڵانی سنووردار یان ناشیاو دەکەن. لە

کتێبی ئەخلاقدا هێزی ئەقڵ یەکسان بە هەڵبژاردن یان ئازادی مرۆڤ دادەنرێت. سپینۆزا هاوڕای ڕوانینی سەرەکی ئەپیکۆرۆس بوو بۆ سیاسەت و بەم وتەیەی کە ئازادی هەمان پەیبردنە بە پێویستی "ضرورت"، ئەندێشە و هزری ئەپیکۆرسی بە شێوەیەکی بەسوود و کاکڵەدار خستە قاڵبی بەیانەوە. لە کۆتایی وتارەکەدا دووبارە بۆ ئەم بابەتە دەگەڕێمەوە.

هەروەها فرۆیدیش یەکێکە لە هەڵگرانی هەمان نەریت. لێرەشدا دووبارە گفتوگۆ لەسەر تێگەیشتنی کردەوەکانی مرۆڤە بۆ ئەوەی مرۆڤ بتوانێت بە شێوەیەکی ئازادانە -واتە ئەقڵییانە- کاربکات.

بەڵام بە دڵنیاییەوە، دەربارەی سوودوەرگرتنی پراکتیکی لە دەروونناسیش دووبارە وەك گۆڕینی زانستە سروشتییەکان بۆ تەکنۆلۆجیا، دەکرێ مانای لێکۆڵینەوەکە پێچەوانە بکرێتەوە.

تەکنۆلۆجیای وێرانکاری لە لێکۆڵینەوەی زانستە سروشتییەکانەوە سەرهەڵدەدات و ، ئەوەش بە دەربڕینێکی جوان -لە دەروونناسی نوێدا- پێی دەوترێت "هونەری بەڕێوەبردن یان ئاراستەکردنی مرۆڤەکان" (*Menshenfuhrung*) -واتە دەستکاریکردنی تاکەکان لە پێناو مەبەستی دژ بە ئازادی مرۆڤدا.

بەڵام ئەم نەوە زۆڵانەی زانست -واتە تەکنۆلۆجیای وێرانکاری و پڕوپاگەندە- نابێت ڕێمان لێ هەڵە بکات و وامان لێبکات بەدبین بین و بمانخاتە هەڵوێستێکەوە کە لە بارەی"شەیتانێتی تەکنەلۆجیاوە" (*Damonieder technik*) قسە بکەین و حەسرەت بۆ ڕۆژە خۆشەکانی پێش زانست بخۆین و ئەوە فەرامۆش بکەین کە ئەو ڕۆژگارە خۆشانە تەکنۆلۆجیای وێرانکاری هونەری تایبەتی خۆی هەبوو بۆ فریودان و شەیداکردنی دەروونی مرۆڤەکان.

(*3*)سوودوەرگرتنی باش و خراپ لە زانیاری زانستی و دەروونناسی، لە هەندێ ڕووەوە وابەستەی هەلومەرجی مێژووییە، بەمجۆرە، دەگەینە سێهەمین لایەنی جەمسەری ناسینی ئازادی، واتە تێگەیشتن لە پرۆسەی مێژوو. ڕێگەی لێکۆڵینەوە لەم مەسەلەیەدا کە زانایانی زانستە مرۆییەکان (*Geisteswissenschafler*) چەندین نەوە ڕەنجیان تیا داوە و پیاوانی وەك ژان بووین و جیمز هارینگتۆن و مۆنتسکیۆ و ڤیکۆ و هیگڵ و مارکس خوشیان کردووە. ئەوەی کە توانای ئازادبوون بە ئێمە دەدات، دۆزینەوەی دیدێکە بۆ پێویستی پرۆسەی مێژوو، چونکە لە هەلومەرجی جیاوازی مێژووییدا، ئەو توانایانەی کە مرۆڤ بۆ دەستنیشانکردنی خۆی چنگی دەکەوێت، جیاوازە.

-2-

(*1*)لەوەی کە ڕابوورد، بە گشتی ئەو بۆچوونەم ڕوون کردەوە کە لێکۆڵینەوەی زانستی پێویستە نەك لە ڕووی ئەو سوودە پراکتیکییەی کە بۆ دەوڵەت و کۆمەڵگا هەیەتی، بەڵکو لەبەرئەوەی کە ئازادی مرۆڤ بە یاریدەی ئەو دێتە دی، بە شێوەیەکی ئاسایی هەوڵ دەدەن ئەوە نیشان بدەن کە دەوڵەت و کۆمەڵگا چ سوودێکی گەورە لە لێکۆڵینەوەی زانستی وەردەگرن. بەڵام بە ڕای من ئەو هەوڵانە وەك شمشێری دوو دەم وایە. هەرکەسێك بیەوێت ئەوە بسەلمێنێت کە بۆ نموونە لێکۆڵینەوەی ئەدەبی یان خوێندنەوەی فەلسەفەی یۆنانی بۆ دۆخی دەوڵەت و کۆمەڵگا سوودمەندە، ناچار دەبێت پەنا بباتە بەر سەیرترین بەڵگەکان و هێشتا دوورە بگاتە جێیەکیش، وە ئەگەر بیەوێت هەمان کار دەربارەی

زانستە سروشتییەکان یان کۆمەڵایەتییەکان ئەنجام بدات، یەکسەر دووچاری ئەو مەترسییە دەبێت کە دەوڵەت خۆی، ئەوەی کە بە سوودمەندی دادەنێت رێگەی پێ دەدات.

لێکۆڵینەوەی زانستی لەو ڕووەوە هەق و ڕەوایە کە توانا بە مرۆڤ دەدات لە سروشتی دەرەکی و سروشتی مرۆیی و پرۆسەی مێژوو تێبگات و هەر لەبەر ئەمەش یەکێکە لە ڕێ نیشانە بنچینەییەکان بۆ ناسین و دیاریکردنی ئازادی مرۆڤ. تەنیا سەرچاوەی حوکمدان لەم بارەیەوە، ویژدانی زانستی خودی زانا و لێکۆڵەرەوەیە.

(*2*)ئێستە دەگەینە دووەمین پرسیار و ئەویش ئەوەیە: کام بارودۆخی سیاسی بۆ لێکۆڵینەوەی زانستی یارمەتیدەرترە؟

ئەم ڕۆژانە ئەو وەڵامەی کە لایەنی کەم مامۆستایانی زانکۆ و لێکۆڵەرەوان دەیدەنەوە -وە ئەوانیش ڕاست دەکەن- ئەوەیە کە تەنیا ئەو سیستەمە سیاسییەی کە بە تەواوی ڕێز لە مافە مەدەنییەکانی تاکەکەس دەگرێت و جێبەجێی دەکات (چەمکی یاسایی ئازادی)، دەتوانێت لێکۆڵینەوەی زانستی پێشبخات.

بەڵام بۆچی ئاوایە؟ وە ئایا هەمیشە وا بووە؟

ناکرێت بوترێ هەمیشە وابووە. چەمکی تاکگەریی ئازادی کە لە سەردەمی شۆڕشی پاکژخوازانی ئینگلیز لە سەدەی هەڤدەهەمدا بە شێوەیەکی کەم و ڕێژەیی بووەتە بەشێکی دنیای سیاسی ئێمە، نە لە جیهانی یۆنانییەکان لە سەردەمی دەوڵەتشارەکاندا ناسرابوو، نە لە سەدەکانی ناوەڕاستدا و نە لە ڕۆژگاری حکومەتە ڕەهاکان (پاشا دەسەڵات ڕەهاکان لە ئەوروپا).

بەڵام ئایا بە ڕاستی دەکرێت بڵێین کە لە ڕۆژگاری یۆناندا یان لە سەدەکانی ناوەڕاستدا یان لە سەردەمی پاشا ڕەهاکان، هیچ دەستکەوتێکی گەورەی زانستی نەبوو؟ ئەم حوکمە دەربارەی هونەرەکان تەنانەت زیاتر لە زانستەکان ڕاسترە.

کەواتە بە پێچەوانەی ئەوەی کە زۆرجار دەگوترێت، ناتوانرێت ئەوە بسەلمێنرێت کە تەنیا لە هەلومەرجێکدا کە ئازادی بوونی هەبێت، زانست و هونەر پێشدەکەون و دەگەشێنەوە. ئەمڕۆ بەم جۆرەیە، بەڵام بە هیچ شێوەیەك هەمیشە وا نەبووە. بە داخەوە هیچ نووسینێك شك نابەم کە لە ڕووی مێژووییەوە و بە شێوەیەکی ڕێکوپێك و مەنهەجییانە لە هەلومەرجە سیاسی و کۆمەڵایەتییەکانی لێکۆڵینەوەی زانستی کۆڵیبێتەوە.

لەبەرئەمانە، بوار بدەن لە پێشەکی و گریمانە نەسەلماوەکانەوە دەست پێبکەم. بە بۆچوونی من، لە ڕووی فەراهەم کردنی زەمینەیەکی بەپیت و ئامادە بۆ داهێنانی زانستی و هونەری، کۆمەڵگەیەکی یەك بەرگی یان هاوشێوە لە هیچ ڕوویەکەوە لە کۆمەڵگەیەکی ئەم سەردەمە کە پڕە لە ململانێ و بەربەرەکانی کەمتر نییە و لایەنی کەم لە هەمان پلەدایە. فەلسەفە و هونەری یۆنانی و خواناسی و حیکمەتی سەدەکانی ناوەڕاست و بنەماکانی ئەندێشەی زانستی و کارە هونەرییەکان، هەموو لە کۆمەڵگای داخراو و بە ڕێژە هاوشێوەدا دەرکەوتوون کە تیایاندا ئازادی بەو مانایەی کە ئێمە لە پێش چاوماندایە، بوونی نەبوو. بەڵام دەبێت ئەم ڕاستییە گرنگەمان لەبەرچاو بێت کە ئەم یەکبەرگییە یان هاوشێوەییە دەبێت ڕەسەن و ڕاستەقینە بێت، نەك بە زۆر و ستەم و تۆقاندن دروست کرابێت. لەهەر شوێنێك وەکو ئیسپارتە یان ئەڵمانیای نازی (بە حوکمی تیۆری کۆمەڵی نەتەوەیی *Volksgemeinschaft*) یان یەکێتی سۆڤیەت (بە پێی

تیـۆری ستالینیسـتی دەوڵـەتی سۆشیالیسـتی)، یەكبەرگی لەسەر بناغەی تۆقاندن دروست بكرێت، نە زانست پێش دەكەوێت نە هونەر، بەرزبوونەوەی ئاستی زانستیش تەنیا پەیوەندی بەوەوە هەیە كە دەوڵـەت چ سـوودێك لــە لێكۆڵینــەوەی زانسـتیدا دەبینێتـەوە. پلوتـارخۆس لـە ڕۆژگـاری دێرینـەوە گرنگـی بـەم مەسـەلەیە داوە و لــە لێكۆڵینــەوەی دەربارەی لۆكۆرگۆس نووسی: "تـەنیا بۆ مەبەستی پراكتیكـی خوێندنــەوە و نووســین فــێردەبوون. فـێركردن و پـەروەردە بەهـەر شـێوازێكی تـر و هـەر جۆرە كتێب و نامیلكەیەك لە وڵاتدا قەدەغە بـوو". ئەمڕۆ لە دەوڵەتە تۆتالیتارەكاندا كە تیایاندا بناغەی كـار پێشـكەوتنی تـەكنۆلۆجی و ئاراسـتەكردن و بـەڕێوەبردنی مرۆڤەكانـە، هیـچ هۆكـارێك جگـە لــە سوودی پراكتیكی، دەستنیشـانكەری پێشـكەوتنی زانسـتی نییـە و ئەنجامـەكانی بـە جۆرێكـە كـە بـە ڕوونی هەستی پێدەكەین و دەیبینین.

بەڵام كۆمەڵگایـەك كە تەنانەت یەكبەرگی نیوە ڕەسـەنی تیـا باڵادەسـت بێـت (ئـەو یەكبەرگییـە چ لایەنی ئاینی، چ لایەنی كلتووری، چ لایەنی سیاسی هـەبێت) —واتـە كۆمەڵگایــەكی داخـراو كـە لەسـەر تۆقاندن دانەڕێژرابێت— زەمینەیەكی زۆر بە پیت بۆ پێشـــكەوتنی گـــەورەی زانســـتی و هونـــەری دەخولقێنێـت، یــان لایــەنی كــەم لــە ڕابــوردوودا دەیخوڵقاند.

ئەم حوكمـە هـەروەها دەربـارەی ئـەو وڵاتانـەش ڕاسـتە كـە لـەژێر سـایەی حكومـەتی ڕەهـادان: چ شارەكانی ئیتالیا بووبێت كە فەرمانڕەوای بەهێز و بـەتوانا فـەرمانڕەواییان دەكـردو ململانێـی نێـوان زلهێزەكـان و ڕێزگرتـن لـە پلەوپایــەی بلیمەتــەكان، دروستكردنی ئەو پاشماوە مێژووییە شكۆدارانەی شیاو كرد و، چ لە وڵاتە ئەورووپییەكان لە سەدەكانی هەڤدەهـەم و هەژدەهـەمدا بووبێت كە لـەژێر سـایەی حكوومەتـە ڕەهاكـاندا بـوون، هەرچـەندە بـۆ فـەرمانڕەوایی كـردن پێویسـتیان بـە تـەكنۆلۆجیای نـوێ یـان هونـەری ئاراسـتەكردن و بـەڕێوەبردنی مرۆڤـەكان نـەبوو، بـەڵام خۆیـان حـەزیان بـە لێكۆڵینەوەی زانستی دەكرد یان هەستیان دەكرد كە لێكۆڵینەوەی ئاوا شكۆ و ڕێزیان زیاد دەكات كە لە سەردەمی باروكدا بۆ پاراستنی ئابڕوو و شایستەیی پاشاكان پێویست بوو.

(*3*)بەڵام ئەم دۆخە لە سەدەی هەڤدەهەمەوە ڕوو لـە گـۆڕان دەكـات. تـا جیـهان زیـاتر ببێتـە دنیـای ململانێ و پیشەسازی نوێ و لێكچوونی ئاینی زیاتر لە دەست بچێت، دەبێت هەلومـەرجی سیاسی دیكە بۆ توێژینەوەی سوودبەخشی زانستی بێتە ئاراوە كە هــەمان بنــەمای گشــتی ململانـێ بێـت. ڕەوتــی كامڵبوونی ئەم ئەندێشـەیە پەیوەندی بە نـاوی سـێ كەس لە گەورەكانەوە هەیە كە هەریەكەیان نوێنـەری یەكێك لە قۆناغە سێیینەكەیەتی: یەكەم ژان بۆدین، دووەم جۆن لۆك و، سێیەم جۆن ستیوارت میڵ.

(أ)گرفتی ژان بۆدین ئەوە بوو لە كۆمەڵگایـەكدا كـە ڕقەبەرایـەتی و جەنگـە ئاینییـەكان جودایـی لـە هـەموو جێیـەك دروست كردبوو و ئـەو مەترسـییەی هێنـابووە ئارا كە دەوڵـەت بە تـەواوی لـەناوبچێت و ئاشـوب و ئـاژاوە شـێوازێكی هەمیشـەیی بـەخۆوە بگرێت، چۆن دەكرا ڕەوایەتی بە دەوڵەتێكی نائاینی بدرێت. كە پەیوەندی ئاین و دەوڵەت بوو بە تەوەری فەلسـەفەی سیاسـی، دروست لەبەر هـەمان هـۆ بـوو. ئەو لە كتێبێكیدا دەیەوێت لـە ڕێگـەی شیكردنەوە و بەراوردكردنـەوە ئـەوە دیـاری بكـات كـە لــە ئاینـە جیاوازەكاندا تا چ ڕادەیەك ڕاستی هەیە. ئـەنجامی توێژینەوەكە (كە ژان بۆدین ماوەیەكی درێـژ پێـش لێسـینگ لـە كتێبـی ناتـانی حەكیم پێـی گەیشـتبوو)

ئەوە بوو كە هیچ كام لە ئاینەكان نە بە تەواوی ڕاستە و نە سەرتاسەر درۆیە و ڕاستیی هاوبەشی نێوان هەموو ئەوانە ئەمەیە كە: خواوەند بوونی هەیە و خواوەندی گیانلەبەرانە؛ پاش مەرگ نۆرەی ژیانی دوایییە و؛ مرۆڤ لەم جیهانەدا ناچارە ڕەچاوی هەندێك بنەمای ئەخلاقی بكات. لە ئاینی مەسیحدا، بنەمای ڕزگاربون و ڕێوڕەسمی پەیوەست بە تیۆری سێگۆشەوە (تثلیث)، بە هۆی نەبوونی پەیوەندی بە بابەتەكەوە، ڕەت كراوەتەوە.

ژان بۆدین لەم سەرەتایەوە دەگاتە ئەو ئەنجامەی كە دەوڵەت نابێت بچێتە ژێر ئالای هیچ ئاینێكەوە و لەگەڵ هەموو ئاینەكاندا بە نەرمی و لێكبوردن ڕەفتار بكات. بناغەی لێكبوردنی ئاینی لە بەرژەوەندی دەوڵەتەوە پێویست دەبێت. بوونی دەوڵەت كە تاكە پارێزەری ئازادی و ئاسایشە، وا پێویست دەكات كە ئاینەكان ئازاد بن. كەواتە ئازادی ئاینی بەو مانایە نییە كە تاك لە هەڵبژاردنی ئایندا ئازاد بێت، بەڵكو یەكێكە لەو بنەمایانەی كە دەوڵەت ناچارە لەبەر بەرژەوەندییەكانی خۆی دەبێت ڕەچاوی بكات.

(ب)هەنگاوی دووەم جۆن لۆك هەڵیهێنایەوە كە لە تیۆری یاسای سروشتی- لە مافی هەمووانەوە دەستی پێكرد و لەسەر ئەو بناغەیە بۆ هەمووان، لەوانە بتپەرستانیش بەڵام جگە لە كافر و خوانەناسەكان، ئازادی ئاینی بە ڕەوا دانا.

بەڵام چ ژان بۆدن و چ لۆكیش، مەبەستیان لە نەرمی و لێكبوردن بەخشینی ئازادی ئاینی بە نامەسیحییەكان بوو، بە دەربڕینێكی تر ئەو مەسەلەیەیان بە دەرچوون لە بنەما دادەنا بۆیە بە فەرمانی ئەقڵی دروست دەبوو بە لێكبوردن چارە بكرایە.

(ج)جۆن ستیوارت میڵ ئەم بۆچوونەی ڕەها كرد. لە سەرەتای بەشی دووەمی كتێبەكەی "دەربارەی ئازادی"، ئەو بابەتەی بەم شێوازە پتەو و لەیادنەكراوە خستۆتە ڕوو:

ئەگەر هەموو مرۆڤ جگە لە یەك كەس هەموو یەك باوەڕیان هەبێت و، تەنیا ئەو كەسە باوەڕی جیاوازی هەبێت، وەك چۆن ئەو كەسە گەر دەسەڵاتی هەبوو مافی ئەوەی نییە، ئەوانی دی خامۆش بكات، هەرواش ئەوانی دی مافیان نییە دەنگی ئەو خامۆش بكەن. ئەگەر باوەڕ موڵكێكی تایبەتی بووایە كە تەنیا بۆ خاوەنەكەی نرخ و بەهای هەبێت و، ئەگەر گرژی خوڵقاندن لە كاتی سوودوەرگرتن لێی تەنیا زیانی تایبەتی لێ بكەوتایەوە، ئەوكاتە جیاواز دەبوو كە ئایا زیانەكە بە ژمارەیەكی كەم گەیشتووە یان بە ژمارەیەكی زۆر. بەڵام خراپەی تایبەت بە ڕێگرتن لە دەربڕینی بیروباوەڕ ئەوەیە كە شتێك لە ڕەگەزی مرۆڤایەتی دەدزێت -واتە هەم لە ئایندەكان، هەم لە وەچەی ئێستا و، زیاتر لە نەیارەكان وەك لە ڕەزامەندەكان. ئەگەر ئەو باوەڕە ڕاست بێت، لە هەلی گۆڕینی ناڕاست و درۆ بە ڕاست و هەق بێبەش دەبن و؛ ئەگەر هەڵە بێت، لە تێگەیشتنی ڕۆشنتر و كاریگەریی زیندووتری ڕاستی كە ئەویش بە نزیكەیی بە هەمان ئەندازە سوودبەخشە و لەبەریەك كەوتنی ڕاست و ناڕاست دروست دەبێت، لە دەستیان دەچێت.. ئێمە هەرگیز ناتوانین لە ناڕاستی باوەڕێك كە بۆ سەركوتكردنی تێدەكۆشین دڵنیا ببین؛ تەنانەت ئەگەر دڵنیاش بین، دووبارە تابوتكردنی خراپ دەبوو.

ئەوەی میڵ لێرەدا بەم شێوە كاریگەرە دەریدەبڕێت، لە بنەڕەتدا جگە لەم بۆچوونە شتێكی دیكە نییە كە دەڵێت ڕاستی تەنیا لە ئەنجامی ململانێی نێوان خاوەن باوەڕە جیاوازەكان

دەردەکەوێت و شتێك نییە ناوی باوەڕی سەرکەوتوو و باوەڕە لێکدابڕاوەکان بێت و، بەم پێودانگە، مەسەلەکە هەرگیز مەسەلەی چاوپۆشین و نەرمی نواندن لەگەڵ بۆچوونی ئەوانی دیکەدا نییە و تەنیا ڕێگەی دۆزینەوەی ڕاستی، پێکدادانی بیروباوەڕ و بۆچونەکانە.

ئەم ئەندێشەیە، لە پلەی یەکەمدا، ئەنجامی ئەزموونە تایبەتییەکانی خودی مێڵ بوو. ئەو لە منالییەوە بلیمەتێك بوو کە لە قوتابخانەی یوتیلیتاریانیزم پەروەردە بووبوو. پاش مەرگی باوکی "جیمز میل" ، لە ڕێی شیعرەکانی وۆردزۆرت و تیۆرە میتافیزیکییەکانی کۆلریدج، ئاشنای فەلسەفەی ئایدیالیزمی ئەڵمانیا بوو. بێپەردەیی شێوازی قسەکردنی و گومانکردنی لە بیروبۆچوونەکانی خۆی، گاساندی، دێنێتەوە یاد کە ڕەخنەی لە دیکارت دەگرت.، تیۆرەکەی میل لە بارەی ئەوەی کە ڕاستی بە مانای ململانێی بیروباوەڕەکانە، پێشتر لە بەرهەمەکانی میلتۆن خرابووە ڕوو، بەلاّم میلتۆن کاتۆلیکەکانی لەو بازنەیە خستبووە دەر.

لە کتێبەکەی میلدا مەسەلەیەکی تریش هەیە - مەسەلەیەك کە ئەمڕۆ لەو کاتەی خودی ئەو گرنگی زیاتری پەیدا کردووە.

لە دیدی میلەوە، مەترسییەك کە هەڕەشە لە ئازادی دەکات، زیاتر لە لایەن کۆمەڵگاوەیە تا لە لایەن دەوڵەتەوە بێت. ئەو لە باوکیشی زیاتر چووە پێش و تێبینی کرد کە سیستەمی هەڵبژاردنی دیموکراتی پەرلەمانی تا ئەو کاتەی کە کۆمەڵگا لەسەر بنەمایەکی هاوشێوە دانەڕێژرابێت، توانای کارکردنی نییە.

میل ترسی لەوە هەبوو کە کۆمەڵگایەکی بێ سەبر و نالێکبوردە دەشێت لایەنی ئازادی لە سیستەمێکی سیاسی هەڵبژێراودا لەناو بەرێت.

دەزانم کە تێگەیشتنی میل بۆ ڕاستی، جێی لێکۆڵینەوە و گفتوگۆیە. بەلاّم ئەوەی کە لێرەدا گرنگی پێدەدەن، ڕاستی تیۆری مێل لە ڕووی فەلسەفییەوە نییە. ئەوەی کە گرنگی هەیە ئەوەیە کە لە کۆمەڵگایەکی لێکنەچوودا کە تیایدا ئاینەکان و چینەکان و پارتەکان و گرووپەکان ڕووبەڕووی یەکتر وەستاونەتەوە، هیچ بنەمایەك نییە جگە لە بنەمای ململانێ بۆ گونجاندنیان بە یەکەوە، لەم حاڵەتەشدا، هەموو ڕاستییەك ڕێژەییە و تەنیا بە بەریەککەوتنی ئەو بیروباوەڕانەی کە بەهاو گرنگی یەکسانیان هەیە، بونیادێك دروست دەبێت کە توانا بە مرۆڤەکان دەبەخشێت پێکەوە بژین.

لەسەر بناغەی لێکۆڵینەوەی پێشووم، دەشێت ئەو تەسەورە بێتە ئاراوە کە نەك تەنیا دیموکراسی لیبراڵ، بەڵکو پاشایەتی سنووردراریش (وە هەندێك جار باشتر) ئازادی توێژینەوە زامن دەکەن و تەنانەت پاشایەتی ڕەهاش توانای ئەم کارەی هەیە.

پێشتر ئاماژەم بۆ ئەوە کرد کە ئەم مەسەلەیە ڕۆژگارێك لە ڕابوردوودا ڕاست بووە، بەلاّم ئێستا دەبێت بێ هیچ مەرجێك جەخت بکەم کە چیدی ئەم حوکمە مومکین نییە ڕاست بێت. بەڵگەکانی ئەم ئیدیعایەم لە جێیەکی تردا باس کردووە و ئێستا بواری ئەوە نییە. لێرەدا تەنیا ئەم بەڵگەیە باس دەکەم: بە بۆچوونی من، ئەمڕۆ چیدی -بە پێچەوانەی ڕابووردووەوە- ڕەوتە دژە دیموکراسییەکان بە شێوەی پاشایەتی ڕەها خۆیان نیشان نادەن، بەڵکو هەمیشە بە ناچاری بە شێوەی دیکتاتۆرییە توتالیتارەکان دەردەکەون. بە دەربڕینێکی تر، ئەگەر ئەمڕۆ کەسێك دژی دیموکراسی بێت، وشیارانە یاخود ناوشیارانە و

تەنانەت كاتێك كە بۆ خۆی مەبەستێكی وای نییە، هەنگاو بەرەو بەهێزكردنی فاشیزم دەنێت.

ئەم بەڵگەیەش دیموكراسی لیبراڵ، دەزگایەكی سیاسی ئایدیالییە بۆ لێكۆڵینەوەی ئازادانەی زانستی.

-3-

بە باوەڕی من، دیموكراسی لیبراڵ (یان پشتبەستوو بە دەستوور) شایستەترین شێوازی حكومەتە لە ئێستادا بۆ فەراهەم كردنی پێویستییەكانی توێژینەوەی زانستی و ئازادی سیاسی.

بەڵام ئەم بەشەی دیموكراسی و هەروەها دۆخی توێژینەوەی زانستی ناوی، لە بەرامبەر چەند مەترسییەكدایە كە هەر كەسێك كە لە یەكێك لە بوارە هەستیارەكانی زانستدا خەریكی كاركردنە ئاشنایە پێی.

شیكردنەوەی هەموو ئەو ئاراستانەی كە هەڕەشە لە دیموكراسی دەكەن لە توانای ئەم لێكۆڵینەوەیە بەدەرە. هەروەها ئەگەری دووبارە كردنەوەی ئەوەی چەندین جار وتراوە هەیە. قسەكانی من لێرەدا، لە لایەك و زیاد لە ڕادە لە وتە كورتەكان دەچێت، لە لایەكی ترەوە، بەشەكانی بە روونی لە یەكتر جیانین. بەڵام لایەنی كەم دەبێت مەیلە دیاریكەرەكان بە گشتی دەربخرێن تا ئەو ئەنجامانەی كە دەمەوێت بیگەمێ بنچینەیەكی لۆجیكی هەبێت.

(1)دەزانین كە لە سەردەمی شۆڕشی گەورەی فەرەنساوە، تیۆرە دژە لیبراڵییەكان و دژە دیموكراتییەكان لەسەر ئەم ئیدیعایە بڵاوكراوەتەوە كە هاتنە كایەی حكومەتی هەرچی و پەرچییەكان لەناو هەناوی دیموكراسییەوە، شتێكی حەتمییە.

هەرچی و پەرچیی تینووی خوێن، بۆ ئەوەی دەسەڵات بگرنە دەست، ستەمكار و دیكتاتۆرەكان دەكەنە سەركردەی خۆیان. كەواتە دەركەوتنی ئەو حكومەتانەی كە دەیانەوێت هەموو ژیانی تاك و كۆمەڵایەتی بخەنە ژێر ڕكێفی خۆیانەوە، لە ڕاستیدا قۆناغێكی ناچاری بە بەرهاتنی دیموكراسییە. دومیستەر و بۆناڵ و دۆنۆسو كۆرتیس و شپینگلەر و ئۆرتیگائی گاسێت، هەریەكەیان بە جۆرێك ئەم ئەندێشەیەیان دووبارە كردۆتەوە. زۆربەیان پشت بە مرۆڤناسییەك دەبەستن كە پێیان وایە بۆچوونەكانیان لە تیۆرەكانی سەینت ئۆگستن سەرچاوەی گرتووە و ئیدیعا دەكەن كە مرۆڤ لەبەرئەوەی بە سروشت گەندەڵە (فاسدە) ئەوا، هەركاتێك كە بڕیار بێت پشت بە خۆی ببەستێت (هەروەك لە دیموكراسیدا دێتە پێشەوە). بە ناچاری ڕژێمێكی سیاسی تەواو گەندەڵ لەژێر دەسەڵاتی حكومەتی هەرچیوپەریدا دروست دەكات.

لێرەدا نامەوێت بچمە ناو لێكۆڵینەوە لە بارەی ئەم مرۆڤناسییە خەیاڵییە ئەگوستینییەوە. لە جێیەكی تر -لە وتاری "پەشێوی و سیاسەت" ئەوەم نیشان داوە كە كۆمەڵانی خەڵك لە چ هەلومەرجێكدا دەگۆڕێن بۆ هەرچی و پەرچی.

دەشێت حكومەتی هەرچی و پەرچی درووست ببێت، بەڵام بە شێوەیەكی ئاسایی هەمان ئەو كەسانەی كە لایەنگری ئەم مرۆڤناسییە ئۆگستینییە دەكەن، لە لایەكی ترەوە هەوڵ دەدەن تیۆرەكانیان لە ڕێی پڕوپاگەندە و سیاسەتەوە بخەنە پراكتیكەوە، ئەمەش لە حاڵەتێكدایە كە پێدەچێ ئەركی ڕۆشنبیرێك بە پێچەوانەوە دەبێت نەیاریی بێت لەگەڵ حكومەتی هەرچی و پەرچیدا.

ئەم مەیلە -كە هەڵبەتە مەیلێكە و هیچی تر- بێگومان لە دیموكراسیدا هەیە و بەو مانایەیە كە

هەر سیستەمێکی دیموکراتی رەها مەیلی بۆ هاورەنگی هەیە- بە دەربڕینێکی تر، حکومەتی کۆمەڵانی خەڵك بۆ ئەوەی کلتوورێکی هاورەنگ و یەکپارچەیی دروست بکات، هەموو ژیانی فیکری و هونەری نەتەوە دەخاتە ژێر فشارەوە.

ئەم جۆرە مەیلانە خودی خۆیان مەترسیدار نین. رەگەزی دژە رووناکبیری لە هەموو راپەرینێکی جەماوەریدا هەیە. رۆشنبیر هەمیشە لەبەردەم ئەم بەدگومانییەدایە کە لە شەرەکە پاشگەز دەبێتەوە. سوکرات داوای لە رۆشنبیر دەکرد کە دووری خۆی بپارێزێت و وەك کەسێکی نامۆ کە ئێستا لێرە نیشتەجێیە رەفتار بکات و لە پێناو حەقیقەتدا هەرگیز لەگەڵ هیچ سیستەمێکی سیاسیدا تەواو یەك نەبێت. راست بێت یان هەڵە، کۆمەڵانی خەڵك هەمیشە بە هەمان چاوەوە سەیری رۆشنبیر دەکەن.

توکڤیل لە شیکردنەوەی دیموکراسی ئەمریکادا، ئاماژەی بۆ ئەم مەیلانە کردووە. هاوکاری من ریچارد هۆفستادەریش لەو مێژووەدا کە بۆ راپەرینی جەماوەری لە ئەمریکادا نووسیویەتی، نموونەیەکی لەم جۆرە بزووتنەوە پاشکەوتووخوازە کۆمەڵگیرەی شی کردۆتەوە.

ئەم جۆرە مەیلانە کاتێك مەترسیدار دەبن کە بە رابەرایەتی پیاوێکی خەڵك خەڵەتێن و خاوەن توانای ئابووری فراوان، لەسەر شانۆی سیاسەت دەربکەون..

بێگومان دیموکراسی خاوەن ئاراستەی حکومەتی هەرچی و پەرچیییە و ئەم مەیلانە لە هەندێ قۆناغی مێژوویيدا دەشێت مەترسیدار بن. بەڵام ئەگەر کەسانێك کە دەبێت گرنگی بە پاراستنی رێکخراوە سیاسییە لیبراڵەکان لە هەر شتێکی دیکە زیاتر بدەن -واتە لێکۆڵەرەوان و مامۆستایان و رۆشنبیران و هونەرمەندان- بە بڕیارێکی بنجبڕانەوە لەو رێکخراوانە بەرگری بکەن، پێویست ناکات دیموکراسی بگۆڕێت بۆ دیکتاتۆری قەیسەرئاسا و پاشان بۆ دەوڵەتێکی دەسەڵاتدار بەسەر هەموو کاروبارەکانی ژیاندا.

(2)دووهەمین مەیل کە دەشێت بۆ دیموکراسی ئاسایی لیبراڵ -وە بەم پێیە، بۆ لێکۆڵەرەوە و زانا- مەترسی دروست بکات، گۆڕانی پێکهاتەی کۆمەڵگایە، واتە گۆڕانی کۆمەڵگایەکی کراوە و قبوڵکەری جۆراوجۆری فرەیی بۆ کۆمەڵگەیەکی داخراو و گروپبەندی کراو. گەرچی بە هیچ شێوەیەك ئیدیعا ناکەم کە لە هەموو روویەکەوە لەم مەیلانە تێدەگەم و دەتوانم شییان بکەمەوە، بەڵام ئەوەی کە وترا بە شێوەیەکی دیاریکراو و بەرجەستە بەو مانایە دێت کە لەم جۆرە بارودۆخانەدا، تاکەکان نەك بە پێی ئەوەی کە هەن، بەڵکو بە پێی ئەوەی سەربەکوێن دەنرخێنرێن.

دۆخەکە جۆرێکی لێ دێت کە پلەوپایە دەبێتە هۆکاری دەستنیشانکەر، نەك لێزانین و هەوڵ و تێکۆشان. کۆمەڵگا وای لێدێت لە چەند گروپێك پێك بێت کە هەموو ئارەزووی قۆرخ کردن دەکەن، وە بۆ ئەوەی هەرچی زیاتر لە دەست ئەوانی دیکە دووربن، وایان پێ باشە کە جێگەی قۆرخکارانەی خۆیان لە سایەی یاسا گشتییەکاندا بپارێزن.

ئێستا ناتوانم بچمە ناو ئەو باسەوە کە بۆچی ئاوایە یان بۆچی بە تایبەتی لە ئەوروپا، ئاوای لێهاتووە. بەڵام لایەنی کەم دەبێت بەشێك لە ئاکامەکانی ئەم دۆخە لە رووی لێکۆڵینەوەی زانستییەوە باس بکرێن.

گۆڕانی پێکهاتەی کۆمەڵگا، هاوکات لەگەڵ گۆڕانی شێوەی لێکۆڵینەوەی زانستی روودەدات. کاریگەریی ئەم مەسەلەیە لەسەر زانایانی زانستە سروشتی و کۆمەڵایەتییەکان لە ئەدیبان و زانایانی

زانستە مرۆییەكان زیاترە. كارەكان پسپۆڕانەتر دەبن، دابەشكردنی كار زیاد دەكات و خەرجیی لێكۆڵینەوە و توێژینەوە بە شێوەیەكی پەیوەست بەرزتر دەبێتەوە و ئەمانە هەموو گرفتی نوێ دەهێننە پێشەوە.

ئەمرۆ فەرهەنگ دۆستانی دەستبلاو بە شێوەی تاك چیتر بوونیان نەما. فەرهەنگدۆستی شێوازی كۆمەڵ كۆمەڵ و بێناوی لەخۆ گرتووە. فەرهەنگدۆست كە خودی خۆی زانست و هونەری دەپاراست، حەزو ئارەزوو و پێشداوەریی خۆی هەبوو، بەلام دەكرا بناسرێت. هەڵبەتە ئەمرۆ فەرهەنگدۆستیی بێناوی نوێ، واتە ڕێكخراوی دەوڵەتی، ئارەزووبازی ناكات بەلام توانایەكی گەورە و مەزنی لەژێر دەستدایە. لەو وتارەدا كە وەزیری ناوخۆی ئەڵمانیای ڕۆژئاوا، دكتۆر شرۆدەر، ماوەیەك لەمەوبەر لە مەراسیمی كردنەوەی بینا نوێكانی زانكۆی ئازادی بەرلین پێشكەشی كرد، ئەم مەسەلەیەی بێ پەردە هێنایە پێشەوە و بەڵێنی دا كە دەوڵەت هەرگیز بە خراپ سوود لە دەسەڵاتی خۆی وەرناگرێت.

بەلام تەنانەت ئەگەر دەوڵەت بەو شێوەیەی كە بەڕێز وەزیری ناوخۆ بەڵێنی دا كاربكات -واتە لە دەست وەردان لە مەبەستی لێكۆڵینەوە خۆی بە دوور بگرێت و ڕێز لەو بڕیارە بگرێت كە هەر توێژەرەوەیەك سەربەخۆ دەربارەی شێواز و ئامانجی كاری خۆی دەیدات- دووبارە مەترسی هەر دەمێنێتەوە. لێكۆڵینەوەی پسپۆڕانە، بە تایبەتی لە زانستە سروشتی و كۆمەلایەتییەكاندا، پێویستی بە دابەشكردنی كارە و جێبەجێكردنی ئەمەش تەنیا لە دەست ڕێكخراوە توێژینەوەییەكاندایە، واتە لەو دەزگایانەی كە وەك هەر دەزگایەكی تری كۆمەلایەتی مەیلی بۆ دروستكردنی بیرۆكراتییەت هەیە.

هەرچەندێك كاری توێژینەوە گەورەتر و دژوارتر بێت، ئەم مەیلە بەهێزتر دەبێت.

بەلام كاتێك بەم جۆرەی لێهات، لێكۆڵەرەوە بە ئاسانی دەگۆڕێت بۆ كارمەندێك كە دەبێت هەوڵ بدات لە زنجیرەی پلەكاندا جێی خۆی بكاتەوە و لەو چوارچێوەیەدا كاربكات، بە تایبەتی كەسانی گەنجتر بە شێوەیەك لە تەسكی و تەنگی پسپۆڕیی خۆیاندا سنووردار دەكرێن كە ڕوانینی گشتی و هەمەلایەنە دەربارەی ئەو مەسەلەیەی كە لێی دەكۆڵنەوە لەدەست دەدەن. مەبەستی من لێرەدا مشتومڕ نییە و بە تایبەتی نامەوێت دەربارەی پسپۆڕگەری لە كاری لێكۆڵینەوەدا (كە باوەڕم وایە هەم پێویستە و هەم بەرهەمهێنە) بچمە مشتومڕەوە، تەنیا هەوڵ دەدەم مەترسی پسپۆڕگەری لە دەزگایەكی لێكۆڵینەوەدا كە بە پێی بنەماكانی بیرۆكراتییەت ڕێكخراوە، بەرگوێ بدەم.

تەنیا چارەی ئەو جۆرە مەترسییانە، هەوڵ و كۆششی خۆمانە -واتە تێكۆشان دژی مەیلە بیرۆكراتییەكان لە چالاكییە لێكۆڵینەوەییەكاندا و دروستكردنی كۆمەڵگای بچووكی توێژینەوەیی كە تیایاندا هاوكاری و یارمەتی بناغەی كار بێت و لە ڕووی بەرپرسیارێتی لە لێكۆڵینەوەدا نابێت جیاوازی لە نێوان بەتەمەنترین لێكۆڵەرەوە و گەنجترین هاوكاریدا هەبێت، یارمەتیدەر دەبێت نەمێنێ و ڕێگە بۆ هاوكار بكاتەوە.

ئێمەی كەسانی بەتەمەنتر بە هەمان ئەندازە كە چاوەڕێ دەكەین پارێزەرانی فەرهەنگدۆستانی بێ ناو لێبوردو بن، هەروەها خۆشمان دەبێت لێبوردوو بین. تەنیا لە دۆخی ئاوادا دەتوانین ڕێگە لە ئاراستەی یەكجار بەهێزی بیرۆكراتییەت بگرین و نەهێڵین ئێمە بگۆڕێن بۆ كارمەندی دەزگا بێ ناسنامەكان و دواجار ئەو ڕەوتەی كە بە ڕووكەش

ڕووكاری گشتی كۆمەڵگەی گرتۆتەوە، ڕێ بگرین لەوەی كۆمەڵگەی لێكۆڵەرەوان و زانایانیش بگرێتەوە.

مان و نەمانی لێكۆڵینەوەی زانستی بەمەوە بەستراوە كە لێپرسراویی ئەنجامی لێكۆڵینەوەی هەر لێكۆڵەرەوەیەك، چ وەك تاك و چ بە شێوەی هاوكاری، پارێزراو بێت.

–4–

ئێمە چاوەڕوانی گەورەمان لە سیستەمی سیاسی هەیە. چاوەڕێی ئازادی زانكۆ و ئازادی لێكۆڵینەوە دەكەین. چاوەڕێی فەراهەم كردنی ئەو هۆكارانە دەكەین كە لێكۆڵینەوەمان بۆ شیاو دەكات. ئەم چاوەڕوانییانە لە خۆ بە زلزانین و گیانی خۆ جودا بینییەوە نەهاتووە؛ لەو باوەڕە چەسپیوەمانەوە هاتووە كە لێكۆڵینەوەی زانستی یەكێكە لە پایە پێویستەكانی ئازادی سیاسی و، ئەم پایە ناسراوەی ئازادی تەنیا لە خاكی ئازادی یاساییدا دەشێت شكۆفە بكا و بەبەر بێت.

بەلام ئایا سیستەمی سیاسی بەرامبەر بەمانە هیچ چاوەڕوانییەكی لە ئێمە نییە؟

بە بۆچوونی من، دەوڵەت دەتوانێت و دەبێت دوو چاوەڕوانی لە ئێمە هەبێت.

چاوەڕوانی یەكەم پەیوەستە بە سنووری نێوان لێكۆڵینەوە و وانەوتنەوە لە لایەك و، پڕوپاگەندە لە لایەكی تر. هەڵبەتە ئێمە هەموو باوەڕمان وایە كە تەلاری كۆنفرانس و تاقیگە شوێنی پڕوپاگەندە نییە. بەلام ئایا هەمیشە دەكرێت جیاوازی لە نێوان پڕوپاگەندە و ناپڕوپاگەندە "غیر تبلیغ"دا بكرێت؟ لەوانەیە پێناسەیەك هەبێت، من تا ئێستا پێناسەیەكم نەدیوە كە ڕازیم بكات. لەگەڵ ئەم وەسفەدا، هەم من دەزانم و هەم هەموو ئێوەش كە جیاوازی وا هەیە و جیاوازییەكە ناكرێت بڵێین بێمانایە.

بەلام ئەگەر پڕوپاگەندە –لایەنی كەم لە پراكتیكدا– بە ئاسانی دەستنیشان بكرێت، ئەركی لابردن و دەرهاویشتنی دەبێت بە چ كەسێك بسپێررێت؟ بە دەوڵەت؟ بە دەزگای بەڕێوەبەرایەتی؟

وەلامی من یەك وشەیە: نا –هەرچەندە بە لەبەرچاوگرتنی ئەوەی كە ماوەی سالانی *1918* تا *1933* لە ئەڵمانیادا ڕووی دا، دانی وەلامێكی وا بۆ من زۆر سەختە و، هەمان ئەو ئەزموون و ڕووداوانە بوونە هۆی ئەوەی كە لە دەستووری نوێی ئەڵمانیادا، بنەمایەك بۆ پێویستی ئازادی زانكۆیی بگونجێنرێت.

كەواتە وا شایستەیە كە بەرپرسیاریی ڕێگرتن لە پڕوپاگەندە لە تەلاری كۆنفرانس و بنكە توێژینەوەییەكان لە ئەستۆی خودی لێكۆڵەرەوەكان بێت كە دەبێت بە كۆ لە ڕێگەی ڕەخنەوە، بێئەوەی بهێڵن گیانی درۆزنی خۆ جودابینییان ڕێیان لێبگرێت، بەم ئەركە هەستن.

دووهەمین چاوەڕوانی كە دەوڵەتێكی لیبراڵ دیموكرات دەبێت لە ئێمەی هەبێت، كە بە هەمان ئەندازەش دژوارە، هەستی بەرپرسیاریی سیاسییە. تا ئێرە باسی دوو جەمسەر لە جەمسەرەكانی چەمكی سیاسی ئازادییم دەكرد: یەكیان لایەنی یاسایی و ئەوی تر لایەنی شناسییە. بەلام هەق، زۆر سنووردار و گۆشەگیر دەكا. ناسینی سروشتی دەرەكی و سروشتی مرۆیی و شارەزایی لە مێژوو، ڕێگەی كار بە ڕووماندا دەكاتەوە. بەلام تەنیا كاری سیاسی و چالاكی خۆمانە كە دەتوانێت ئازادییمان بۆ دەستەبەر بكات و ئەو ئازادییە لەلای خۆی بە

ساغی بهێڵێتەوە. لەبەرئەوە كاریگەریی و گرنگی سێیەمین جەمسەری ئازادیی سیاسی، واتە جەمسەری ئیرادە، لە دوو جەمسەرەكەی تر هیچ كەمتر نییە.

دەزانم كە بیٚ هەستی سیاسی فراوانە و، ئەو تووڕەیییەی كە بەرامبەر سیاسەت هەستی پێدەكەین و بێزاری لە یاری ڕۆژانەی سیاسەت بە یارمەتی هەندێك ڕەفتاری ئەپیكۆری بە بەرگی ئەقڵ و بەڵگاندن دەڕازێنینەوە. نامەكانی نێوان ئاتیكۆس، فەیلەسووفی ئەپیكۆری و، سیسرۆن، سیاسەتمەداری ڕواقیمان دێتەوە یاد و باوەڕمان وایە ئەگەر بە پێی پەندی ئاتیكۆس ڕەفتار بكەین و لە سیاسەت و دووربكەوینەوە و خۆمان بۆ بەدەستهێنانی كەماڵ تەرخان بكەین، بەهەرحاڵ سەلامەت دەبین و دەتوانین ببینە سەرچاوەی خزمەتی گەورەتر بۆ مرۆڤایەتی وەك لەوەی پەیوەندی بكەین بە حیزبێكەوە و هەندیٚ جار، وەك سیسرۆن، لایەنگری لایەنی دوڕاو بكەین.

ئەمڕۆ، بە باوەڕی من، ئەم ڕوانینە ئەپیكۆرییانە بۆ سیاسەت، لایەنی كەم لە ڕووی ئەخلاقییەوە، نیشانەی هەست نەكردنە بە بەرپرسیارێتی. كاتێك كە دەوڵەت ئاسایش فەراهەم دەكات و لە هەمان كاتدا ئازادیمان دەستەبەر دەكات، ئایا دووبارە دەبێت لە سیاسەتەوە دوور بین؟

ڕوانینی ئەپیكۆرییانە، لە ڕووی پراكتیكەوە ئەمڕۆش شیاوی بەرگریكردن نییە.

كێیە كە دەتوانێت لە سیاسەت كەنارە بگرێت و لە شەپۆلەكانی دوور بێت؟

ئاتیكۆس دەیتوانی، چونكە دەسەڵاتدار و بەناوبانگ بوو. ئێمەش دەمانتوانی، ئەگەر ئەوەندە بچووك و بێبایەخ بووینایە كە سەرنجی سیاسەتمەدارانمان ڕانەكێشایە. یان ئەوەندە گرنگ و شایستەی ڕێز كە بە ناو و ناوبانگێكی واوە، سیاسەتمەداران جورئەتیان نەكردایە دەست لە پێكهاتەمانەوە وەربدەن. بەڵام نە ئەوەندە بێبایەخین نە ئەو بلیمەتە مەزنەین و، لەبەرئەوە، هەمیشە گرفتار دەبین. وە ئەوكاتەش، ئەو ئەزموونەی كە لە دیكتاتۆرییە تۆتالیتارەكانەوە بەدەست هاتووە ئەوە نیشان دەدات كە ئەو زانا و بلیمەتانەش لەم چارەنووسە بەدوور نین. كۆمەڵگا بە جۆرێك یەكرەنگ بووە، هۆكارەكانی پەیوەندیكردن ئەوەندە ورد و پێشكەوتوون و، شێوازەكانی چاودێریكردن گەیشتوونەتە ئاستێكی ئەوەندە كامڵ كە چیتر كەنارەگرتن لە تواناد‌ا نییە.

كەواتە، چ لە ڕووی ئەخلاقییەوە و چ لە لایەنی پراكتیكییەوە، ئەركی سەرشانی ئێمەیە كە بەرامبەر بە مەسەلە سیاسییە گەورەكان –لەبەر لایەنگیریكردنی دیموكراسی بێت، یان لەبەر لایەنگیریی لە سیستمێكی تر، یا لەبەر هاوڕابوون لەگەڵ فلانە بۆچوون دەربارەی سیاسەتی دەرەكی، یا لەبەر ڕازیبوون یا ناڕەزایی بەرامبەر ئابووری ئازاد –هەڵوێست وەربگرین. بۆ ئێمەی لێكۆڵەرەوە و توێژەروان، نزیكبوونەوە لە حەقیقەت تەنیا لە ئەنجامی لێكۆڵینەوە و گفتوگۆی زانستییەوە شیاوە.

ڕەنگە بۆچوونی ماكس ڤیبەر دەربارەی بابەتیبوون لە زانستە كۆمەڵایەتییەكاندا بە هەڵە دابنێین، وەك من بزانم. بەڵام ئەو بنەمایەی كە ئەو لە نووسینێكدا بە ناوی "پیشەی زانست" لێوەی دواوە، بە باوەڕی من تەنیا بنەمای شیاوە لە مەیدانی پراكتیكدا. ڤیبەر دەڵێت: هەموو مەسەلە

سیاسییەكان دەبێت بە بێ پەردە و بەبێ ڕق و خۆشەویستی بخرێتە بواری لێكۆڵینەوەوە؛ هیچ لێكۆڵەرەوە و مامۆستایەك لەسەری نییە هیچ سیستەمێكی سیاسی قبولْ بكات؛ بەلام ئەوان یەك بەیەك ئەركی سەرشانیانە كە بە ئاگاداربوون لە پێشگریمانەكانی خۆیان، هەر كار و بۆچوونێكی سیاسی بە شێوەیەكی ئاشكرا و ماقولْ بخەنە ژێر لێكۆڵینەوەوە.

بە بۆچوونی من، ئەمانەن پەیوەندییەكانی نێوان ئازادی لێكۆڵینەوە و ئازادی سیاسی. گەرچی لێكۆڵینەوەی ئازادی زانستی تەنیا لایەنێكە لە لایەنەكانی ئازادی سیاسی مرۆڤ، بەلام بۆ ئەوەی كە مرۆڤ خۆی دیاری بكات، یەكێكە لە ئەركەكان لە كۆمەڵگا ئازادەكاندا.

## سەرچاوە

آزادی و قدرت و قانون– نوشتەء فرانتس نویمان– گرد آوری و ویرایش و پێشگفت راز– هربرت ماركوزە– ص *374–394*.

# کانت، مۆدێرنیتە و پۆست مۆدێرنیتە

د. حەمید عضدانلو
لە فارسییەوە: مەحمود عەزیز عەبدولقادر

ئەمڕۆ لە بیری ڕەخنەییدا کە هاوتایەکە بۆ باسە مشتومڕئامێزەکان لە بواری مۆدێرنە و پۆست مۆدێرنەدا، لە هەموو لایەکەوە شایەتی گەڕانەوەین بۆ (کانت)، چ (ریچارد ڕورتی) کە لە کتێبەکەی خۆیدا ئاوێنە (*Mirror*)، ئەندێشە سەرەتاییەکانی مۆدێرنە و شوێنپێکانیان لە (فۆکۆ)وە تا (کانت) شی دەکاتەوە چ (دریدا) یا (لیوتارد) کە پێکهاتەیەك لە (کانت) و (فیتگنشتاین) و (ئەرستۆ) بە دەستەوە دەدات. یا (ستانلی فیتش) کە لە باسەکانی خۆیدا هەر چەشنە تیۆرێك ڕەت دەکاتەوە یا (ڕیچارد هەوارد) لە کتێبەکەیدا لەژێر ناوی (لە مارکسەوە تا کانت) یا (لوك فری) لە کتێبە سێ بەرگییەکەیدا دەربارەی فەلسەفەی مافەکانی مرۆڤ.

بەڵام بۆچی کانت؟ بۆچی گەڕانەوە؟ بۆچی ئێستا؟ ئەمانە کە دەتوانن بە زیهنی هەر خوێنەرێکی وریادا بێن. گەڕانەوەیەکی وەها نەك لەبەر خاتری ئیستاتیکا (*Aesthatics*)ی کانت بێت، بەڵکو لەبەرئەوەیە کە گوایە بۆ یەکەم جار هەڵەیەك لە ڕەخنەگرتن لە مۆدێرنەدا ڕوویداوە. جا گەڕانەوە بۆ (کانت) بە ڕواڵەت گەڕانەوەیە بۆ سەرچاوەی ئەو هەڵەیە. بۆ پەیبردن بە سەرچاوەی ئەو هەڵەیە دەتوانرێت کەڵك لە (دومن) (*Deman*) و کتێبەکەی (ئایدیۆلۆژیای ئیستاتیك) وەربگیرێت. "دۆمن" لە ڕەوتی خوێندنەوەی شوێنگەی ئیستاتیکدا، سەربەخۆ نەبوونی کاری ئیستاتیکی بۆ دەردەکەوێت.

بونیادی مۆدێرنە لە بیری "کانت"دا کە لە ڕاستیدا دامەزرێنەرێتی، بەم شێوەیە دەردەکەوێت.

*Aesthetic Praxis Theory*

تیۆری پراکسیس ستاتیك

ئەم بونیادە هەڵگری بەشێکە لە شتێك کە ئەمڕۆ مۆدێرنەی پێ دەڵێن. لەم بونیادەدا پەیوەندییەکی دەروونی لە نێوان تیۆر و پراکسیس لە ئارادایە، بەڵام پراکسیس تەنیا لە هەناوی تیۆردا بوونی هەیە. لە بونیادێکی وەهادا ستاتیکا هیچ جۆرە پەیوەندییەکی لەگەڵ تیۆردا نییە.

لە ڕاستیدا دەتوانرێت بوترێت لە شوێنێكدا كە تیـۆری بـواری بەرپرسـیارێتی و عەقڵانییەتـە، ئیستاتیكای بواری نابەرپرسیاریی بواری ئارەزوو و داخوازییەكان و بواری ناعەقڵانییە.

بە گەڕانـەوە بۆ زمانی یۆنـانی و شیكردنەوەی زمانەوانییانـەی هـەردوو زاراوەی (تیـۆر) و (ستاتیكا)، (دومن) بۆی دەردەكەوێت كـە لـە بـیری یۆنـانیدا، تیـود و پراكسـیس و سـتاتیكا، پەیوەندییـەكی جیاوازیـان هـەبووە لەگـەڵ ئـەو پەیوەندییەی كە لـە سەردەمی مۆدێرندا هەیانـە بـە مانایـەكی دی بونیـادی بیركردنـەوەی یۆنـانی جیاوازییـەكی زۆری لەگـەڵ بونیـادی بیركردنـەوەی سەردەمی مۆدێرندا هەیە.

لـە لێكۆڵینەوەكـەی (دومـن)دا تیۆریـا *Theoria* (ناوێكی كـۆ) كـە لـە زاراوەی تیۆریـەنی (*Theorien*) یۆنانییـەوە وەرگیراوە و مانـای سـەیركردن (*Tolook*) و سـەرنجدانی (*Toglance*) هـەبووە و بـە گروپێـك لـە كەسەكان یان نوێنەرەكان وتراوە.

*Theoros* یـەكێك لـە كەسـەكان و ئێسـتاتیكیش (*Aesthetic*) بەرامبـەر بووە بـە داواكارییـەك (ادعـاء)، دەعواكردنێـك، جیاكردنەوەیـەك، هەسـتكردنێك، یـا تەماشـاكردنێك و پـەیپێبردنێكی تاكەكەسی. لەسـەر بناغـەی پێناسـەكانی سـەرەوە، تەنانـەت هـەتا قازەكانیش توانای ئێستاتیكییان هەیە.

یونانییـەكی بـەرپرس بـاوەڕی وابـوو كـە ئێمـە نـاتوانین بناغـەی كـاری خۆمـان لەسـەر بناغـەی سـەیركردن و دەركككردنی تاكەكەسێك دابمـەزرێنین، بەڵكو دەبێت چەند كەسێكی بەرپرس بۆ سـەیركردن و دەركككردنـی كێشـەكە ڕەوانـە بكرێـن (واتـە یـەك تیۆریـا لـە كۆمەڵـە كەسـێكی *5* تـا *13* كـەس پێـك دەهات، ئەم كەسانە لە نزیكـەوە واقیعەكە دەبینـن و شایەتی دەدەن و پاشان دەڵێن "ئێمـە كە چاوەكانی ئێـوە بوویـن، بینیمـان" لێرەدایـە كـە دەتوانرێـت بوترێـت واقیعەكـە ڕووی داوە، لێرەدایـە كـە گفتوگۆیـەك و تـاوتوێكردنێك، هەڵسـەنگاندنێك یـان لێكۆڵینەوەی (پراكسیس) دەست پێ دەكات.

بۆ یۆنانییەكی بەرپرس، كاری ئەم پراكسیسە لـە كـاری تیۆریـا تـەواو جیـاواز بـووە. كەواتـە ئـەتوانرێت بوترێـت كـە بونیـادی بـیری یۆنانییـەكان شـتێكی هاوشـێوەی ئـەم نموونـەی خوارەوە بووە.

*Theoria - - - - Aesthetic* *Praxis*

تیۆریا ئیستاتیكا پراكسیس

یۆنانییەكان نەك هەر تەنها بایەخێكی زۆریان بە بەستنەوەی پەیوەندی نێوان ئیستاتیك و تیۆریا دەدا و هەوڵیان بۆ زاڵبوون بەسەر بێنرخ سەیركردنی ئیسـتاتیك دەدا، بـەڵكو ئاگاشـیان لـە سـەربەخۆیی بواری پراكسیس هەبوو.

ئـەوەی كـە دەبێتـە مایـەی جیـاوازی بـیر لـە سـەردەمی مۆدێرنـدا ئەوەیـە كـە لـە سـەدەی هەژدەهـەمدا ئیسـتاتیكای وەلاوەنـراو، دووبـارە سەربەخۆیی خـۆی بەدەسـت دەهێنێتـەوە و تیـۆر و پراكسیسـیش بـە یەكـەوە گـرێ دەدرێنـەوە. بـە ڕووكەش وا دیارە كە (كانت) ئەم گۆڕانەی لە كتێبی (ڕەخنە سیانی)یەكاندا تۆمار كردووە.

هـەر هـەمان ئـەم گۆڕانكارییـە بووەتـە مایـەی هاتنـەئارای بـاس و مشـتومڕەكانی مۆدێرنیتـە لـە بەرامبـەر پۆسـت مۆدێرنیتـە و ئامـاژەكردن بـەم خاڵەش بایەخی هەیە كە (دومن) (كانت) بە بەرپرس و لێپرسراو نازانێت لەو گۆڕان و وەرچەرخانەی كە لـە بونیـادی بـیردا هاتووەتـە ئـاراوە. بـە بۆچوونـی (دومـن)، دەركـی نادروسـتی (شـیلەر) لـە نووسـراوەكانی (كـانت) لێپرسـراوی ئـەم گۆڕانـە هزرییەیە.

(دومن) باوەڕی وایە كە سەربەخۆیی ستاتیكا بە هۆی (شیلەر)ەوە بەسەر ئێمەدا سەپێنراوە، وە ئەگەرنا لە چوارچێوەی بیری (كانت)دا ستاتیكا هێزی هەڵوەشاندنەوە و گۆڕانی تیۆری هەیە.

بەهەرحاڵ هەرچۆنێك بێت ئێمە ئەم سەردەمەمان بە ناوی سەردەمی مۆدێرنەوە قبوڵ كردووە. ئێستا ئەم پرسیارە دێتە پێشەوە كە ئایا كۆنترۆڵمان بەسەر ئەم سەردەمەدا هەیە یا لە دەروونیدا زیندانین؟ مەرجی هەبوونی كۆنترۆڵ بەسەر سەردەمێكی وەهادا (وەكو كۆنترۆڵ و وەبەرهێنانی سروشت لە سەردەمی مۆدێرندا، ئەوەیە كە خۆمان لە دەرەوەی مۆدێرنیتە جێگیر بكەین.

هەوڵدان بۆ جێگیربوون لە دەرەوەی ئەم سەردەمە و كۆنترۆڵكردنی ئەوەیە كە پۆست مۆدێرنیتە لە بەرامبەر مۆدێرنیتە دادەنێت.

**پۆست مۆدێرنیتە لە بەرامبەر مۆدێرنیتە:**

مشتومڕی نێوان ئەم دووانە بە وتارە پڕ بایەخەكەی (هابرماس) لە ساڵی *1981* ز دەستی پێكرد. لەم وتارەدا (هابرماس) شمشێرە تیژەكەی خۆی بەرەو ڕووی لایەنگرانی پۆست مۆدێرنە، بە تایبەتیش (لیوتارد) وەكو پێشڕەوی ئەم بیر و هزرە گرت و ئەمانەی بە (پارێزگارانی نوێ) و تیۆرەكەشیانی بە تیۆری (پێش مۆدێرن) ناوبرد. هابرماس یەكێك لەو بیرمەندانە بوو كە دڵبەندییەكی بەهێزی بە پرۆژەی مۆدێرنیتە كە هەمان پرۆژەی ڕۆشنگەرییە (*Enlightment*) هەبووە و نایەوێت ئەم پرۆژەیە بخاتە لاوە.

لەم گفتوگۆ و مشتومڕەدا، عەقڵ (*reason*) هەم شوێنی گەردوونی بوونی پەیوەندییەكان و هەم دادوەری ئەم كێشمەكێشە فەلسەفییەشە. ئەڵبەتە ناتوانرێت دەیەی *1980* بە سەرەتای دەستپێكردنی هێرش و پەلاماری پۆست مۆدێرنە بۆ سەر مۆدێرنە دابنرێت.

دەستپێكەرانی ئەم پەلامارە (نیچە) و (هایدگەر) و (فرۆید) بوون؛ بە تایبەتی وتارە بەناوبانگەكەی (هایدگەر) واتە (سەردەمی وێنەگرتنی جیهان) كە لە ساڵی *1926* بڵاوبووەوە. ئەو وێنەی كە (هایدگەر) لەو وتارەدا لە تەكنۆلۆژیاوە بە دەستییەوە ئەدات دەتوانرێت بە بزووتنەوەیەكی ئاشكرا دابنرێت لە دژی بەگشتیكردنی هەر چەشنە كارێك كە بناغەكەی لەسەر عەقڵ بونیاد نرابێت.

بە بوێرییەوە دەتوانرێت بوترێت كە هەموو نووسراوەكانی فۆكۆ كە یەكجار ناوی (هایدگەر)ی تیا براوە، پەراوێز نووسینێكە لەسەر ئەم وتارەی هایدگەر.

بە مانایەكی تر لە واقیعدا (فۆكۆ) دەبێتە (هایدگەر)یەك. بە قسەی خودی فۆكۆ (هایدگەر بۆ من هەمیشە فەیلەسووفێكی سەرەكی بووە، فاكتەری پێشكەوتن و پەرەسەندنی فەلسەفەی من، خوێندنەوەی نووسراوەكانی هایدگەر بووە).

بۆ چوونە ناو مشتومڕێكی وەهاوە، فۆكۆ هەوڵ دەدات كە بیر لە بیرلێنەكراوەكان (*unthought*) بكاتەوە و بیانخاتە بەر باس و لێكۆڵینەوەوە. وە هەر قەڵەمڕەوی هەمان بیرلێنەكراوەكانیشە كە فۆكۆ پاڵ پێوەدەنێت بەرەو شیكردنەوە و ڕاڤەكردنی ئەبستمۆلۆژیا لە زەمانە جیاوازەكاندا.

بە بۆچوونی فۆكۆ ئەوەی كە بیری مۆدێرن لە بیری سكولاستیكی (زانستی كەلامی مەسیحی) سەدەكانی ناوەڕاست جیادەكاتەوە ئەوەیە كە لێكۆڵینەوە دەربارەی بوون، واتە خودا، شوێنی خۆی بە كەسێك دەدا كە بوون دەخوێنێتەوە.

لە هەمان ئەو ساتەوەی کە جیهان خۆی لە بەرامبەر کەسێکدا نمایش دەکات، ئەم پرسیارە دێتە پێشەوە کە ئایا دەکرێت بەهایەك بۆ دیلیی ئەو کەسە (ستاتیکا یان تیۆری) دابنرێت یان نە؟ فۆکۆ هەوڵ دەدات دووبەرامبەر بیربکاتەوە. بۆ نموونە هەم بیرکردنەوە لە کۆجیتۆکەی (دیکارت) و هەم لەوەش کە کۆجیتۆ بیری لێ نەکردووەتەوە.

بەڵگەی ئەم دووبەرامبەر بیرکردنەوەیە لە بیری (فۆکۆ)دا ئەوەیە کە ئەمانە هەردووکیان لە ئارادان و دینامیکییەتێك بە لێکۆڵینەوە و پشکنین دەبەخشن. وەبەرهەمی کێشمەکێشی نێوان ئەم دوو بوارە هەمان ئەو شتەیە کە دەبێتە جێگەی بایەخ و گرنگییپێدانی فۆکۆ کەوابێ ئەو مەسەلەیەی کە لێرەدا دێتە پێشەوە ئەوەیە کە بیرکردنەوە هەوڵ دەدات بە شتێکەوە خەریك بێت کە بیرلێنەکراوەیە.

ئەو پرسە فەلسەفییە گرنگەی کە لێرەدا بە مێشکدا گوزەر دەکات ئەوەیە کە بیرکردنەوە چۆن دەتوانێت شتێك بێت کە جیهانی خۆی لە بەرامبەر بیرلێنەکراوە ئاشکرا بکات؟ بۆچی بیرکردنەوە لە بەرامبەر خۆیدا بیرلێنەکراوەیە. بە مانایەکی تر خودی بیرلێکردنەوە لە قۆناغی یەکەمدا لە جۆری هەمان بیرلێنەکراوەکانە.

## بیرکردنەوە دەربارەی بیرکردنەوە نەریتێکی مۆدێرنی رۆژئاواییە :

یەکێك لە سیماکانی مۆدێرنە، بیرکردنەوەیە دەربارەی بیرکردنەوە. بە مانایەکی تر فەلسەفەی بیر یەکێکە لە دیاردەکانی مۆدێرنە. کۆجیتۆکەی (دیکارت)، (من بیردەکەمەوە کەواتە من هەم) بە تەواوی ئەم بابەتە روون دەکاتەوە.

لە بیری (جان لاك)دا درکە و خواستن (کنایە و استعارە) بۆ بیرکردنەوە دەبنە "پەڕەیەکی سپی" یان "سندوقێکی رەش" (*ablank state or the black box*). ئەم خواستنە بە مانای ئەوەیە کە ناتوانرێت لەسەر بنچینەی ئەزموون پەی بە بیر ببرێت. بە مانایەکی تر ئەو زانستەی کە لە ئەزموونەوە سەرچاوە دەگرێت، رێگەیەکی بۆ ناسینی هەلومەرجی خۆی واتە بیر، نییە.

ئەڵبەتە (کانت) بە میتۆدی (ترانسندنتاڵی) خۆی (*transcendental method*) چۆنێتی کارکردنی بیرمان نیشان ئەدات بەڵام ئەو تا ئەو سنوورە فێرمان دەکات کە لە چ شتێك ئەتوانرێت بیربکرێتەوە. ئێمە ناتوانین لەمە زیاتر بزانین. خودی بیر، بیرلێنەکراوەیە. لەبەرئەوەی کاتێك لە حاڵەتی بیرکردنەوەداین، ناتوانین کاردانەوەمان لەسەر خۆمان هەبێت. بە هۆی (کانتە)وە تەنیا دەتوانین توانا و بەرهەمی زانست هەڵسەنگێنین، بەڵام هەرگیز ناتوانین کار و چالاکییەکانی زانست بخەینە ژێر کۆنترۆڵی خۆمانەوە. کەوابێ ناتوانین وەڵامی ئەم پرسیارە بدەینەوە، کە چۆن ئەم کار و چالاکی بە رێنمایی کراوە کاریگەری هەبووە و چ کەسێکیش بووەتە فاکتەری بەخشینی ئەو کاریگەرییە.

فۆکۆ ئەم گرفتەی بە باشی ناسیوە و ئاگاداری بووە. بە جۆرێك کە لە دوا کتێبیدا (رێکخستنی شتەکان) دەڵێت: ئەوەی کە ئێمە بە مێژوویی ناوی دەبەین، تەنیا بەشێك لە پۆلێنکردنی بیرە. کەواتە (بە هۆی بە نەناسراو مانەوەی خودی بیر)ەوە بیر ناتوانێت هەڵیسەنگێنێت. لەم رووەوە هەرگیز ناتوانین دەرك بەوە بکەین کە رووداوەکان چۆن روودەدەن.

لەم حاڵەتەدا ئێمە لە بەرامبەر هێڵی ئاسۆیی مەیدانی زانستێکدا راوەستاوین کە سنوور و سەرچاوەکەی قابیلی بینین نییە و ناتوانرێت ببینرێت.

پەیدابوون و دەرکەوتنی درکەی هێڵی ئاسۆیی، ئەو مانایە ئەدات کە ئێمە هەرگیز ناتوانین شوێنپێیەك لە سنوور و چوارچێوەی مەیدانی بوون (وجود) بدۆزینەوە.

لەبەرئەوەی ڕێك هەر لەو ساتەدا کە ئێمە مەرامی ئەندازەگرتنی ئەم هێڵە ئاسۆییەمان هەیە، ئەم هێڵە دەگۆڕێت و گۆڕانی بەسەردا دێت. هەر لەبەر هەمان هۆ بەکارهێنانی چەمکی هێڵی ئاسۆیی نیشاندەری بونیادێکی نامومکینە. ئەمە هەمان بیرلێنەکراوە و بیرنەکردنەوە و هەمان ئەو شتەیە کە ناتوانین لە بارەیەوە هیچ قسەیەك بکەین. بە بۆچوونی فۆکۆ بیری مۆدێرن توانای چەسپاندن و بونیادنانی ئەخلاقی نییە. هەر ڕێکخستنێك کە جێگەی پەسەندکردن بێت هەمیشە بە کۆمەڵە مەرجێکی دیاریکراو سنووردار دەبێت.

ئەمە بەو مانایە نییە کە هیچ بەهایەك لە ئارادا نییە. بیرکردنەوە هەم ئازادکەر و هەم کۆیلەکەریشە. بیری مۆدێرن کار و کاردانەوەکان دەرك ناکات بەڵام خۆی کار و کاردانەوەکانە. بۆیە لەم ڕووەوە بیر هەمیشە بایەخدارە. ئاماژەکردن بۆ دوو خاڵ دەربارەی کتێبی "ڕێکخستنی شتەکان"ی فۆکۆ پێویستە.

یەکەم ئەوەیە کە بە بۆچوونی (هابرماس) فۆکۆ لە هەڵەدایە. هابرماس بۆ گواستنەوەی زانست لە ترانسندنتالەکان دەربارەی ئەوانە دەکۆڵێتەوە. بە بۆچوونی هابرماس بناغەی بوونناسی لە سەر تیۆرێکی کۆمەڵایەتی بونیادنراوە. هابرماس بناغەی کارەکانی خۆی لەسەر تیۆرێکی کۆگیری (اجماع) حەقیقەت بونیاد دەنێت و پێی وایە مەسەلە ئەخلاقی، کۆمەڵایەتی و سیاسییەکان لە تیۆری هەقیقەتەوە سەرچاوە دەگرن. بە مانایەکی تر هابرماس هەوڵ دەدات ڕەسەنایەتی تیۆرە بپارێزێت.

ڕەخنەی هابرماس لە فۆکۆ زیاتر پەیوەستە بە ڕاڤە و شیکردنەوەی چەمکی "دەسەڵاتە"وە.

خاڵی دووەم دەرککردنی گرنگی کارەکانی خودی فۆکۆیە. کە ئایا فۆکۆیش هەوڵی داوە بیر لە بیرلێنەکراوەکان بکاتەوە؟ لە زۆر ڕووەوە وا دێتە پێشچاو کە فۆکۆ دەستەویەخەی بیری مۆدێرن دەبێتەوە -"زانست دەسەڵاتە".

ئیدی فۆکۆ هیچ سەرنجێك لە ئامانجەکانی بیری مۆدێرن نادات و بەڵکو زیاتر بایەخ و گرنگی بە سیستمی نیشانەکان (*Signsystem*) دەسەڵاتی ئەم نیشانانە دەدات.

ئەو گرفتەی کە پۆست مۆدێرنە ڕووبەڕوویەتی ئەوەیە کە ئێمە ناتوانین بە کاری خواستن خۆمان لە خراپەی مۆدێرنە ڕزگار بکەین. چونکە لە لایەکەوە کاری خواستن خۆی پەیوەستە بە مۆدێرنە و لە لایەکی ترەوە ئارەزووکردن بۆ کاری نائیرادی شێتییە. ئەم مەسەلەیە گرفتی خودی مۆدێرنەشە، لەبەرئەوەی مۆدێرنە خۆی لەناو بەندی تۆڕگەلێکدا دەبینێتەوە کە خۆی چنیوێتی و بۆیە لەم لایەنەوە ئازادی کارکردنی زۆر سنووردار دەبێت.

ئایا قبوڵکردنی هەقیقەتێکی وەها ئازادی کارکردنی ئێمە زیاتر دەکات یا دەمانخاتە ژێر فشارێکی زیاترەوە؟ یا هەردووکیان؟ هەقیقەتێکی وەها زانستی توێژینەوەی نەژادەکان و مێژوو بە شێوەی تراژیدیا و کۆمیدیا دەردەخات، لەبەرئەوە ئێمە لە لایەکەوە بە هۆی تێگەیشتنەکانی خۆمانەوە دەرك بە کەسانی تر دەکەین و لە لایەکی ترەوە زانستی ئێمە کە لەسەر ئەم تێگەیشتنانە دامەزراوە، دەرهاویشتەیەکی کۆمەڵایەتی بووە و تاك بە تەنیایی بێتوانا و دەسەوەستانە. بە مانایەکی تر هەموو زانستە مرۆڤایەتییەکان حاڵەتی گەردوونی بوونی خۆیان لەدەست داوە و تەنیا لە

كايەی هەلومەرجی دياريكراودا دەتوانرێت تاوتوێ بكرێن.

بە گوێرەی ئەم تەفسيرانە، ميتۆدی (من بيردەكەمەوە كەواتە من هەم) ئيدی هێز و توانای جارانی نيەو ئيمە تێناگەين چ شتانێك دەزانين و چۆنيش.

مەبەستی بيری مۆدێرن لە بيركردنەوە دەربارەی بيرلێنەكراوەكان ئەوەبوو كە كۆتايی بە نامۆيی و بێگانەيی مرۆڤ بهێنێت. بەڵام گوايە لە ديدی پۆست مۆدێرنەدا هێشتا ئەم نامۆييە لە جێگەی خۆيدا ماوەتەوە. بۆ ڕزگاربوون لەم قەيرانە (هايدگەر) پەنا بۆ چەمكی (*Gelassenheit*) دەبات و داوامان لێ دەكات كە شتەكان بە حاڵی خۆيانەوە بەرەڵا بكەين. بە هێنانەوەی ئەم چەمكە، هايدگەر يەكەمين هەنگاو بەرەو پۆستمۆدێرنە دەهاوێت. وەڵامی هايدگەر بۆ ئەم پرسيارە كە ئايا دەبێت درێژە بە بيركردنەوە دەربارەی بيرلێنەكراوەكان بدەين يا نە، ئيجابی بووە. بەڵام هايدگەر باوەڕی وايە كە دەبێت ئەم كارە لە ڕێگەيەكی درووستەوە ئەنجام بدرێت.

بە بۆچوونی هايدگەر بيرلێنەكراوە خۆی جۆرە بيركردنەوەيەك نييە كە هێشتا لە بارەيەوە بيرنەكرابێتەوە بەڵكو بيرلێنەكراوە ڕێگەيەكی تايبەتييە بۆ بيركردنەوە و ئاگای، لە بەشداريبوونی خۆی لە هەناوی بيردا هەبووە و دەزانێت كە هەرگيز ناتوانرێت پەی بە هەموو ڕێگاكانی بيركردنەوە ببرێت.

نەك تەنيا ناتوانين بەم مەسەلە ڕازی بين كە تەنيا يەك ڕێگەی تايبەتی بۆ بيركردنەوە دەربارەی بيرلێنەكراوە لە ئارادايە، بەڵكو بەڵگەيەكيش لەئارادا نييە كە باوەڕمان هەبێت تەنيا يەك بيرلێنەكراوە لە ئارادايە. هيچ بيرلێنەكراوەيەك نييە كە تەنيا لە يەك ڕێگاوە بتوانرێت ڕاڤە بكرێن و شی بكرێنەوە.

هەنووكە ئەم پرسيارانە دێنە پێشەوە كە: چۆن دەتوانرێت بير لە بيرلێنەكراوەكان بكرێتەوە؟ چ كارێك دەتوانرێت دەربارەی ئەمە بكرێت؟ بيركردنەوە لەمەڕ بيرلێنەكراوەكان بووەتە ئەمری واقيع و ئەبێت لە ڕێگەی جۆراوجۆر و بە شێوەی بيركردنەوەی ڕۆشنگەری (كە هابرماس هێشتاش قايل بە بايەخێكی زۆرە بۆی) بۆی بجووڵێين.

پۆست مۆدێرنە ئەو باوەڕە ڕەت دەكاتەوە كە بير تەواو شەفاف و ڕوونە و پێی وايە كە ئەگەر بايەخێكی زياد لە پێويستی پێبدەين ئەوە مەسەلەكە ئاڵۆزتر دەكەين لەوەی كە هەيە. بە پێچەوانەی (ديكارت) و (نيوتن) كە باوەڕيان وابوو لێكۆڵينەوەی زانستی دەتوانێت بە قۆناغی كۆتايی خۆی بگات، لە بيروبۆچوونی (كانت)دا ئەمە شتێكی نامومكين بوو. (ڕەنگە هەر لەبەر هەمان بەڵگە بێت كە هەم هاوبيرانی پۆست مۆدێرنە و هەم نەيارانيشی بۆ كانت گەڕانەوە).

تەنانەت (هايدگەر) باڵاتر لە (نيوكانتينەكان) (*Neokantans*) و (هوسرلينەكان) (*Husserlians*) ڕۆيشتووە و باوەڕی وا بووە كە ئێمە هەرگيز ناتوانين وێنەيەكی ڕاست و ڕوون لە جيهانی دەوروبەری خۆمان بەدەست بهێنين. تەنانەت بۆ (ليوتار)يش ناتوانرێت زانست بە ميتۆدێكی گەردوونی دابنرێت، چونكە زانست زياتر بە موتاڵاكردنی شتە شلۆق و ناجێگيرەكانەوە خەريكە تا شتە جێگير و پايەدارەكان. بە بۆچوونی ليوتارد زانست زياتر بەرهەمهێنی شتە نەزانراوەكانە تا شتە زانراوەكان.

پۆست مۆدێرنە لە هەموو گوتارە ڕەها و گشتگەراكان بە گومانە. ئەوەی كە ئێمە لە

داهاتوویەکی نزیکدا لە نووسراوەکانی لایەنگیرانی پۆست مۆدێرنەدا بەدی دەکەین ئەوەیە کە تەنیا یەك شێوازی گوتار لە ئارادا دەبێت و دەتوانێت هەموو گوتارەکان لەناو خۆیدا جێبکاتەوە و ئەویش شێوازی پەخشان و قسەی پەخشان ئامێز (*Prose*)ە.

بەهەرحاڵ ئێستا ئێمە کەوتووینەتە نێوان مۆدێرنە و پۆست مۆدێرنەوە. بۆچی بۆ (کانت) دەگەڕێنەوە؟ لەبەرئەوەی ئەمە بەرئەنجامی مۆدێرنەیە و کانت پێشبینی کردبوو.

(لیوتارد) بەم بەرئەنجامە شادمانە و (هابرماس)یش لێی بێزارە. هەردوو بیریار بۆ کانت دەگەڕێنەوە، یەکێکیان بۆ ئافەرینکردنی و ئەوەی تریان بۆ ئەوەی بزانێت لەکوێدا هەڵەی کردووە.

## پەراوێزەکان و سەرچاوەکان

*1*–ئەم زاراوەیە لە ڕەگی (*aisthetikos*) وەرگیراوە و بە مانای هەستیاری یا ئەوەی پەیوەستە بە ئیدراکی هەستییەوە هاتووە و لە زاراوەی فەلسەفی تازەماندا بنەڕەتییەکەی پەیوەستە بە باسی چێژ و جوانی و بەهاناسی داهێنانی ئەدەبییەوە. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا هەمیشە ئاماژە بە مانای بنەڕەتی یۆنانی وشە دەکرێت، واتە ئیدراکی هەستی لە بەرامبەر ئیدراکی عەقڵی و گشتی و لۆژیکییەوەیە، کانت ئەم زاراوەیە بە مانا بنەڕەتییە یۆنانییەکەی بەکاردەبات و هیگڵیش لە بەرهەمەکانی خۆیدا دەربارەی هونەر، لە ژێر ناوی (*Aesthetik*) زاراوەکەی بە مانا تازە و هەنووکەییەکەی واتە (جوان)ی یان هونەرناسی تۆمار کردووە.

*2*–ئەم کتێبە تا ساڵی *1986* ز چاپ نەکرابوو، دەستنووسی ئەم کتێبە هەر لەو ساڵەدا بۆ هەڵسەنگاندن ڕەوانەی زانکۆی مینەسوتا کرا.

*3-Martin Heidegger, "The Age of the world picture" inthe Concerning Technology and other Essays. Harper & Row. 1977.*

*4-Michel Foucault, "Final Inter View? Raritan Summer 1985, P. 8 Le Retour de la morale, interview conducted by Gilles Barbadette, Les Nouvelles, June 28, 1984.*

*5-Michel Foucault, The order of Things, Random house, 1970.*

*6-See, Martin Heidegger. "The age of the world Picture" op. cit.*

# بوونی مادە
# (گومانی سیستماتیکی و کۆجیتۆی دیکارت)

بێرتراند ڕۆسڵ
لە ئینگلیزییەوە: عەتا قەرەداخی

لەم بەشەدا ئێمە دەبێ لە خۆمان بپرسین ئایا لە هیچ بارێکدا شتێك بە ناوی (مادە)وە هەیە. ئایا مێزێك هەیە کە سروشتێکی تایبەتی هەبێت و کاتێ کە من سەیری دەکەم لە حاڵەتی (بوونی)دا بەردەوام بێت، یان ئەو مێزە بە تەنیا بەرهەمی خەیاڵی منە و بەرهەمی خەونە لە حاڵەتی خەون بینینێکی زۆر فراواندا؟ ئەمە پرسیارێکی هێجگار گرنگە، ئەگەر ئێمە دڵنیا نەبین لە بوونی سەربەخۆیی شتەکان ئەوا ناتوانین لە بوونی سەربەخۆیی جەستەی خەڵکانی تریش دڵنیا بین، ئەمە سەرباری ئەوەی کە هێشتا شتێکی کەم لە بارەی مێشکی خەڵکانی ترەوە دەزانین ئەویش لەبەرئەوەی کە ئێمە بێئاگاین لە زەمینەی بڕواکردن لە مێشکی ئەواندا و تەنیا لەوە بە ئاگاین کە لە چاودێریکردنی جەستەیانەوە شتەکان دادەڕێژرێت، لەبەرئەوە ئەگەر ئێمە لە بوونی سەربەخۆیی شتەکان دڵنیا نەبین، ئەوا بە تەنیا لە بیاباندا بەجێ دەهێڵرێین. لەبەرئەوە دەشێ هەموو جیهانی دەرەوە هیچ نەبێت بێجگە لە خەونێك، ئەوەیشی کە بوونی هەیە تەنیا ئێمەین، ئەمەش ئەگەرێکی نەگونجاوە، بەڵام هێشتا ناتوانرێت بسەلمێنرێت کە هەڵەیە، هەروەك بچووکترین لێکدانەوەش لەبەردەستدا نییە بۆئەوەی کەوا دابنرێت ئەم شتە ڕاستە. لەم بەشەدا پێویستە ئێمە سەرنجی ئەوە بدەین کە بۆچی ئەم مەسەلەیە بەمجۆرەیە.

پێش ئەوەی کە ئێمە خۆمان بە مادە خەیاڵییەکانەوە خەریك بکەین، با هەوڵ بدەین هەندێ خاڵی زۆر یان کەم جێگیر و چەسپاو بدۆزینەوە هەتا لەوێوە دەست پێبکەین. سەرباری ئەوەی کە ئێمە گومان لە بوونی فیزیکی خۆمان دەکەین، بەڵام گومان لە بوونی ئەو زانیارییە حسییە ناکەین کە وای لە ئێمە کردووە بەو جۆرە بیر بکەینەوە کە ئەوە مێزە. ئێمە گومانی ئەوە ناکەین کاتێ کە سەرنجی ڕەنگێکی تایبەتی دەدەین و فشار دەخەینە سەر هەستکردنێکی دیاریکراو سەبارەت بە شتێکی ڕەق کە تاقی دەکەینەوە لای ئێمە بە شێوەیەك دەردەکەوێت. ئێمە گومان لە هەموو ئەم شتانە ناکەین کە شتێکی دەرونزانیانەیە. لە ڕاستیدا هەر شتێکی تر کە بشێ مایەی گومان بێت، بە لایەنی کەمەوە هەندێ لە ئەزموونە ڕاستەوخۆکانمان بە شێوەیەکی ڕەها وا دەردەکەون کە جێگای دڵنیایی بن.

دیکارت (*1596–1650*) بنیادنەری فەلسەفەی هاوچەرخ، ڕێبازێکی داهێنا کە تاکو ئێستاش دەشێ ئەو ڕێبازە بەکاربهێنرێت و سوودی هەبێت، ئەویش ڕێبازی گومانی سیستماتیکییە. دیکارت سووربوو لەسەر ئەوەی کە بڕوا بە هیچ شتێك نەکات ئەگەر ئەو شتە بە ڕوونی و بە ئاشکرایی نەیبینیبێت کە شتێکی ڕاستە. هەر شتێ کە دەیتوانی خۆی لە بەرامبەردا بخاتە گومانەوە، ئەوە خۆی گومانی لێ دەکرد هەتا ئەو کاتەی کە بەڵگەی دەبینی بۆ ئەوەی چیتر گومان نەکات. لە ئەنجامی بەکارهێنانی ئەم ڕێبازەدا دیکارت بەرەبەرە قەناعەتی بەوە هێنا کە تاکە بوونێك کە ئەو دەتوانێت لێی دڵنیا بێت بوونی خۆیەتی. دیکارت خەیاڵی شەیتانێکی فریودەری دەکرد کە شتی ناڕاستی نیشانی هەستەکانی ئەو دەدا لە وەهمێکی بەردەوامدا. دەشێ شتێکی هێجگار نەشیاو بێت کە ئەم جۆرە شەیتانە بوونی هەبووبێت، بەڵام هێشتا ئەوە هەر شیاو بووە، لەبەرئەوە گومان پەیوەستی ئەو شتانەیە کە لە لایەن هەستێکی شیاوەوە پەییان پێ دەبرێت.

بەڵام ئەو گومانەی کە پەیوەندی بە بوونی تایبەتی دیکارت خۆیەوە هەیە گومانێکی نەشیاوە، چونکە ئەگەر ئەو بوونی نەبوایە ئەوا شەیتان نەیدەتوانی فریوی بدات، ئەگەر دیکارت گومانی کرد، ئەوە بوونی دەبێت. ئەگەر دیکارت هەر جۆرە ئەزموونێکی هەبووبێت، ئەوا دەبێ خۆی بوونی هەبووبێت. بەمجۆرە بوونی تایبەتی ئەو دڵنیابوونێکی ڕەهایە بۆ خۆی. دیکارت لە کۆجیتۆکەیدا گوتی "من بیر دەکەمەوە کەواتە من هەم" لەسەر بنەمای ئەم دڵنیابوونەیە کە ئەو زەمینە خۆش دەکا بۆ کارکردن بۆ دیسانەوە بنیادنانەوەی جیهانی مەعریفە کە گومانکردنی دیکارت لە بارەیەوە کەوتۆتە بەردەم شکستەوە. بە داهێنانی ڕێبازی گومان و بە نیشاندانی ئەوەی کە شتە زاتیەکان هێجگار جێگای دڵنیایین، دیکارت خزمەتێکی گەورەی بە فەلسەفە پێشکەش کرد کە هەر کەسێ دەتوانێت وا بکات کە هێشتا (کارەکەی) ئەو بۆ هەموو خوێندکارانی ئەو بابەتە بەسوود بێت.

بەڵام هەندێ وریایی پێویستە لە بەکارهێنانی گفتوگۆکەی دیکارتدا.!! من بیردەکەمەوە کەواتە من هەم "شتێکی زیاتر دەڵێت لە چاو ئەوەی کە بە وردی جێگای دڵنیاییە، دەشێ ئەمە وا دەربکەوێت کە سەرباری دڵنیابوونی تەواوەتی ئێمە لە بوونی هەمان کەس لە ئەمڕۆشدا هەمان شێوەی دوێنێ گومان بکەین، بەڵام ئەمە گومانی تێدا نییە کە لە هەندێ ڕووەوە شتێکی ڕاستە، بەڵام زەحمەتە خودی ڕاستەقینە بگاتە مێزە ڕاستەقینەکە و واش دەرناکەوێت کە ئەو دڵنیایی بوونە ڕەها بێت و

جێگای ئەو ئاستەی قەناعەت پێبوون بێت کە دەگەڕێتەوە بۆ ئەزموونە تایبەتییەکان، کاتێ سەیری مێزەکەم دەکەم و ڕەنگێکی قاوەیی تایبەتی دەبینم ئەوەی کە تەواو لێی دڵنیام ئەوەیە ئەوە مێزەکەی من نییە، من ڕەنگێکی قاوەیی دەبینم، بەڵام ئەوەی هەیە ئەوەی کە زیاتر ڕەنگێکی قاوەیی دەبینرێت. ئەمەش بێگومان شتێ یان (کەسێ) لەخۆ دەگرێت کە ئەو شتە یان ئەو کەسە ڕەنگە قاوەییەکە دەبینێ، بەڵام ئەوە ڕەنگەکە خۆی نییە کە ئەوە لە خۆی بگرێت، زۆر یان کەم کەسێکی دیار بێت کە ئێمە بە "من" ناوی دەبەین. ئەمەش بە هەمان شێوەی دڵنیابوونێکی ڕاستەوخۆ تێدەپەڕێت، دەشێ لەبەرئەوەش بێ کە ئەو شتەی ڕەنگێکی قاوەیی دەبینێ شتێکی تەواو ساتەوەختی بێت و هەمان شێوەی ئەو شتە نەبێت کە هەندێ ئەزموونی جیاوازی هەیە لە داهاتوودا.

بەمجۆرە ئەمە بیروهەستە تایبەتییەکانی ئێمەیە کە دڵنیابوونی سەرەتاییان تێدایە. ئەم دڵنیابوونەش دەخرێتە سنووری خەون و وەهەم و هەروەها پەیبردنە ئاساییەکانەوە، کاتێ خەون دەبینین یان تارماییەك ڕەچاو دەکەین، بە دڵنیاییەوە هەمان ئەو هەستکردنانەمان دەبێت کە لە کاتی بیرکردنەوەدا دەمانبن، بەڵام لەبەر هۆکاری جۆراوجۆر وا دادەنرێت کە هیچ شتێکی فیزیکی لەگەڵ ئەم هەستکردنانەدا جووت نابێت یان ناگونجێت. لەبەرئەوە دڵنیایی بەرامبەر بە مەعریفەی ئێمە سەبارەت بە ئەزموونەکانی خۆمان نابێت بە هیچ شێوەیەك سنووردار بکرێت بۆ ڕێگادانی بۆ حاڵەتە بەدەرکراوەکان. لێرەدا بۆ ئەو شتەی کە شایەنی ئەوەیە لێی ڕابمێنین، ئێمە بنەمایەکی پتەومان هەیە کە لێیەوە بە دوای مەعریفەدا دەگەڕێین.

ئەو کێشەیەی کە پێویستە لێی ڕابمێنین ئەمەیە: ئێمە لە زانیاری حسی خۆمان دڵنیاین، ئایا بەڵگەمان هەیە بۆ حسابکردنی ئەو زانیارییە حسییە وەکو بەڵگەی بوونی شتێکی تر کە دەتوانین بە شتی فیزیکی ناوی ببەین؟ کاتێ کە ئێمە هەموو ئەو زانیارییە حسییەمان حساب کردبێت کە پێویستە بە شێوەیەکی سروشتی حسابی بکەین وەکو ئەوەی کە پەیوەست بێت بە مێزەکەوە، ئایا ئێمە هەموو ئەوەمان بۆ ئەوە گوتووە کە لە بارەی مێزەکەوە بێت، یان هێشتا هەندێ شتی تر لە ئارادایە، شتێ کە زانیاری حسی نییە، بەڵکو شتێك کە لە ژوورەکەش بچینە دەرەوە ئەو هەر بەردەوام دەمێنێتەوە؟ هەستی گشتی بێ دوودڵی وەڵامی ئەوە دەداتەوە. چی شتێ دەتوانرێت بکڕرێ و بفرۆشرێ و بجولێنرێت و پەردەی بەسەردا دابخرێت.. بەمجۆرە ناشێت تەنیا کۆکردنەوەی زانیاری حسی لە ئارادا بێت، ئەگەر پەردەکە بە تەواوەتی مێزەکە بشارێتەوە، ئەوە ئێمە زانیاری حسی لە مێزەکەوە دانارێژین یان وەرناگرین، لەبەرئەوە ئەگەر مێزەکە تەنیا زانیاری حسی بوایە، ئەوا بوونی مێزەکە کۆتایی دەهات و پەردەکەش لە هەوایەکی بەتاڵدا دەمایەوە و لەو شوێنەی کە پێشتر مێزەکەی تێدابوو بە موعجیزە ئارامی دەگرت. ئەمەش بە ئاشکرا وەکو شتێکی بێمانا دەردەکەوێت. بەڵام هەرکەسێ ئاواتی ئەوە بخوازێت کە ببێت بە فەیلەسووف پێویستە فێری ئەوە ببێت کە لە بێمانایی نەترسێت.

هۆیەکی گەورە لە بارەی ئەوەوە کە بۆچی وا هەست دەکرێت کە پێویستە ئێمە پشتگیری شتێکی فیزیکی بکەین سەرباری زانیاری حسی، ئەوەیە کە ئێمە هەمان شتمان بۆ خەڵکی جیاواز دەوێت، کاتێ (دە) کەس بە دەوری مێزێکی نان خواردندا دادەنیشن، شتێك دەردەکەوێت لە دەرەوەی

قبوڵکردنی عەقڵە کە ئەویش ئەوەیە ئەوان هەمان پەردەی سەرمێزەکە و هەمان چەقۆ و چەتاڵ و کەوچك و پەرداخ نابینن، بەڵام زانیاری حسی شتێکی تایبەتە بۆ هەر کەسێکی جیا یان سەربەخۆ. ئەوەی ڕاستەوخۆ لە بینینی کەسێکدا دەردەکەوێت، ئەوە ڕاستەوخۆ لە بینینی کەسێکی تردا وا دەرناکەوێت. ئەم کەسانە هەموویان لە ڕوانگەیەکی تا ئەندازەیەکی کەم جیاوازەوە شتەکان دەبینن، هەربۆیە شتەکان بە کەمێك جیاوازییەوە دەبینن. لەبەرئەوە ئەگەر کۆمەڵە شتێکی گشتی بێلایەن هەبن کە لە هەندێ ڕووەوە بشێ زانراو بن لەلای زۆر خەڵکی جیاواز، ئەوا دەبێ شتێ هەبێ بە سەرەوە و لەسەر زانیاری حسی تایبەت و تایبەتمەند کە بۆ خەڵکی جۆراوجۆر ئاشکرا بێت. پاشان ئایا کام هۆ لە ئارادایە بۆ بڕواکردن بەوەی کە ئایا ئەم جۆرە شتە گشتییە بێلایەنانە هەن یان نین؟

یەکەم وەڵام کە بە شێوەیەکی سروشتی بۆ هەر کەسێك دەردەکەوێت ئەوەیە کە لەگەڵ ئەوەشدا خەڵکی جیاواز دەشێ تا ئەندازەیەك لە ڕووی جیاوازەوە مێزەکە ببینن، بەڵام هێشتا هەموویان کەم یان زۆر شتە هاوشێوەکان دەبینن. کاتێ کە ئەو خەڵکانە سەیری مێزەکە دەکەن، ئەوە ئەو جیاوازییانەی کە دەیبینن بە دوای یاساکانی سەیرکردن و پێچەوانەکردنەوەی ڕووناکیدا دێن ئەویش بۆ ئەوەیە بە ئاسانی بگەن بە شتێکی دیار و بەردەوام کە لەسەر بنەمای ئەوە بڕیاری زانیاری حسی خەڵکی جیاواز بدرێت، من مێزەکەی خۆم لەو کەسە کڕی کە پێشتر نیشتەجێی ژوورەکەم بوو. من نەمتوانی ئەو زانیارییە حسییەی ئەو بکڕم، ئەو زانیارییەی کە دوای ئەو هیچی نەمایەوە، بەڵام من توانیم ئەو تەوەقوعە بکڕم کە جێگای بڕوا بوو زۆر یان کەمیش زانیارییەکی حسی هاوشێوە بوو.

کەواتە ئەمە ئەو ڕاستییەیە کە خەڵکی جۆراوجۆر زانیاری حسی هاوشێوەیان هەیە، هەروەك کەسێك لە شوێنێکی دیاریکراودا لە کاتی جیاوازدا زانیاری حسی هاوشێوەی هەیە کە وا لە ئێمە دەکات وای دابنێین بە سەرو لەسەر زانیاری حسی شتێکی گشتی بەردەوام هەیە کە گرنگی دەدات یان دەبێت بە هۆی بەرهەمهێنانی زانیاری حسی خەڵکی جۆراوجۆر لە کاتی جۆراوجۆردا.

ئێستا تا ئەو ئاستەی کە ئەم حسابات کردنانەی سەرەوە پشت دەبەستن بە دانانی ئەوەی کە لە تەنیشت خۆماندا کەسانی تر هەن، ئەو کەسانە لە ئەنجامدا لە بارەی هەمان مەسەلەوە دەپرسن. کەسانی تر بە زانیارییەکی حسی دیاریکراوی وەکو دیمەنیان یان دەنگیان نیشانی من دەدرێن، خۆ ئەگەر بەڵگەم نەبێت بۆ بڕواکردن بەوەی کە شتی فیزیکی هەن پەیوەستی زانیاری حسی من نین، من هیچ بەڵگەیەکم لەبەردەستدا نییە بۆ بڕواکردن بەوەی کە خەڵکی تر بێجگە لەوەی وەکو بەشێك لە خەونی من بێت بوونیان هەیە. لەبەرئەوەی کاتێ ئێمە هەوڵ دەدەین بۆ خستنەڕووی ئەوەی کە پێویستە شتگەلێك هەبن پەیوەست نەبن بە زانیاری حسی خۆمانەوە. ئێمە ناتوانین پشت ببەستین بە بڕیارو شایەتی کەسانی تر چونکە ئەم شایەتییە پێکدێت لە زانیاری حسی و ئەزموونی کەسانی تر ئاشکرا ناکات ئەگەر بێت و زانیاری حسی ئێمە نەبێتە ئاماژەی بوونی شتگەلێکی سەربەخۆ لە خۆمان، کەواتە ئەگەر بشێت پێویستە ئێمە لە تاقیکردنەوە تایبەتییەکانی خۆماندا ئەو خاسێتانە بدۆزینەوە کە نیشانی دەدەن یان ئارەزووی نیشاندانی ئەوەیان هەیە کە لە جیهاندا شتی تر هەن

لە دەرەوەی ئێمە و لە دەرەوەی تاقیکردنەوە تایبەتییەکانی ئێمەدان.

لە ڕوویەکەوە پێویستە دان بەوەدا بنرێت کە ئێمە هەرگیز ناتوانین بوونی شتەکانی دەرەوەی خۆمان و دەرەوەی تاقیکردنەوەکانی خۆمان بسەلمێنین. هیچ بێ واتاییەکی لۆجیکانە لەو گریمانەوە ئەنجام ناگرێت کە جیهان لە خۆم و بیر و هەستکردنەکانم پێکدێت و هەموو شتەکانی تر وەهمن. دەشێ لە خەونەکاندا جیهانێکی زۆر ئاڵۆز دەربکەوێت، جیهانێك کە ئێمە لە کاتی بەئاگایشماندا وەکو وەهمێك دەیبینین، لەبەرئەوە دەبێ بگوترێت ئێمە ئەوەمان بۆ ڕوون دەبێتەوە کە لە خەوندا زانیاری حسی وا دەرناکەوێت کە پێویست بێت لەگەڵ ئەمجۆرە شتە فیزیکییانەدا جووت بێت، لەبەرئەوە پێویستە ئێمە بە شێوەیەکی سروشتی ئەوە لەگەڵ زانیاری حسی خۆماندا هاوشان بکەین. ئەوە شتێکی ڕاستە کاتێ کە جیهانی فیزیکی هەڵدەسەنگێنرێت، دەشێ هۆیە فیزیکییەکان بۆ زانیاری حسی لە خەونەکاندا ببینین. بۆ نموونە لەوانەیە لێدانی دەرگایەك ببێتە هۆی خەون بینینمان بە پێکدادانی کەشتییەوە. لەگەڵ ئەوەشدا کە هێشتا لەم حاڵەتەدا هۆیەکی فیزیکی لە ئارادایە بۆ زانیاری حسی، بەڵام شتێکی فیزیکی لە ئارادا نییە کە لەگەڵ زانیاری حسیدا جووت یان هاوشان بێت بەو ڕێگایەی کە شەڕی ڕاستەقینەی کەشتی گەل تیایدا هاوشێوە دەبێت. لەو هەڵسەنگاندنەدا نەشیانی لۆجیکی بوونی نییە کە گوایە هەموو ژیان خەونێکە تیایدا ئێمە خۆمان هەموو ئەو شتانە دەخوڵقێنین کە لە پێش خۆمانەوە دێن. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ئەم حاڵەتە لە ڕووی لۆجیکییەوە نەشیاو نییە، هەروەك هیچ هۆیەکیش لە ئارادا نییە هەتا ڕاستێتی ئەوە بسەلمێنێت، لە ڕاستیدا ئەمە گریمانێکی زۆر ئاسان نییە کە وەکو هۆیەك بۆ حسابکردنی ڕاستییەکانی ژیانمان سەیر بکرێت لە چاو ئەو گریمانەی حسی گشتیدا کە ڕاستییەکەی ئەوەیە شتەکان بە ئێمەوە پەیوەست نین بەڵکو کاریگەرییان لەسەرمان دەبێتە هۆی هەستکردنمان.

ئەو شێوەیەی لە ڕێگای دانانەوە ئاسانکاری لێوە بەرهەم دێت ڕاستییەکەی ئەوەیە کە شتی فیزیکی بە ئاسانی دەبینرێت. ئەگەر پشیلەیەك لە چرکەساتێك و لە بەشێکی ژوورێکدا دەربکەوێت و لە چرکەساتێکی تریشدا لە بەشێکی تری ئەو ژوورەدا دەربکەوێت، ئەوە شتێکی سروشتییە کە وا دابنرێت ئەو پشیلەیە لە شوێنی یەکەمەوە جوڵاوە بۆ شوێنی دووەم و بە زنجیرە ناوەندێکیشدا تێپەڕیووە. بەڵام ئەگەر ئەو پشیلەیە تەنیا بنچینەیەك بێت بۆ زانیاری حسی، ئەوە ناشێت هەرگیز لە هیچ شوێنێکی تردا بوونی هەبێت کە من پێشتر لەو شوێنەدا نەمبینیبێت، لەبەرئەوە دەبێ وای دابنێین کە ئەو پشیلەیە بە هیچ شێوەیەك بوونی نەبووە کاتێ کە من سەیرم نەکردبێت، بەڵام لە پڕێکدا لە شوێنێکی نوێ هاتۆتە مەیدانی بوونەوە. ئەگەر ئەو پشیلە بوونی هەبێت لە کاتێکدا کە من بیبینم یان نەیبینم، ئەوا ئێمە لە تاقیکردنەوە و ئەزموونی خۆمانەوە تێدەگەین کە چۆن ئەو پشیلەیە لە نێوان ئەم ژەمە خواردنەو ژەمە خواردنی دواتردا برسی دەبێت. بەڵام ئەگەر ئەو پشیلەیە بوونی نەبێت کاتێ کە من سەیری ناکەم، ئەوا خودی پشیلەکە وەکو شتێکی سەیر دەردەکەوێت کە ئارەزووی لە خواردن لە کاتی نەبوونیدا هەمان شێوەی کاتی بوونی بە خێرایی گەشە دەکات، ئەگەر ئەو پشیلەیە تەنیا لە زانیاری حسی پێکبێت ئەوە ناشێت برسی بێت، ئەگەرچی برسێتی لە ئارادا

نییە، بەڵام برسێتی من دەشێ لای خۆم زانیاری حسی بێت. لەبەرئەوە ئاکاری زانیاری حسی کە پشیلەکە نیشانی من دەدات، تەواو سروشتییانە دەری دەخات کاتێ وەکو دەربڕینێکی برسێتی دادەنرێت، بە ئاشکراش دەبێتە شتێکی دوور لە لێکدانەوە کاتێ تەنیا وەکو جوڵە و گۆڕانکارییەکانی ئەو پەڵە ڕەنگانە دابنرێت کە وەکو برسێتی بێتوانان یان وەکو سێگۆشەیەك بۆ یاریکردنی دووگۆڵی بێ جووڵەن.

بەڵام ئەو گیروگرفتانەی کە لە حاڵەتی پشیلەکەدا هەن ئەگەر بەراورد بکرێن بەو گیروگرفتانەی لە حاڵەتی مرۆڤدا هەن ئەوە شتێکی ئەوتۆ نییە. کاتێ مرۆڤ دەدوێت- ئەوە دواندنە، کاتێ ئێمە ئەو ژاوەژاوە دیارانە دەبیستین کە دەیانبەستین بە بیروباوەڕەکانەوە.. لە هەمان کاتدا جوڵەی دیاریکراوی لێوەکان و دەربڕینەکانی دەمووچاو دەبینین- دیارە ئەوە شتێکی زەحمەتە کە وای دابنێین کە ئەوەی دەیبیستین دەربڕینی فیکرەیەك نییە، وەك دەیزانین دەبوو دەربڕینی فیکرەیەك بوایە ئەگەر هەمان دەنگمان دەربڕیایە. بێگومان شتی لەم جۆرانە لە خەونەکاندا ڕوودەدەن کاتێ ئێمە دەکەوینە هەڵەوە بەرامبەر بە بوونی ئەوانی تر. بەڵام خەونەکان کەم یان زۆر بەوە لێکدەدرێنەوە کە زیندەخەونن و توانای ئەوەیان هەیە کە کەم یان زۆر لەسەر بنەما زانیارییەکان حساب بکرێن ئەگەر ئێمە وامان دانا بنەمای ئەو خەونانە لە ڕاستیدا جیهانێکی فیزیکییە. بەمجۆرە هەر بنەمایەکی ئاسانکاری پاڵمان دەنێت بۆ پاڵپشتکردنی ئەو ڕوانینە سروشتییەی کە ڕاستی ئەو خەونانە کۆمەڵە شتێکن لە دەرەوەی خۆمان و زانیاری حسیمان کە بوونێکیان هەیە نەوەستاوەتە سەر پەی بردنی ئێمە پێیان.

بێگومان بە هۆی گفتوگۆوە نییە کە ئێمە لە بنەڕەتدا بە پێی بڕوای خۆمان لە دنیایەکی سەربەخۆی دەرەوە بێینە ژوورەوە. ئێمە دەبینین هەرکە دەستمان کرد بە تێڕامان ئەو بڕوایە لە خۆماندا ئامادەیە. کەواتە ئەوەیە کە دەشێت بە بڕوای غەریزەیی ناوببرێت. ئێمە هەرگیز ناچار نەکراوین کە پرسیار لە بارەی ئەم بڕوایەوە بکەین، بەڵام وەکو ڕاستییەك لەهەر حاڵەتێکی باری بینیندا وا دەردەکەوێت کە زانیاری حسی خۆی بە شێوەیەکی غەریزەییانە بڕوای وابێت کە شتێکی سەربەخۆیە لە کاتێکدا گفتوگۆ نیشانی دەدات کە ناشێت شتەکە لەگەڵ زانیاری حسیدا جووت (هاوشێوە) بێت. هەرچەندە ئەم دۆزینەوەیە شتێکی پارادۆکسی نییە لە حاڵەتی چێژ و بۆن و بیستندا و تەنیا لە حاڵەتی بەرکەوتندا تا ئەندازەیەکی کەم پارادۆکسییە- ئەم دۆزینەوەیە بڕوای غەریزەیی ئێمە بە لاوازی بەجێ دەهێڵێت بەوەی کە کۆمەڵێ شت هەن جووتن لەگەڵ زانیاری حسی ئێمەدا. نەك ئەم بڕوایە نابێتە هۆی هیچ گیروگرفتێك، بەڵکو بە پێچەوانەشەوە مەیلی ئاسانکردن و ڕێکخستنی حسابکردنمانی هەیە بۆ ئەزموونەکانی خۆمان و واش دەردەکەوێت کە هیچ بەڵگەیەکی باش لەبەردەستدا نەبێت بۆ ڕەفزکردنی. کەواتە دەشێ ئێمە سەرباری ئەوەش گومانکردنێکی سادە قبوڵ بکەین کە سەرچاوەکەی خەونەکانە- ئەویش ئەوەیە کە جیهانی دەرەوە بە ڕاستی هەیە و بە تەواوەتی لە بوونی خۆیدا نەوەستاوەتە سەر بەردەوامبوونی ئێمە بۆ پەیپێبردنی.

ئەو گفتوگۆیەی کە گەیاندوینی بەم ئەنجامە گفتۆگەیەکە جێگای گومان نییە و ئەوەندەش بەهێز

نییە لەچاو ئەوەی ئێمە دەیخوازین، بەڵام دیارترین نموونەیە لە زۆر گفتوگۆی فەلسەفیانەدا و هەروەها بەهاداریشە لە كاتێكدا بە شێوەیەكی كورت خاسێتی گشتی و ڕەوابوونی هەڵبسەنگێنرێت. هەموو مەعریفەیەك كە ئێمە دەیبینین پێویستە لەسەر بیروباوەڕە غەریزەییەكانمان بینا بكرێت و ئەگەر ئەم بیروباوەڕانەش ڕەت بكرێنەوە ئەوا هیچ شتێك بەجێ نامێنێت. بەڵام لەنێو بیروباوەڕە غەریزەییەكانماندا هەندێ بیروباوەڕ لە هەندێكی تریان زۆر بەهێزترن. لە كاتێكدا زۆر بیروڕا بە نزیكبوونەوە و ڕێككەوتن كەوتوونەتە ناو بیروباوەڕەكانی ترەوە كە لە ڕاستیدا ئەمانە بیروباوەڕی غەریزەیی نین، بەڵام بە هەڵە وا دانراون كە بەشێك بن لەوەی كە لە ڕووی غەریزییەوە بڕوایان پێبكرێت.

پێویستە فەلسەفە ڕیزبەندی بیروباوەڕە غەریزەییەكانمان نیشان بدات، ئەویش بە دەستپێكردن لەو بەشانەوە كە ئێمە زۆر بە بەهێزییەوە پێیانەوە خەریك دەبین و هەریەكەشیان وەكو شتێكی زۆر سەربەخۆ و زۆر سەربەست لە هەر ناپەیوەستبوونێكی زیادە نیشان دەدەین وەكو ئەوەی دەشێت. پێویستە چاودێری نیشاندانی ئەوە بكرێت كە تیایدا لە شێوەیەكدا ئەو ڕیزبەندییە دەچێتە پێشەوە، یان بیروباوەڕە غەریزەییەكانمان تیایدا بەریەك ناكەون بەڵكو سیستەمێكی هارمۆنی پێكدێنن. ناشێت هیچ هۆیەك بۆ ڕەفزكردنی بیروباوەڕی غەریزەیی لە ئارادا بێت تەنیا لەو حاڵەتانەدا نەبێت كە ئەو بیروباوەڕە لەگەڵ بیروباوەڕێكی تردا بەریەك بكەون، بەڵام ئەگەر ئەم ڕیزبەندیانە وەها بینران كە بۆ گونجاندنن، ئەوا سەرتاپای ئەو سیستەمە شایانی پەسەندكردن دەبێت.

بێگومان شتێكی شیاوە كە سەرجەمی بیروباوەڕی ئێمە یان هەر لایەنێكی بیروباوەڕی ئێمە بشێت هەڵە بێت لەبەرئەوە پێویستە هەموو بیروباوەڕی ئێمە وەها وەربگیرێت كە هەر هیچ نەبێت هەندێ ڕەگەزی سادەی گومانی تێدایە. بەڵام ئێمە ناتوانین بیانوویان (هۆ)مان هەبێت بۆ ڕەتكردنەوەی بیروباوەڕێك ئەگەر بێت و لەسەر زەمینەی بیروباوەڕێكی تر نەبێت. پاشان بە ڕێكخستنی بیروباوەڕە غەریزەییەكانمان و دەرئەنجامەكانیان بە هۆی حسابكردنی ئەوەی كە كام لەم بیروباوەڕانە بە زیاترین شێوە شیاو دەبێت ئەگەر پێویست بە ڕێكخستن و هاوسەنگ كردن یان وازلێهێنان بكات. ئێمە لەسەر بنەماكانی پەسەندكردنی تەنیا زانیاری دەگەینە ئەو ئاستەی كە ئەوەی بە شێوەیەكی غەریزەییانە بڕوامان پێیەتی لە ڕێكخستنێكی سیستماتیكانەی ڕێكخراوانەی مەعریفیماندا هێشتا شیمانەی هەڵەی تێدا ماوە.

ئەگەرچی ئەو شیمانەیە بە هۆی پەیوەندی ناوكۆیی بەشەكان و بە هۆی وردبینییەكی ڕەخنەییانەوە كە ئەوەش لە پێش پەسەندكردندا هاتووە كەم دەكرێتەوە.

بە لایەنی كەمەوە فەلسەفە دەتوانێت ئەم ئەركە پێشكەش بكات. زۆربەی فەیلەسوفەكان بە ڕاست یان بە هەڵە بڕوایان وایە كە فەلسەفە دەتوانێت كاری لەمە زیاتر بكات– فەلسەفە دەتوانێت مەعریفەمان بداتێ، ئەو مەعریفەیەی كە بە جۆرێكی تر لەبەردەستدا نییەو بە گشتی هەموو لە بارەی گەردوونەوەیەو هەروەها پەیوەستە بە سروشتی ئەوپەڕی حەقیقەتەوە (حەقیقەتی ڕەها). ئەگەرچی ئەمە مەسەلەكە بێت یان نا، ئەوا ئەركی زۆر سادە كە ئێمە قسەمان لە بارەیەوە كردووە ئەوەیە بە دڵنیاییەوە دەشێ لە لایەن فەلسەفەوە پێشكەش

بکرێت و بە دڵنیاییشەوە بۆ ئەوانەی کە جارێك کەوتوونەتە گومانەوە لە تەواوی هەستی گشتی تەواوی بکات بۆ بیانوو هێنانەوە بۆ کاری گران و بە زەحمەت کە کێشە فەلسەفییەکان لەخۆدەگرێت.

## سەرچاوە

*Bertrand Russell. The Problems of philosophy. London Oxford Uunverstty press. P.P 17-26.*

# مەسەلەکانی کۆمەڵناسی مێژووخواز

-1-

گی رۆشە

لە فارسییەوە: شۆڕش جوانڕۆیی

ئەمە بەشی یەکەمی کتێبی "تغییرات اجتماعی" نووسینی "گی روشە"یە کە نووسەر و وەرگێڕ؛ شۆڕش جوانڕۆیی سەرجەم کتێبەکەی وەرگێڕاوەتە سەر کوردی و بە نیازە لە زووترین کاتدا لە چاپی بدا. لێرەدا یەکەم بەشی دەخوێنینەوە.

کۆمەڵگا مێژووە، چونکە هەمیشە خۆی لە دۆخی جووڵانەوەیەکی مێژووییدا ئەگۆڕێ و، بەردەوامیش خەریکی گۆڕینی خۆی و ئەندامەکانی و چواردەوری و تەواوی ئەو کۆمەڵگایانەیە کە پەیوەندی لە تەکیاندا هەیە. کۆمەڵگا بە بێ وەستان هێزگەلێکی دەرەکی یان ناوەکی بەدی هێناوە کە جەوهەر و ئاراستە و چارەنووسی ئەگۆڕێ و، پێیان قایل بووە و تەحەمولیان ئەکات. تەواوی کۆمەڵگاکان چ بە شێوەی کتوپڕ، چ بە شێوەی ئارام، یان (ناهەستپێکراو) ڕۆژانە هەندێ گۆڕانکاری بە خۆوە ئەبینێ کە کەم تا زۆر هاوئاهەنگی لە تەك ڕابوردویدا هەبووە و پەیگیری پرۆژە و ڕەوتێکی کەم تا زۆری دیاری کراو ئەکات. کەواتە کۆمەڵگا تەنها کرداری کۆمەڵایەتی گرووپێك لە تاکەکان نەبووە و، ناکرێ بچووکی بکەینەوە بە ڕادەی فۆرمی ڕێکخراوێکی کۆمەڵایەتی، لە لایەکی دییەوە دەکرێ کۆمەڵگا بە جووڵانەوە یان گۆڕانی کۆمەڵێك لە دوای (زەمان)ەوە لە قەڵەم بدرێ.

بە دوای ئەو شیکارییەی کە لە کرداری کۆمەڵایەتی کتێبی یەکەمی ئەم کۆمەڵە (کرداری کۆمەڵایەتی) ئەنجام دراو، پاشان جۆرەها ڕێکخراوگەلی کۆمەڵایەتی کە لە کتێبی دووهەمدا (ڕێکخراوی کۆمەڵایەتی) مشتومڕی لەسەر کرا، لەم کتێبەدا خۆمان بە لێکۆڵینەوەی لایەنە مێژووییەکانی کۆمەڵگاوە سەرقاڵ ئەکەین.

### نەریت و لاوازی کۆمەڵناسیی مێژووخواز:

گەرچی کۆمەڵناسی تا هەنووکە لە لایەنی مێژووییەوە لە کۆمەڵگای کۆڵیوەتەوە تا لە جۆرێ دژایەتی یان دووفاقی بپارێزرێ، بەڵام لە لایەکیشەوە

(گۆڕان) یەکێکە لە ئاشکراترین تایبەتمەندییەکانی کۆمەڵگاو، بەم پێیە باس و خواستی کۆمەڵناسی هەر لە سەرەتاوە لە تەك پاسا و دانەوە و ڕاڤەکردنی گۆڕانە کۆمەڵایەتییەکاندا بووە، بەڵام لە لایەکی دیکەوە ئەبێ سەرنجی ئەم مەسەلەیە بدەین کە کۆمەڵناسی دەربارەی شیکردنەوەی مێژوویی خۆی لە کۆمەڵگا، هێندە پێشکەوتنی بەدەست نەهێناوە، چونکە (گۆڕان) یەکێکە لەو باس و خواستانەی کە لەم ڕووەوە کەمتر لێك تێگەیشتن لەنێو کۆمەڵناساندا هەیە و، هەرگیز لەو بوارەدا بە ڕێککەوتنێکی گشتی نەگەیشتوون. کەواتە، دەکرێ پرەنسیپ و سەرچاوەی قوتابخانە جۆراوجۆرە کۆمەڵناسییەکان لەو ڕاڤەکردنە جۆراوجۆرانەدا بدۆزینەوە کە لە گۆڕانی کۆمەڵایەتیدا چییەتی و لایەنگیرییان پێکهێناوە.

**یەکەمین کۆمەڵناسان:**

لە سەردەمی سەرهەڵدانی زانستی کۆمەڵناسییەوە تا ئێستا، تەواوی کۆمەڵناسان دانیان بەو مەسەلەیەدا ناوە کە گۆڕانی کۆمەڵایەتی لەنێو تەواوی دیاردە کۆمەڵایەتییەکاندا گرنگییەکی شایستەی هەیە. بەڵام تەنها لە سەدەی نۆزدەهەم و نیوەی سەدەی بیستەوەیە کە وتوویژ لەم زەمینەیەدا بە شێوەیەکی جدی لە لایەن کۆمەڵناسانەوە جێی گرتووە. بۆ یەکەمین جار (ئاوگۆست کۆنت) کۆمەڵناسی بە دوو بەشی سەرەکی دابەش کرد:

1-کۆمەڵناسی ستاتیك (ایستا)1

2-کۆمەڵناسی دینامیك (پویا)2

سیستمی (حاکم) بە سەر کۆمەڵگادا، بابەتی لێکۆڵینەوەی کۆمەڵناسی (ستاتیك)ە، واتە ڕەوشێك کە بە پێی ئەوە تاکەکانی کۆمەڵگایەك لە نێوان خۆیاندا جۆرە لێکتێگەیشتنێك ئەهێننە ئاراوە، کە لە ڕاستیدا دەستەبەرکەری بوون و بەردەوامی ژیان و کارکردی ئەو کۆمەڵگایەیە، یان بە دەربڕینێکی ڕوونتر، بناغە و بونیادی ڕێکخراوەکان و بەکاربردنی کۆمەڵایەتییە.

بە پێچەوانەوە، بابەتی کۆمەڵناسی (دینامیك) پێشکەوتن و پەرەسەندنە، واتە لێکۆڵینەوەی کاملبوونی کۆمەڵگاکان لە دوای مێژووی مرۆڤایەتییەوە و، لە ڕاستیشدا هەر لەسەر بنەمای ئەم تیۆرییە کە (ئاگۆست کۆنت) یاسای دۆخە سێ قاقییەکانی خۆی خستۆتە ڕوو، و لای ئەو کۆمەڵناسی (دینامیك) گەلەك لە کۆمەڵناسی (ستاتیك) پڕ بایەخترە، هەر بەو هۆیەوە لە کتێبەکەیدا گرنگییەکی زیاتری بەم لایەنە داوە.

کۆمەڵناسی (ئاگۆست کۆنت) بەندە بەم سێ پرەنسیبە گرنگەی لای خوارەوە:

1-لێکۆڵینەوە و ڕاڤەکردنی کۆمەڵگایەك لە زەمانێکی دیاریکراودا، کارێکی کردەیی نییە، مەگەر ئەوەی لە پەیوەندی لە تەك مێژووی ئەو کۆمەڵگایەدا و لە ئاستێکی بەرفراوانتردا، واتە لە پەیوەندی بە مێژووی مرۆڤایەتییەوە، پێکبێت. بەم پێیە (ئاگۆست کۆنت) زیاتر سەرنجی کۆمەڵگای مێژوویی و وەرگۆڕانی کۆمەڵگاکان لە بەشێکی (زەمان)دا ئەدات و، بەمجۆرە دەکرێ بڵێین کە بە پێویست کۆمەڵناسی (کۆنت) کۆمەڵناسییەکی (بەراوردکاری)یە کە چوارچێوە گشتییەکەی مێژوویی (جیهانی)یە.

2-پرەنسیپی دووهەمی (کۆنت) پشتئەستوورە بە لێکۆڵینەوەی بەربڵاو و پەرەسەندنی تێگەیشتنی مرۆڤ لە ڕەوتی مێژوویی کۆمەڵگادا، چونکە ڕەفتاری مرۆڤ لەسەر بنەمای تێگەیشتن و مەعریفەی خودی ئەو مرۆڤە دامەزراوە و پەیوەندییەکانیشی لە تەك دونیا و تەواوی

مرۆڤەكاندا، بەندە بەو شتەوە كە (ئەو) لە سرووشت و كۆمەڵگادا ئەیناسێت. بە دەربڕینێكی ڕوونتر، ناكرێ دیدگاكان بە بناغەی گۆڕانەكان بزانین، بەڵكو هۆكارە كاریگەر و بنەڕەتییەكان لە گۆڕانە مێژووییەكاندا، تێگەیشتن و شێوازە جۆراوجۆرەكانی ئەم تێگەیشتنن.

3- بە ڕەچاوكردنی سیستمی عەسەبی و پێكهاتەی بایۆلۆجی، مرۆڤەكان لە تەواوی شوێنەكانی دونیا و بە درێژایی هەموو سەردەمەكان هەموو یەك شكڵن (فۆرم) و، كەواتە كۆمەڵگای جیهانی بە پێی تاكە ڕەوشێك بە یەك شكڵ (فۆرم) گۆڕانی بەسەردا دێ، هەروەها مرۆڤایەتیش بە شێوەیەك هەنگاو بەرەو جۆرە كۆمەڵگایەكی پێشكەوتووتر هەڵئەگرێت.

دەكرێ لەنێو كۆمەڵناسانی دیكەدا، (ماركس) و (ئەنگلز)یش بە خاوەن تیۆری (كۆمەڵناسی گۆڕان) لە قەڵەم بدەین، بەڵام ئاشكرایە كە دەبێ بە دید و بەربڵاوییەكی زیاترەوە لێكۆڵینەوە لەسەر ئەم كۆمەڵناسییە بكەین. لە ڕاستیدا (ماركس) و (ئەنگلز) ئەیانویست كە ڕیشەی وەرگۆڕانی كۆمەڵگا كاپیتالیستەكان ڕاڤە و ڕوون بكەنەوە و، پێیان وابوو كە توندبوونی ململانێی نێوان چینی خاوەن ئامرازی بەرهەمهێنان و چینی كرێكار ئەبێتە هۆی تەفروتوونابوونی كۆمەڵگای كاپیتالیستی و، كۆمەڵگایەكی كۆمۆنیستی بێ (چین)ی لێ ئەكەوێتەوە. بەرهەمی بەرجەستەی بەشێكی دی لە كۆمەڵناسە ناسراوەكانی دونیا لەسەر بنەمای دیدی مێژوویی پێكهاتووە. دەكرێ لەم نێوەدا ناوێك لە (هێربرت سپنسەر)[3] "یاسای وەرگۆڕانی گشتی". "دوركهایم"[4] "دابەشكردنی كار"، "سیمێل"[5] "لێكۆڵینەوە دەربارەی دژەكان"، (پارتو)[6] "گواستنەوە یان جێگۆڕكێی هەڵبژاردەكان"، (ڤێبەر)[7] "شوێنەواری بونیادە مێژوویی"یەكان ببەین. ئێمە، لێرە بەدواوە بە كەڵك وەرگرتن لەو دەرفەتانەی كە دەمانبێت، لەم ڕووەوە توێژینەوە لە ئاسەوار و تیۆرەكانی هەریەك لەم دانشمەندە كۆمەڵناسانە دەكەین.

بە كورتی، دەكرێ بڵێین كە یەكەمین كۆمەڵناسان دیاردە كۆمەڵایەتییەكانیان وەك (وێنە) گرێك نەگرتووە كە تەنها بۆ چركەساتێ وێنە دەگرێ، بەڵكو وەك (فیلم بەردار)ێك جوڵەی مرۆڤەكان و ڕەوتی ڕووداوە گرنگە مێژووییەكانیان بە درێژایی زەمان، فیلم بەرداری كردووە.

## كاریگەرییە سێ لایەنەكان:

كۆمەڵناسی بەم سێ ئەسەرە دەرەكییەی لای خوارەوە كاریگەر ئەبێ: یەكەم ئەوەی كۆمەڵناسی لە قۆناغەكانی بەراییدا لە فەلسەفەی مێژووەوە وەرگیراوە كە كاریگەری فەلسەفەی مرۆڤی لەسەرە، بە شێوەیەكی گشتی، توێژەروان و ئەندێشمەندانی سەدەی هەژدە و نۆزدە لە سەردەمی خۆیاندا سەرنجی مرۆڤێكیان ئەدا، كە لە دۆخی ڕزگاركردنی خۆیدا بووە لە ڕابوردوویەكی سەركوتكەر و هەڕەشە ئامێز و، لەم ڕووەوە ئەوان خەریكی توێژینەوەی دەرخستنی ئەو هەوڵ و تەقەلا زۆر و بەرفراوانە بوون كە لە مێژوویی مرۆڤایەتیدا بە مەبەستی بەدەست هێنانی ئازادی ئەنجام دراوە. هەروەها، ئەوان هەوڵیان داوە كە لە قۆناغە جیاوازەكانی ئەم جووڵانەوە و تەقەلادانە تێبگەن و لە هەمان كاتدا ساتەوەختە جۆراوجۆرەكانی وەرگۆڕان و كامڵبوونی پلە بە پلەی كۆمەڵگا جۆراوجۆرەكان لە یەكدی جیابكەنەوە. لەم نێوەدا كۆمەڵناسی وەك ئامرازێكی لێهات بەدەست ئەوانەوە كە لە هەمان كاتدا توێژینەوەیان لەسەر ئەو ڕێگایە ئەكرد كە بەرەو

ئازادی پێورابو، و هەروەها ڕێگایەکیش کە هێشتا درێژەی هەیە.

دوهەم، تیۆرەکانی کامڵخوازان (پەیڕەوانی قوتابخانەی وەرگۆڕانخوازی لە بایۆلۆژی)[8]دا لە ڕواڵەتدا بە شێوەی سەرمەشقێك دەرهات کە بۆ لێکۆڵینەوەی وەرگۆڕانە مرۆیی و کۆمەڵایەتییەکان بە کەڵك بوو– ڕەنگە ئەمڕۆ ئەو کاریگەرییانە بە جدی وەرنەگیرێ کە ئاسەوارەکانی (لامارك) و (داروین) سەبارەت بە زانستی مرۆیی لە کۆتایی سەدەی نۆزدەهەم و سەرەتای سەدەی بیستەمدا هەیبووە، لەگەڵ ئەوەشدا ئەم کاریگەرییانە هێندە قووڵ بوو کە بەبێ ئەوە ناکرێ پاساو بۆ ئەو ناوبانگە بهێنرێتەوە کە مرۆڤناسی و کۆمەڵناسی لە سەرەتای هەمان سەدەدا بە تایبەت لە وڵاتە ئەنگلۆساکسۆنەکاندا هەیبووە– سەرەڕای ئەوەش دەرخستنی ئەم ڕاستییە ئەستەم نییە کە تا ئێستاش ناوبانگی قوتابخانەی (کامڵبوون)ی داروین کاردانەوەی لەسەر کۆمەڵناسی و مرۆڤناسی ئەم سەدەیەمان هەیە.

لە کۆتاییدا ئەبێ ناوێك لە کاریگەریی زانستی مێژوو لەسەر کۆمەڵناسی ببرێ کە بە زۆری چاوپۆشی لێ ئەکرێ، لە کاتێکدا دەکرێ ئەو لافە لێبدرێ کە هەندێك لە لقەکانی کۆمەڵناسی، سەرەتا وەك چەشنێك لە مێژووی کۆمەڵایەتی و یان وەك میتۆدێکی زانستی لە مێژوودا پێناس کراون. لە ئەڵەمانیادا، کۆمەڵناسی وەك کاردانەوەیەك لە دژی مێژوو دەرکەوت کە بە تایبەت سەرقاڵی نووسینەوەی ڕووداوەکان بوو، واتە دژی مێژوویەك کە تەنها پشتئەستوور بوو بە ڕوداوە رووت (ئەبستراکت) و تاك و تایبەتەکان و، لەنێو دیاردە مرۆیی و کۆمەڵایەتییەکاندا تەنها تاوتوێی ڕووداوە تایبەتە دووپات نەکراوەکانی دەکرد. بەم پێیە مێژوو خۆی وەك زانستێکی سەربەخۆ ڕەت ئەکاتەوە و گرنگی خۆی تەنها لە پەیوەندییەکی گەلەك بچووکی ڕووداوەکاندا، بەرتەسك ئەکاتەوە.

لە لایەکی دییەوە (ڤێبەر) دژی ئەو جۆرە بیرکردنەوەیە وەستا و کۆمەڵناسی وەك لقێك لە مێژووی بەراوردکاری و پاساودانەوە ناودێر کرد.

## کاریگەری قوتابخانەی ئەساڵەتی کارکرد (فۆنکشیونالیزم)[9]ە

بە زۆری لەو بڕوایەدان کە قوتابخانەی (فۆنکشیونالیزم) ئەو نەریتەی گۆڕی کە پاش تەقەلایەکی زۆر بۆ دروستبوونی کۆمەڵناسییەکی مێژوویی لە لایەن یەکەمین کۆمەڵناسانەوە ئەنجام دراو کۆمەڵناسییان لە ڕیزی زانستێکی مێژوویی یان زانستێك سەبارەت بە لێکۆڵینەوەی مێژوو هێنایە دەرەوە.

لە ڕاستیدا هەر بەو جۆرەی کە گوترا (فۆنکشیۆنالیزم) ڕووبەڕووی قوتابخانەی (تەکامول) بووبووەوە کە لە سەدەی نۆزدەهەمدا برەوی هەبوو– پەیڕەوانی ئەم قوتابخانەیە بێبایەخی زانستی میتۆدەکان و ئەنجامگیرییەکانی لایەنگرانی قوتابخانەی (ئەساڵەتی تەکامول) یان (بە گێڕانەوەی سپنسەر) ئاشکرا کرد و لە جێگای ئەوانە میتۆدێکی بەهێزتر و تۆکمەتریان بە مەبەستی شیکردنەوەی کۆمەڵگا خستە ڕوو. ئەوان بە ناساندن و پێشنیاری لایەنگرییەکی تازە بۆ ڕاڤەکردنی. مەسەلە کۆمەڵایەتییەکان، زیاتر خواستیان بەرەو ئەو لایەنە هەبوو کە ڕێکخراو و ئەرکەکانی کۆمەڵگا تەنها لە ساتەوەختێکی دیاریکراوی وەرگۆڕاندا بخەنە ژێر تیشکی خوێندنەوە و توێژینەوەوە، بەم جۆرە (فۆنکشیۆنالیزم) یان وەك قوتابخانەیەکی

دیاریکراو دروست کرد کە نە بایەخی بە مێژوو ئەداو نە بە لێکۆڵینەوەی گۆڕانی کۆمەڵایەتی سەرقاڵ ئەبوو.

لێرەدا، ئەبێ ئەو خاڵەمان لەبیر نەچێ کە (فۆنکشیۆنالیزم) بە تایبەت بە هۆی مرۆڤناسییەوە پێناسە کراوە و بەکاربراوە و، ئەمەش لەبەرئەوە بوو کە ئەو کۆمەڵگا سەرەتاییانەی کە لێکۆڵینەوەیان لەسەر کردوون، مێژوویەکی دیاریکراو و زانراویان نەبووە و هەر ئەم مەسەلەیەش هۆکارێکی گەلەك گرنگە لە شێوەی دەربڕین و تێڕوانینی پەیڕەوانی (فۆنکشیۆنالیزم)دا دەرهەق بە مەسەلە کۆمەڵایەتییەکان. ئەم گوێپێنەدانە لە دیدی مێژووییەوە سەبارەت بە کۆمەڵگا، بۆتە هۆی ئەوەی لێکۆڵینەوەکان بە شێوەیەکی فراوان بەرتەسك بکاتەوە و، لە ڕاستیدا ئایدیا بنەڕەتییەکانی ئەم قوتابخانەیەی بێ مەسرەف کردووە هەروەها ئەم گوێ پێنەدانە بووە هۆی ئەوەی کە لە تەواوی ماوەی دوو یان ئەو سێ دەیەی کە (فۆنکشیۆنالیزم) بەسەر کۆمەڵناسی و مرۆڤناسیدا زاڵ بوو، نەریتی مێژووخوازی لە لێکۆڵینەوە کۆمەڵایەتییەکاندا، نە گرنگی لە توێژینەوە تیۆرییەکاندا هەبێ، نە لە توێژینەوە تاقیکارییەکاندا، و تەنها سەرنجی کۆمەڵناسانی بۆ وەسف کردن و ڕاڤەکردن ڕاکێشابوو هەروەها ئەرکی ڕێکخراوە کۆمەڵایەتییەکانی چڕ کردبۆوە.

### لێکۆڵینەوەی گۆڕانی کۆمەڵایەتی لەلایەن هەندێ لە کارکردخوازانەوە:

لەگەڵ ئەوەشدا، سەرەڕای ئەو شتەی کە هەندێ جار ئەبیسترێ، نابێ وا تەسەور (وێنا) بکرێ کە (فۆنکشیۆنالیزم) دەستی هەڵگرتووە لە هەر چەشنە لێکۆڵینەوەیەك سەبارەت بە گۆڕانی کۆمەڵایەتی، چونکە هەر لەو دەورەیەدا زۆرێك لە توێژەرەوەکان ڕاڤەکارییەکی گەلەك سەرنجڕاکێشیان یان لە پەیوەندی بە هەندێ لە هۆکارەکانەوە، یان سەبارەت بە چۆنییەتی گۆڕانی کۆمەڵایەتی ئەنجام داوە. تەنانەت لەم بوارەدا (دیڤیس کینگزلی)[10] جەخت لەوە ئەکات کە هەندێ لە گەورەترین شیکارییەکانی گۆڕانی کۆمەڵایەتی لە ئاسەواری ئەو توێژەرەوانەدا بەرچاو ئەکەوێ کە وەك (فۆنکشیۆنالیزم) ناوبانگیان دەرکردووە[11]. بۆ نموونە نابێ بایەخی (گرنگی) ئەو لێکۆڵینەوانە بە کارێکی ناچیز لە قەڵەم بدەین وەك ئەوەی کە (کرۆبەر)[12] ئەنجامی داوە سەبارەت بەو گۆڕانانەی کە لە بڵاوکردنەوەی داهێنانەکان و، تەکنیکەکان و ئاگاییەکانەوە سەرچاوەی گرتووە، یان ئەو شیکارییە گەلەك وردەی کە (بارنت)[13] دەربارەی پەیوەندی هەندێ مەسەلەی جۆراوجۆری نوێگەری لە کۆمەڵگا دێرینەکان و کۆمەڵگا پێشکەوتووەکاندا ئەنجامی داوە[14]. هەروەها لە کۆمەڵناسی (ڕۆبەرت مرتۆن)دا کە بە ڕاڤەکردنی ڕۆڵی هۆکارە جۆراوجۆرە کۆمەڵایەتی- کلتورییەکانەوە خەریك بووە لە وەرگۆڕانی هوشیارییە زانستی و تەکنەلۆژییەکاندا، لە ڕۆڵی (ئەو) لەمەڕ (فۆنکشیونالیزم) بە ئاگاین[15]. ئێمە، لە بەشەکانی داهاتوودا دەرفەتمان ئەبێ ئاماژە بە ئاسەوارەکانی بکەین.

هەروەها دەکرێ لەم نێوەدا ناوی (سملسەر)[16] ببەین کە یەکێك بووە لە هاوکارەکانی (پارسونز) و لە دوای هاتنی پلە بە پلەی ماشێن لە پیشەسازی ڕستن و چنینی بەریتانیادا، ڕاڤەکارییەکی گرنگی لەسەر ڕێکخراو و کاری پیشەیی لە سەدەکانی هەژدە و نۆزدەدا ئەنجام داوە[17].

دیارە لەم ڕووەوە، هێشتا دەكرێ كەسانێكی دی بە لیستی ئەم توێژەرەوانە زیاد بكەین، بەڵام هەر ئەم نموونانە بەسن بۆ دەرخستنی ئەوەی كە نەریتی لێكۆڵینەوە مێژووییەكان لەسەر كۆمەڵناسی دوایی نەهاتووە، سەرەڕای ئەوەی كە ئەم لێكۆڵینەوانە لە دەورەی زاڵبوونی (فۆنكشیۆنالیزم)دا وەستانێكی تێكەوت.

### گەڕانەوە بەرەو لێكۆڵینەوە:

دەربارەی گۆڕان لەم ساڵانەی دواییدا، خواستێك لە كۆمەڵناسیدا بە ئاراستەی لێكۆڵینەوەی گۆڕانی كۆمەڵایەتی بەرچاو ئەكەوێت. بۆ تێگەیشتن لەم ڕاستییەش هێندە بەسە ئەوە لەبەرچاو بگرین كە دەرهەق بەو كتێبانەی كە لە ماوەی ئەم ساڵانەی دواییدا لەم بوارەدا نووسراوە و یان كورتەی ئەو وتارانەی كە لە گۆڤارە پڕبایەخەكانی كۆمەڵناسیدا بڵاوكراوەتەوە. بە بێ ڕاوەستان لێكۆڵینەوە لە بوارە جۆراوجۆرەكانی گۆڕانی كۆمەڵایەتیدا ڕوو لە زیادبوونە و لەم ڕووەشەوە هۆكارگەلێكی جۆراوجۆر جێی سەرنجن كە ئێمە تەنها بە هەرە گرنگەكانیانەوە سەرقاڵ ئەبین.

### بێداری جیهانی سێهەم:

بێداری وڵاتە تازەپێگەیشتووەكان، تەقەلاكانیان بۆ ڕزگاربوون لە دواكەوتوویی، گۆڕانكاری ئابووری، سیاسی، كۆمەڵایەتی و كەلتوورییەكانی كە لەو وڵاتانەدا هاتۆتە ئاراوە، سەرنجی گەلەك لە كۆمەڵناسانی بەلای خۆیدا ڕاكێشاوە لەم جۆرە وڵاتانەدا بە هۆی بەسەرهات و ڕووداوە گرنگەكانەوە سیستمی كۆنی (حاكم) سست (لەق) بوو، و خواستەكان ونەریتەكان و شێوە بیركردنەوەیەك كە تا هەنووكە زاڵ بوو بەسەر كۆمەڵگادا و جێی ڕەزامەندی هەمووان بوو، بەرەو لاوازی ئەچوو بەم جۆرە جیهانی سێیهەمی پێكهاتبوو لە وڵاتانی فرەچەشن و جۆراوجۆر و لە هەمان كاتدا هەر یەك لەوانە بە تایبەتمەندیگەلی جیاوازەوە شكڵی گرت، كە خاڵی هاوبەشی تەواوی ئەو وڵاتانە كامڵبوون و پەرەسەندنیان بوو لە تەك ئاهەنگێكی خێرا و هەندێ جار كتووپڕ و ناچاوەڕوانكراودا. لە هەمان كاتدا دەوڵەتەكان و خاوەن پیشەسازییە گەورەكانی وڵاتە داگیركەرەكان بە نیگەرانییەكی زۆرەوە بە دوای ئەو گۆڕانانەوە بوون. بەرژەوەندییە سیاسی و ئابوورییە گەورەكانی ئەم وڵاتانە كەوتبووە مەترسییەوە و، هەر لەم ڕووەوە بە گشتی تەقەلایان ئەوەبوو كە تا بۆیان ئەكرێ لانی كەم بەرژەوەندییە بنەڕەتییەكان و ژیانیان ڕزگار بكەن لە مەترسی تەفروتوونابوون. لەم ڕووەوە دەوڵەتەكان لە هەندێ مەسەلەدا توێژەرەوەكانیان هاندا كە بە شێوەیەكی ورد و زانستی بەو مەبەستە تایبەتانەی لەبەرچاویان گرتبوو، سەرقاڵ بن و ئەم سیاسەتەش تا ساڵانێكی زۆر درێژەی كێشا. لە ساڵانێكی زووەوە فەڕەنسا و بەریتانیا خەرجی لێكۆڵەرەوەكان و دامەزراوگەلی توێژینەوە و هاندانی كاری ئەوانەیان لە كۆلۆنییەكانی خۆیاندا لە ئەستۆ گرتبوو و، (دەرئەنجام)ی ئەم لێكۆڵینەوانەش ئیجازەی بە وڵاتانی داگیركەر ئەدا كە بە شێوەیەك خەریكی بەڕێوەبردنی كۆلۆنییەكان بن كە قازانجێكی زۆریان بۆ لەخۆ بگرێت. بە دوای ڕاپەڕینە دژ بە داگیركارییەكان، یارمەتییە داراییەكان لە بواری توێژینەوە كۆمەڵایەتییەكاندا بە تایبەتی لە (ئەمەریكا)دا ڕووی لە زیادبوون كرد بە شێوەیەك كە لە

ڕادەبەدەر ئامانجە سیاسی و داراییەکانیان لە بەرچاو گرت.

**قەیران لە وڵاتە پێشکەوتووەکاندا:**

تا ڕادەیەك، هەر لە سەرەتاوە کۆمەڵگا پێشکەوتووەکان زیاتر خۆیان لە بەرامبەر قەیرانە بنەڕەتییە قووڵەکاندا بینییەوە و، هەندێ شێوازی نوێ لە ئایدۆلۆژییە توندڕەوەکان سەری هەڵدا. (قەرەجە ئاسودەخوان)[18] و گۆشەگیرەکانی ڕۆژانی ڕابوردو کە لایەنگریان لە دونیای ئاشتی ئامێز و دۆستانە ئەکرد، گۆڕان بە یەك ڕاپەڕینی هیچی خوازی. هەر لەو سەردەمەدا گرووپەکانی دیکەی چەپ و ڕاست بە مەبەستی پایەداربوونی سیستەم یان بۆ سەقامگیربوونی سیستەمێکی نوێ دەستیان بۆ توندوتیژی و کاری ناڕەوا درێژ ئەکرد.

لە لایەکی دییەوە، لاوانیش وەك ناڕەزاییەکی بە کۆمەڵ دژ بە کۆمەڵگای پیشەسازی و بۆرۆکراتیك و سەرمایەداری و لایەنگری لە کۆمەڵگایەکی دادپەروەر و پاکیزە، شۆڕشیان بەرپا کرد. دژایەتی توندی بەهاکان، پیاچوونەوە بە ئایدۆلۆژیای دەسەڵاتداراندا و، هەروەها گۆڕانکارییە بونیادییەکان لەو دیاردانەی دیکە بوون کە بە دۆخی خولقاندنی ئەم سەدەیە لە قەڵەم ئەدران.

هەر بەو جۆرەی کە پێشتر باسمان کرد، لە ڕاستیدا کۆمەڵناسی بە تەرازی ئاهەنگی سەردەمی خۆی گۆڕانی بەسەردا هاتووە و هەر لەبەر ئەمە ئاساییە کە سەرنجی بەشێکی زۆر لە کۆمەڵناسان بەم دیاردەگەلە تازەیەوە پەیوەست بێت و، دەرئەنجام لە هەوڵی شیکردنەوەی بناغەکان، هۆکان و گۆڕانەکانیابن.

**کاریگەری کۆمەڵناسی مارکس:**

لەسەر ئەو شتانەی کە گوتمان، دەبێ ئاکامی کاریگەرییەکانی (مارکس) لەبەرچاو بگرین. تا سی ساڵ لە مەوبەر بەشێکی یەگجار کەم لە کۆمەڵناسان دیدگاکانی (مارکس)یان سەبارەت بە لێکدانەوە مێژووییەکانی کۆمەڵناسی قبووڵ ئەکرد. (مارکس)یان بە فەیلەسووفێك، ڕیفۆرم خواز و یا ڕێنمویکەرێ ئەزانی و، نەك وەك کۆمەڵناسێك، لە کاتێکدا کە ئەمڕۆ بەشێك لە کۆمەڵناسان (مارکس) وەك یەکێك لە پێشڕەوانی بنەڕەتی سیستەمی فکری خۆیان لە قەڵەم ئەدەن، کۆمەڵناسانی ئێستاش بە (مارکسیست) و (نامارکسیستەکان)ەوە هەوڵیان داوە کە کۆمەڵناسی (مارکس) سەرلەنوێ بناسن یان پێی قایل بن.

(هانری لۆفور) و (لوسین گوڵدمان)[20] لە ژمارەی ئەو کەسانەن کە بە توندی لەژێر کاریگەری دیدگا کۆمەڵناسییەکانی (مارکس)دا بوون.

بەڵام لەنێو کۆمەڵناسە نامارکسیستەکاندا، بە گشتی کەسانێك کە خواستیان بەرەو لای (مارکس) هەبوو، ئەو توێژەرەوانە بوون کە حەزیان بە شیکردنەوەی گۆڕانی کۆمەڵایەتی ئەکرد، بەڵام میتۆدی (فۆنکشیۆنالیستەکان) ڕازی نەئەکردن، دەکرێ لەم کۆمەڵەدا بە تایبەت ناوی (ڕایت میلز)[21] و (ڕالف داڕندۆرف)[22] ببەین و لەنێو کۆمەڵناسە نامارکسیستەکاندا (گورویچ)[23] کە بۆ یەکەمین جار لێکۆڵینەوەیەکی قووڵی لەسەر کۆمەڵناسی (مارکس) کرد و پلەوپایەیەکی گرنگی بەدەست هێنا.

لە ڕاستیدا، بناغەی ئەم هەموو بایەخپێدانەی کە بە کۆمەڵناسی (مارکس) دراوە، ئەبێ لە دیدی مێژووییەوە لەو مەیل و تەقەلا تازانەی بواری لێکۆڵینەوە کۆمەڵناسییەکاندا، بە دوایدا بگەڕێین.

بەڵام هەر لەو سەردەمەدا کۆمەڵناسی (مارکس) لای بەشێکی زۆر لە کۆمەڵناسان مەیل گەلێکی تازەی بە ئاراستەی لێکۆڵینەوەی کێشەکان و مەسەلە تیۆری و تاقیکارییەکان هێنایە ئاراوە کە بە گۆڕانی کۆمەڵایەتی کۆمەڵگاوە پەیوەست ئەبن، وەك ململانێی چینایەتی، بزووتنەوە شۆڕشگێڕەکان، گۆڕانی بونیادی کۆمەڵگا و هەروەها.. بەم جۆرە کە پێوەندی خواستگەی رۆشنفکرانە و رووداوە مێژووییەکان لە کۆمەڵناسانی هاوچەرخدا مەیل گەلێکی بۆ دەستپێکردنەوەی لێکۆڵینەوە لە رەوتی گۆڕانە کۆمەڵایەتییەکان، هۆکارەکان، گۆڕان و گرفتەکان و کۆسپەکانیان هێناوەتە ئاراوە.

### گرفتی کۆمەڵناسان لە خوێندنەوەی گۆڕاندا:

بە گشتی کۆمەڵناسان لە بەرامبەر شیکردنەوە و دەربڕینی گۆڕانی کۆمەڵایەتیدا هەست بە بێتوانایی دەکەن. ئەوان لە کەمبوونی سیستمێکی تیۆری، نەبوونی تەکنیکەکانی توێژینەوە و ئامرازگەلی تایبەت بە مەبەستی بینین و راڤەکردن و پاساودانەوەی گۆڕانی بونیادە کۆمەڵایەتییەکان، ناڕەزایی دەرئەبڕن. هەندێك ئەم کەموکوڕیانە بەو کاریگەرییە بەردەوامانەوە ئەبەستنەوە کە (فۆنکشیۆنالیزم) لە دوای خۆی جێی هێشتووە.

### گۆڕان و وەرچەرخانە کۆمەڵایەتییەکان

هەروەها هەندێکی دیکەش وا تەسەور ئەکەن کە (فونکوشیۆنالیزم) لە زانستی مرۆییدا تەنها ئەو کاریگەرییە سادەیەی جێهێشتووە، لە کاردانەوەی چینی ناوەڕاستەوە بەدی هاتووە کە زیاتر حەزی بە پاراستنی ئەو دۆخەیە تا درووستکردنی گۆڕان. هەندێکی دیکە داکۆکی لەو (تێزە) ئەکەن کە نەبوونی کادرێکی تیۆری شیکاری سیستماتیك بۆتە هۆی دواکەوتویی کۆمەڵناسی بزۆز (پویا).

هۆی ئەم لاوازییە هەرچییەك بێت، دەبێ لێرەدا تەنها بناغەیەکی ئاشکرا لە بەرچاو بگیرێ کە کۆمەڵناسی مێژوویی کە لە دیدێکی مێژووییەوە لە کۆمەڵگاکان ئەکۆڵێتەوە دووچاری هەندێ لاوازی بووە کە ئێمە لای خوارەوە ئاماژە بە گرنگترینیان ئەکەین.

### سێ خاڵی لاوازی کۆمەڵناسی مێژووی هاوچەرخ:

بەر لە هەموو شتێك، تا ئێستاش کۆمەڵناسی خاوەنی تیۆرێکی گشتگیر نییە کە لە فۆرمێکی هەمەکیدا، شیکردنەوەی رێکخراوی کۆمەڵایەتی، مێژووی کۆمەڵایەتی و یان گۆڕانی کۆمەڵایەتی کۆبکاتەوە و بیخاتە روو. لە راستیدا، ئێمە لە زانستی کۆمەڵناسیدا لە بەرامبەر زانستی دەروونناسی (فرۆیدا) کەم ئەهێنین.

(فرۆید) تیۆرێك یان مۆدێلی کەسایەتییەکی هێنایە ئاراوە و لە دوای ئەوەشەوە وەك سیستمێك هوڵی دا تا لە کەسایەتییە مرۆییەکان کە لە ماوەی ژیانی هەر تاکێکدا پێکدێ و درووست ئەبێ، تێبگات. رەنگە بتوانین لە کۆمەڵناسیدا بڵێین کە ئەوە تەنها (مارکس) و (ئەنگلز)ن تا رادەیەك لە خستنەرووی ئەو مۆدێلە بەرفراوانە سەرکەوتوو بوون، مۆدێلێك کە لە هەمان کاتدا هەم کاریگەری دیدی (فۆنکشیۆنالیزم)ی لە سەرەو هەم لە دیدی مێژووییەوە لە حەقیقەتە کۆمەڵایەتییەکانی ئەوانەوە سەرچاوەی گرتووە. بەڵام کۆمەڵناسی ئەوان بە هۆی ئەوەی کە خاوەن کادێری تێفکرینی فەلسەفی و (جەدەلی) بوون کە تیایدا راڤەکردن و پاساودانەوەی مەسەلە کۆمەڵایەتییەکان بە دەقگرتوویەکی

تایبەتەوە مشتومڕی لەسەر ئەکرا، بێکەڵك مایەوە. هەروەها یەکێکی دیکە لە تایبەتمەندییەکانی ئەم کۆمەڵناسییە ئەوە بوو کە زیاتر پشتی بە مێژووی سیاسی و کۆمەڵایەتی ئەبەست تا بە مێژووی زانست، و ئەمەش دەرخەری ئەو ڕاستییەیە کە کۆمەڵناسی خۆی دیاردەیەکی کۆمەڵناسینە کە دەرئەنجام پەیرەوی لە بارودۆخ و جەبرە کۆمەڵایەتییەکان ئەکات.

بەم جۆرە، بەبێ لە بەرچاوگرتنی تیۆرێکی گشتی، لێکۆڵینەوەی گۆڕانی کۆمەڵایەتی لەنێو بوارە جۆراوجۆرەکانی لێکۆڵینەوە کۆمەڵناسییەکاندا، لێکۆڵینەوەیەکی تایبەتە و، ئێمە ناچارین مێژووخوازی لە لێکۆڵینەوە کۆمەڵایەتییەکاندا بەدیاردەیەکی جیانەکراوە لە تەواوی واقعییەتە کۆمەڵایەتییەکان بزانین.

گەرچی کۆمەڵناسان بە ئاشکرا حەزیان لە دووبارە ناسینی ئەم لایەنەی کۆمەڵناسی نییە، لەگەڵ ئەوەشدا هەمیشە ڕووبەڕووی ئەو جیاوازییە ئەبینەوە کە (ئاگۆست کۆنت) لە نێوان کۆمەڵناسی (ستاتیك) و کۆمەڵناسی (دینامیك)دا هێنایە ئاراوە. کۆمەڵناسانی هاوچەرخ لە بەکارهێنانی ئەم (ترمینۆلۆژی)یە سەرپێچی ئەکەن و، بەڵام لە تەواوی مشتومڕەکان، کتێبەکان و گۆڤارە کۆمەڵناسییەکاندا، نووسەران ناچارن کە بەشێك یان بەندێك بۆ لێکۆڵینەوەی "گۆڕانی کۆمەڵایەتی" تەرخان بکەن. سێهەمین لاوازی کۆمەڵناسی گۆڕان، لە دوانەکەی دی گرنگترە. دەکرێ ئەم پرسیارە بخرێتە ڕوو کە ئایا بە ڕاستی تیۆری (کۆمەڵناسی گۆڕان) هەیە؟ ئەگەر ئەو جۆرە تیۆرە هەبێت، پێویستە بە هۆی ئەوەوە بتوانرێ ڕووداوەکانی داهاتوو پێشگۆیی بکرێ و لە ڕاستیدا تاقیکردنەوەی ئەم پێشگۆییانە لە بۆتەدا تەنها ئەزموونێکە کە دەکرێ بە هۆی ئەوەوە بایەخی تەواوی تیۆرەکانی گۆڕانی کۆمەڵایەتی هەڵسەنگێنین.

کەواتە، دەبێ کۆمەڵناسان پەی بەرن بەو بابەتە کە ئەوان ئیمکانی ئەوەیان نییە کە لەسەر بنەمای زانست پێشگۆیی بکەن، کەواتە چۆن ئەتوانن ئەو لافە لێبدەن کە لە کۆمەڵناسیدا تیۆرێکی پڕبەها سەبارەت بە گۆڕان هەیە؟ لە ڕاستیدا ئەمە پرسیارێکە مایەی سەرنج و تێڕامانە کە دواتر دێینەوە سەری.

### وەرچەرخان و گۆڕانی کۆمەڵایەتی:

بەرلەوەی بەو مەسەلە و کێشەگەلەوە سەرقاڵ بین کە لە دیدی مێژووییەوە پەیوەندییان بە لێکۆڵینەوەی کۆمەڵگاکانەوە هەیە، پێویستە لەم بوارەدا سەبارەت بە پێناسەگەل و گرووپبەندییەکان، دەستپێشخەری بکەین.

*1*/وەرچەرخانی (تحول) کۆمەڵایەتی:

سەرەتا، ئەبێ بە جیاوازی نێوان وەرچەرخان و گۆڕانی کۆمەڵایەتی قایل بین. بە گشتی وەرچەرخانە کۆمەڵایەتییەکان بە کۆمەڵێك لەو وەرچەرخانانە ئەزانن کە لە ماوەی یەك دەورەی درێژخایان لەنێو یەك یان ڕەنگە چەند وەچەیەکدا کۆمەڵگایەکدا ڕووئەدات. کەواتە لە وەرچەرخانی کۆمەڵایەتی بە پێی ئەو پێناسەی سەرەوە پرۆسەگەلێکە کە ناکرێ لە ماوەیەکی زەمانی کورتدا تێبینی بکرێت. ئەتوانین وەرچەرخانی کۆمەڵایەتی بە تاکە دیاردەیەك بزانین کە پێکهاتووە لە کۆمەڵێك لە بەشەکان کە لە بەرزاییەکی بڵندەوە نەبێ توانای دیتنی نییە.

*2*/گۆڕانی (تغیر) کۆمەڵایەتی:

بە پێچەوانەوە، گۆڕانی کۆمەڵایەتی بریتییە لە دیاردە گەلێك کە لە ماوەیەکی زەمانی کورتدا توانای بینین و لێکۆڵینەوەی هەیە، بە چەشنێك کە هەر کەسێکی ئاسایی بە درێژایی ژیانی یان درێژایی دەورەیەکی کورت لە ژیانیدا، ئەتوانێ بە شەخسی پەیگیری گۆڕانێك بکات و، ئاکامی یەگجاری ببینێت یان لە ئاکامی کاتی تێبگات سەرەڕای ئەوەش گۆڕانی کۆمەڵایەتی لە سنووری ناوچەیەکی جوگرافیایی و کۆمەڵایەتی دیاریکراودا ڕووئەدات و لەم ڕووەشەوە جیاوازی لە تەك وەرچەرخانی کۆمەڵایەتیدا لەوەدایە کە دەکرێ ئەویان لە چوارچێوەی سنوورێکی جوگرافیایی و یان لە کادری کۆمەڵایەتی کلتوری گەلەك بەرتەسکتردا بخوێنرێتەوە.

**گرنگی یان (بایەخ)ی جیاکردنەوەی سەرەوە:**

جیاوازی نێوان وەرچەرخان و گۆڕانی کۆمەڵایەتی گرنگییەکی زۆر لە خۆ دەگرێت. لە ڕاستیدا یەکەمین کۆمەڵناسان زیاتر مەیلیان بە لێکۆڵینەوەی وەرچەرخانی کۆمەڵایەتی هەبوو تا گۆڕانی کۆمەڵایەتی، بە گشتی خواستی (ئاگوست کۆنت) (مارکس)، سپنسەر، دۆرکهایم، گرنگیدان بووە بە ڕاڤەکردن و پاساودانەوەی وەرچەرخانی کۆمەڵگا مرۆییەکان و مرۆڤایەتی لەنێو سەدەکاندا، لە کاتێکدا کە لە کۆمەڵناسی هاوچەرخدا ئەوە دیاردەی (گۆڕان)ی کۆمەڵایەتییە کە کۆمەڵناسان بایەخی پێئەدەن. نەریتی مەیلخوازی سەبارەت بە لێکۆڵینەوەی لایەنی مێژوویی کۆمەڵگاکە پێشتر ئاماژەمان پێ کرد، گۆڕانی بەسەردا هاتووە و هەروەها کۆمەڵناسی (دینامیك) کە ئەمڕۆ قسەی لەسەر ئەکرێ بە هەمان مانا و چەمك نییە کە (ئاگۆست کۆنت) لەبەرچاوی گرتبوو، چونکە (ئەو) لە کۆمەڵناسی خۆیدا ئیمکانی لێکۆڵینەوەی گۆڕانکارییەکی گەورەی مێژوویی مرۆڤایەتی ئەبینی، لە کاتێکدا کە لە سەردەمی ئێمەدا بەربڵاوی دیدی کۆمەڵناسی دینامیك تەنها بە گۆڕانە یەگجار بچووکەکان بەرتەسك ئەبێتەوە و هەر لەبەر ئەم هۆیەش بوو کە کۆمەڵناسی وەرچەرخان لە بەرامبەر قوتابخانەی (فۆنکشیۆنالیزم)دا وەستایەوە، نەك کۆمەڵناسی گۆڕان.

**چەمکی گۆڕانی کۆمەڵایەتی:**

جیاکردنەوەیەکی دی بە هۆی (پارسۆنز)ەوە[24] سەبارەت بە گۆڕانی هاوسەنگی و گۆڕانی بونیادی خراوەتە ڕوو[25]. بە کورتی، ئەکرێ بەم جۆرە پێناسەی (پارسۆنز) لەسەر گۆڕانی هاوسەنگی و گۆڕانی بونیاد کورت بکەینەوە:

*1*–دۆخی یەکەم، بێئەوەی گۆڕانکاری لە سیستمی کۆمەڵایەتیدا بەدەست بێ، هاوسەنگی بەدیهاتوو جێی خۆی بە هاوسەنگییەکی تازەتر ئەدات، بە واتایەکی دیکە سیستم بە شێوەی کۆمەڵەیەك ئەمێنێتەوە. ئەم هاوسەنگییە تازەیە بە دوای گۆڕانەکانی هەندێ لە بەشەکانی سیستم یان وردە سیستەمەکاندا ڕووئەدات. (پارسونز) پێی وایە کە گۆڕانکاری لە هاوسەنگیدا دیاردەیەکی ئاسایی و هەمیشەییە لە ژیانی سیستمی کۆمەڵایەتیدا.

*2*–ئەگەر هێزە کاریگەرەکان لە گۆڕانکاریدا گەلەك بەهێز بن و، لەسەر سیستم دائەنێ، خۆ ئەگەر پاڵەپەستۆیەك کە لە دەرەوە و ناوەوە کاریگەری بەهێز بێ ئەو گۆڕانەی کە لە گۆڕانی هاوسەنگیدا ڕووئەدات، بە تەواوەتی جیاوازە بە شێوەیەك کە گۆڕانکارییەکی قووڵی لە هەموو سیستمدا

لێئەکەوێتەوە و ئەم گۆڕانەش بە گۆڕانی بونیادی ناوئەبرێت[25].

(ریچارد لاپیر)[26] بە مەبەستی ئاشکراکردنی گۆڕانی کۆمەڵایەتی ئەو لەو شتە جیائەکاتەوە کە گۆڕانی کۆمەڵایەتی نییە.

سەرەتا، ئەبێ گۆڕانی کۆمەڵایەتی لە پێشهات یان ڕووداو جیابکرێتەوە، بۆ نموونە مەسەلەی ریفراندۆم یەك پێش هاتە و هەروەها بە هەمان پێوەر، ئەبێ مانگرتنێك، ئەنجومەنێك یان ئاگرکوژانەوەیەکیش بە پێشهات بزانین. ڕووداو ئەتوانێ بەشێك بێ لە گۆڕان و لە تەکیا سازگار بێ و یان ئەوەی بزوێنەری بێت، بەڵام هەمیشە وەك پێویست بەو جۆرە نییە. ئاگرکوژانەوەیەك، ریفراندۆم، یان مانگرتنێك لە خۆیدا گۆڕانێکی کۆمەڵایەتی بە دوای خۆیدا ناهێنێتە ئاراوە، ناکرێ گۆڕانی (پرسنل)یش بە گۆڕانێکی کۆمەڵایەتی لە قەڵەم بدەین، چونکە ئەمە گۆڕانێکی بێپسانەوەیە، بەم جۆرە لە کۆمەڵێکدا وەچەی نوێ بە دوای یەکدا جێی وەچەی نوێ ئەگرێتەوە و بە هەمان پێوەر لیژنەیەکی بەڕێوەبەری تازە لە جێی لیژنەی بەڕێوەبەری کۆن هەڵئەبژێردرێ و حیزبێکی نەیار دەسەڵات بە دەستەوە ئەگرێ.. هەروەها.

هەندێ کات، گۆڕانکاری لە (کادر)دا نیشانەیەکە لە ئاشکرا کردنی گۆڕانێکی کۆمەڵایەتی کە دەستپێکردن یان دەرئەنجامی گۆڕانێك ڕائەگەیەنێت، بەڵام هەمیشە وەك پێویست بەم جۆرە نییە. لە ژیانی کۆمەڵایەتی ڕۆژانەدا ئاڵوگۆڕێکی فراوان لە نێوان تاکەکاندا ڕووئەدات کە بەم جۆرەن: ئاڵوگۆڕی سامان و دارایی، دیاری، زانیاری، مافەکان، بەرپرسیارێتییەکان و.. هەروەها کە گەلەك لەم ئاڵوگۆڕانە هەر ئەوانەن کە (پارسۆنز) بە "گۆڕانە هاوسەنگەکان" ناوی بردوون لە ڕێکخراوی کۆمەڵایەتیدا، بەڵام ئەم گۆڕانانە بە پێویست کاریگەری لەسەر بونیادی ڕێکخراوی کۆمەڵایەتی دانانێن، لەگەڵ ئەوەدا بە پێچەوانەوە کاریگەری ژمارەیەکی زۆر لەم ئاڵوگۆڕانە بەشێکن لە ئەرکەکان و کارکردی ئاسایی ڕێکخراوی کۆمەڵایەتی. بە دەربڕینێکی دیکە ئەم گۆڕانانە لە بنەڕەتدا گۆڕانێك نین کە بتوانن لە بونیادی ڕێکخراوی کۆمەڵایەتیدا گۆڕان دروست بکەن. بە بڕوای (پارسۆنز) ئەم گۆڕانانە تەنها ڕۆڵیان لە نوێکردنەوەی بێپسانەوەی هاوسەنگی سیستمی بەدیهاتوودا هەیە و، هەر لەو ڕووەوە (پارسۆنز) ناویان بە (گۆڕانی هاوسەنگەکان) ئەبات کە جیاوازییەکی زۆری لە تەك (گۆڕانی بونیادەکان)دا هەیە.

لە کۆتاییدا، ئەبێ ئەوەش زیاد بکەین کە ناکرێ ئەو گۆڕانەی کە یەك یان چەند کەسێك ئەکەونە ژێر کاریگەرییەوە وەك گۆڕانێکی کۆمەڵایەتی لە قەڵەم بدەین. بە واتایەکی دیکە ناکرێ گۆڕانی ئایدیا یان ڕەفتاری بەشێك لە تاکەکانی کۆمەڵگا وەك گۆڕانێکی کۆمەڵایەتی پەسەند بکرێ، مەگەر ئەوەی لە ئاستێکی گەلەك بەرفراواندا ئەم گۆڕانی ئایدیایە یان شێوەی ڕووبەڕووبوونەوە و تێڕوانینە پێکبێت.

### ئەو دیاردانەی کە بە گۆڕانی کۆمەڵایەتی لە قەڵەم ئەدرێن:

شیکارییەکانی پێشوومان لەسەر ئەو دیاردانەی کە جێناگرن لە ریزی گۆڕانی کۆمەڵایەتیدا، کۆمەکێکی زۆرمان ئەکەن سەبارەت بە ناسینی گۆڕانە کۆمەڵایەتی و واقعییەکان بەمجۆرە:

یەکەم، بە پێویست گۆڕانی کۆمەڵایەتی دیاردەیەکی بە کۆمەڵە، بە واتایەکی دی، ئەبێ گۆڕانی کۆمەڵایەتی کۆمەڵگایەك یان بەشێکی گرنگی

کۆمەڵگایەك لە خۆ بگرێت. ئەبێ گۆڕانی کۆمەڵایەتی، هەلومەرج، شێوەی ژیان یان بواری فکری و ڕۆحی ئاستی بەرفراوانی کۆمەڵگایەك، واتە لە چەند کەسێك زیاتر بگۆڕی و، ئەمەش بۆ دیاریکردنی گۆڕانێکی کۆمەڵایەتی بە بناغەیەکی گرنگ دائەنرێ.

دووهەم، گۆڕانێکی کۆمەڵایەتی ئەبێ گۆڕانێکی بونیادی بێت، واتە گۆڕانی ڕووبدا لە تەواوی ڕێکخراوی کۆمەڵایەتی یان لە هەندێ لە بەشە پێکهێنەرەکانی ڕێکخراوی کۆمەڵایەتی و، لە ڕاستیدا ئێمە کاتێك ئەتوانین قسە لەسەر گۆڕانی کۆمەڵایەتی بکەین کە بتوانین توخمە بونیادی و کەلتوورییەکانی ڕێکخراوی کۆمەڵایەتی کە ئاڵوگۆڕیان کردووە و گۆڕاون بە شێوەیەکی ئاشکرا سەرلەنوێ بناسین و دیاری بکەین. بۆ نموونە، لەوانەیە مانگرتنێك ببێتە هۆی چاکبوونی دۆخی موچەی کرێکاران و بەرزبوونەوەی ئاستی ژیانیان، بە گوێرەی ئەو پێناسەی کە پێشتر کردمان ئەمە یەك (گۆڕانی هاوسەنگی)یەو ناکرێ گۆڕانێك لە بونیادا تێبینی بکرێت، بەڵام ئەگەر بکرێ هەندێ لەو گۆڕانانەی کە ئەم مانگرتنە ئەیخولقێنێ لە ڕێکخراوی کۆمەڵایەتی کارخانە یان ئەو دامەزراوەی (دەزگا) پێوەی بەندە، بۆنموونە گۆڕان لە دابەشکردنی دەسەڵاتدا، گۆڕان لە تۆڕەکانی پەیوەندی و لەو چەشنانە.. یان تەنانەت ئەگەر بکرێ ئەو کاریگەرییانە لە بەرچاو بگیرێ کە ئەم گۆڕانانە لە تەواوی دامەزراوە وێکچووەکاندا ئەیانبێت، ئەوکاتە ئەتوانین بڵێین کە گۆڕانی کۆمەڵایەتی ڕووی داوە.

سێهەم، گۆڕانی بونیادی لە درێژایی زەماندا ئەناسرێت. بە دەربڕینێکی تر ئەبێ بتوانرێ لە نێوان دوو خاڵدا یان چەند بەشێکی زەمانیدا، کۆمەڵێك لە گۆڕانەکان یان دەرئەنجامەکان ئاشکرا بکرێت (بۆ نموونە لە نێوان زەمانەکانی ت*1*، ت*2*، ت*3*)دا لە ڕاستیدا ئەکرێت گۆڕانی کۆمەڵایەتی تەنها بە بەراورد لەتەك خاڵێکی دەستپێکردن یان سەرچاوەیەك لە ڕابوردوودا تاوتوێ بکرێ و هەڵەسەنگێندرێ و، هەر بە سەرنجدان لەم خاڵی دەستپێکردنەیە کە دەکرێ بڵێین گۆڕانێ بەدیهاتووە و لێکۆڵینەوەش لەسەر بەرفراوانی و چۆنیەتی ئەم گۆڕانە بکرێت.

چوارهەم، بۆ ئەوەی بە ڕاست گۆڕانی کۆمەڵایەتی، گۆڕانێکی بونیادی بێت، ئەبێ هەمیشەیی و پایەداربێ و بە واتایەکی دیکە تەنها ڕووکەش و زوو تێپەڕ نەبێ.

لە کۆتاییدا بە سەرنجدان لەو چوار تایبەتمەندییەی لە سەرەوە قسەمان لەسەر کرد، دەکرێ بەم جۆرە کورتی بکەینەوە کە گۆڕانی کۆمەڵایەتی کاریگەری لەسەر ڕەوتی مێژووی کۆمەڵگایەك دائەنێ، بە واتایەکی دیکە، ئەگەر گۆڕانی کۆمەڵایەتی تایبەت ڕووی نەدایە، کۆمەڵگایەکی دیاریکراو ڕێگایەکی جیاوازی ئەبڕی–ئاشکرایە کە گەلەك سەختە بە کردەوە ئەم لافلێدانە بسەلمێنین، چونکە بەدەستەوەدانی مێژوویەکی گریمانەیی کارێکی لە ڕادەبەدەر دژوار و وردە، لەبەرئەوە دروستکردنی دووبارەی ڕەوتێکی مێژوویی کارێکی ئەستەم نییە، بەڵام بەهەرحاڵ ڕەوشێکە کە دەبێ زانستی کۆمەڵایەتی زیاتر هانای بۆ ببات.

**پێناسەی گۆڕانی کۆمەڵایەتی:**

ئەوەی کە لە سەرەوە گوترا، ئێمە ڕێنمایی ئەکات سەبارەت بە خستنەڕووی پێناسەیەکی تەواو سادە و ئاشکرا لە گۆڕانی کۆمەڵایەتی. بەم جۆرە بە

سەرنجدان لەو پێناسانەی سەرەوە، گۆڕانی کۆمەڵایەتی بریتییە لە گۆڕانێك کە بە درێژایی زەمان شایانی بینینە بە شێوەیەك کە کاتی و کەمخایان نەبێ و، کاریگەری لەسەر بونیاد یان ئەرکی ڕێکخراوە کۆمەڵایەتییەکانی کۆمەڵگایەك دابنێ و ڕەوەندە مێژووییەکەی بگۆڕێت.

### گۆڕانی کۆمەڵایەتی- کرداری مێژوویی- پرۆسەی کۆمەڵایەتی:

ئەو پێناسەیەی کە پێشتر دەربارەی گۆڕانی کۆمەڵایەتی خستمانە ڕوو، دەرفەتی ئەوەمان ئەداتێ کە بتوانین بەو جیاوازییەی نێوان (کرداری کۆمەڵایەتی)[27] و (پرۆسەی کۆمەڵایەتی)[28] قایل بین، چونکە زۆربەی کات ئەم زاراوانە لە کۆمەڵناسیدا لە جێی یەکدی بەکار دەبرێن.

### کرداری مێژوویی:

بەر لە هەموو شتێك، ئەبێ سەرنجی ئەم مەسەلەیە بدەین کە کرداری مێژوویی و گۆڕانی کۆمەڵایەتی بە هەڵە تێنەگەین. پەیوەندی کرداری مێژوویی لە تەك گۆڕانی کۆمەڵایەتیدا هەمان پەیوەندییە کە لە نێوان ڕێکخراوی کۆمەڵایەتی و کرداری کۆمەڵایەتیدا هەیە، کرداری مێژوویی و کرداری کۆمەڵایەتی وەسفی چالاکی بکەرە کۆمەڵایەتییەکان ئەکات و، گۆڕان و ڕێکخراوی کۆمەڵایەتیش ئاشکراکەری کۆنکرێت و هەستپێکراوی ئەم دوانەن.

بەم جۆرە، کرداری کۆمەڵایەتی بریتییە لە تێکڕایی چالاکییەکانی تاکەکانی کۆمەڵگایەك کە فەرمانی جووڵانەوە، توندبوون یان خاوکردنەوە و یان تەنانەت بەرهەڵستی گۆڕانی ڕێکخراوە کۆمەڵایەتییەکانیان لە تەواوی کۆمەڵگا، یان هەندێ لە بەشەکانی کۆمەڵگا لە ئەستۆدایە.

لەگەڵ ئەوەشدا، کەم ڕێدەکەوێ کە تەواوی تاکەکانی کۆمەڵگایەك یان کۆڕێکی دیاریکراو ڕۆڵیان لە کرداری کۆمەڵایەتیدا هەبێت، بەڵکو بە زۆری هەندێ لە تاکەکان، گرووپەکان و یان ئەو تاقمانەن کە چالاکانە لە ساتەوەختێکی دیاریکراودا بە لایەنگری لە کۆمەڵگایەك کاریگەرییان دەرئەکەوێ و ڕۆڵێکی کاریگەر و چالاك لە مێژووی ئەو کۆمەڵگایەدا کایە ئەکەن و لە ڕاستیدا کرداری مێژوویی هەر لە ژێر کاریگەری ئەم هۆکارە چالاك و بکەرانی گۆڕانەدا شکل ئەگرێ و سەرهەڵئەدات.

پێویستە ئاماژە بەو بابەتەش بکرێ کە کردەی بکەرانی گۆڕان یان لە ناوەڕۆکدا یان لە ئاهەنگی گۆڕاندا ئەنجام ئەدرێ، بەم جۆرە کە هەندێك ڕۆڵی مزگێنیدەری ئایدیاکان، تازەگەرییەکان و بەها تازەکان ئەگێڕن و، بە پێچەوانەوە هەندێکی دی ڕۆڵی خۆیان لە گەیاندنی ئایدیاکان و بەها تازەکاندا کایە ئەکەن و بەم جۆرە ئاهەنگی گۆڕان توندتر ئەکەن. بەڵام، هەروەها ڕەنگە ئەم بکەرانە لە دژایەتیکردنی تازەگەری و یان لە دواخستنی ڕەواج و جێبەجێکردنیا ڕۆڵێکی نێگەتیڤیان هەبێت. ئەم سەرپێچی کردنە جدییە لە گۆڕان و یان ململانێ بە مەبەستی گۆڕانکاری لە دۆخی ئامادەی کۆمەڵگایەکدا، بە بەشێك لە کرداری مێژوویی لە قەڵەم ئەدرێ. بە واتایەکی دیکە، کرداری مێژوویی هەر بەو جۆرەی کە ئەتوانێ کاریگەری لەسەر گۆڕان هەبێ، لەبەرگرتنی گۆڕانیشدا کاریگەر ئەبێ، بە شێوەیەکی سادەتر دەکرێ بڵێین کە کرداری مێژوویی هەم ڕۆڵی لە بەدیهاتنی تازەگەریدا هەیە و، هەم ڕەنگە بەری لێبگرێت، بەم پێیە ئەتوانین کرداری

مێژوویی وەك لایەنێكی لە ڕادەبەدەری كۆمەڵناسی گۆڕانی كۆمەڵایەتی لە قەڵەم بدەین. لە ڕاستیدا كرداری مێژوویی لە قاڵبی كرداری كۆمەڵایەتیدا جێی گرتووە و شتێك نییە جگە لە لایەنێكی كرداری كۆمەڵایەتی و، بەڵام سەبارەت بە گۆڕانی كۆمەڵایەتی، ئەبێ بۆ پشتگیریكردنی پێناسەكەی پێشتر ئەوە زیاد بكرێ كە ئەو بریتییە لە گۆڕانێكی بونیادی كە لە كرداری مێژوویی كۆمەڵێك و یان گرووپگەلێك لە دەروونی كۆمەڵگایەكی دیاریكراودا ئەنجام ئەدرێ.

بە شێوەیەكی گشتی كرداری مێژوویی و گۆڕانی كۆمەڵایەتی بە تەواوەتی پێكەوە گرێدراون و، بەڵام دەرفەتی ئەوەش هەیە كە بە ڕەوشێكی شیكاری لە یەك جودا بكرێتەوە و بەم جۆرە بێ لەبەرچاوگرتنی ئەو هۆكارانە كە بوونەتە هۆی گۆڕانی كۆمەڵایەتی، دەكرێ بە شێوەیەكی جیاجیاش لێكۆڵینەوەیان لەسەر بكرێ.

## هۆكارەكانی گۆڕانی كۆمەڵایەتی

### ئەندێشە:

### پرۆسەی كۆمەڵایەتی:

لە كۆتایدا ئەبێ ناوێك لە پرۆسەی كۆمەڵایەتی ببرێ، كە بە زۆری بە هۆی كۆمەڵناسانەوە كەڵكی لێ وەرئەگیرێت، و بە مانای ڕەوتی بەردەوامی ڕستێك لە ڕووداوەكان، دیاردەكان و، ئەو كردارانەیە كە تێكڕا گۆڕانی كۆمەڵایەتی لێ ئەكەوێتەوە. پرۆسەی كۆمەڵایەتی دووپاتكەرەوەی ئەم ڕاستییانەیە كە چۆن ڕووداوەكان لە ماوەی زەماندا ڕووئەدەن، و بە پێی چ ڕێكخستن و چ سیستمێك كەواتە، پرۆسەی كۆمەڵایەتی، پاساو بۆ گۆڕان ناهێنێتەوە و ڕاڤەی ناكات بەڵكو ڕەوت و ڕێگای گۆڕانمان بە درێژایی زەمان بۆ دەرئەخات.

### *هۆكارەكان، هەل و مەرجەكان و كارگوزارانی گۆڕان:

ئەو شیكاری و جیاكردنەوەیەی كە لە سەرەوە سەبارەت بە كردار و گۆڕان و پرۆسەی كۆمەڵایەتی خستمانە ڕوو، دەرفەتی ئەوەمان ئەداتێ بە لێكۆڵینەوەی سێ زاراوەی دیكەوە سەرقاڵ بین كە بە زۆری لە وتووێژی گۆڕانی كۆمەڵایەتیدا ئاخاوتنیان لەسەر ئەكرێ، ئەم سیانە بریتین لە هۆكارەكان، هەلومەرجەكان و كارگوزارانی گۆڕان.

### هۆكارەكانی گۆڕان:

لە ڕاستیدا هۆكاری گۆڕان توخمێكە لە دۆخێكی دیاریكراو كە بە هۆی هەبوونییەوە (ئامادەییەوە) یان بە هۆی كردەوەیەكەوە كە ئەنجامی ئەدات گۆڕانێك ئەخاتەوە یان ئەهێنێتە ئاراوە. بۆ نموونە، هێنانە ناوەوەی تەكنیكگەلێكی تازە بۆ كارخانەیەك كە ئەتوانێ هەندێ گۆڕان لە شێوەی كار، لە ڕێكخستنی گرووپەكان، لە ئاستی بەڕێوەبەرایەتی و هەروەها.. بێنێتە گۆڕێ و بە هەمان پێوەریش دامەزراندنی كارخانەیەك لە ناوچەیەكی گوندنشینا هەندێ گۆڕان لە بازاڕی كار و جوولانەوەی كۆمەڵایەتی دانیشتووان ئەهێنێتە ئاراوە كە لە ئاكامدا گۆڕانكاری لە دابونەریت و ئاكار و كەلتور و لە ڕێكخستنی كۆمەڵایەتی ئەو گوندەدا ئەخاتەوە. هەروەها لە كۆمەڵگای گوندنشینا دەرئەنجامی چاكسازی زەوییەكان گۆڕانێكی ئابووری -كۆمەڵایەتی فراوانی بە دواوەیە. ئەم سێ خاڵەی سەرەوە، واتە تەكنیك و

کارخانە و چاکسازی زەوییەکان، بە هۆکارەکانی گۆڕان لە قەڵەم ئەدرێن.

### هەلومەرجەکانی گۆڕان:

هەلومەرجەکانی گۆڕان لەو توخمە گونجاو یان نەگونجاوانەن کە کاریگەری یان کاریگەرییەکانی یەك یان چەند بکەرێکی گۆڕان چالاکتر یان خاوتر، توندتر یان لاوازتر ئەکەن.

هەر بۆ ئەو نموونەیەی سەرەوە، شێوەی ڕووبەڕووبوونەوەی سەندیکا لە بەرامبەر گۆڕانکاریدا لەبەرچاو ئەگرین.

ئەو تەسەورەی کە سەندیکا لە گۆڕان هەیەتی و گواستنەوەی ئەو تەسەور و ئایدیایە بە کرێکاران لەو هەلومەرجانەن کە ڕەنگە دەرهەق بە گۆڕانکارییەك کە بە هۆی تەکنیکە تازەکانەوە دێتە ئاراوە، شیاو یان نەشیاو بێت و بە هەمان پێوەریش لە ناوچەیەکی گوندنشین یان لەو جۆرەدا، هەریەك لەوانە ئەتوانن هەلومەرجێکی گونجاو یان نەگونجاو بن بۆ ئەو گۆڕانە بەدیهاتووەی لە دامەزراندنی کارخانەیەکی تازەوە سەرچاوەی گرتووە، یان کۆمەڵە کاروکاردانەوەگەلێك کە ئەبنە هۆی پێشکەوتن یان چاکسازی زەوییەکان، هەلومەرجێکی گونجاو یان نەگونجاو ئەهێننە ئاراوە. بە پێی ئەو شتەی کە وتمان، بەم جۆرە ئەنجامگیری دەکەین کە هۆکارەکان و هەلومەرجەکانی گۆڕان تەواوکەری یەکدین. هەلومەرجەکانی گۆڕان توخمگەلێکن لە دۆخێکی تایبەت کە ڕۆڵی هۆکارەکان بە شێوەیەکی گونجاو یان نەگونجاو درووست ئەکەن، بە واتایەکی دی ئەم هەلومەرجانە ئەتوانن لە پراکتیککردنی کاریگەرییەکانی هۆکارەکانی گۆڕاندا، ڕۆڵێکی (نێگەتیڤ) یان (پۆزەتیڤ)یان هەبێت. لە لایەکی دیکەوە هەلومەرجەکان ئەتوانن کاریگەریان لە ئاهەنگی گۆڕاندا هەبێت و بەم جۆرە لە خێرایی یان خاوی کردەی هۆکارەکاندا کاریگەر بن. هەروەها هەلومەرجەکان ئەتوانن کاریگەری لەسەر لایەنگری گۆڕانیش دابنێن و بەملاولادا ببیەن، بەم جۆرە کە مومکینە بە هۆی هەندێ لە هەلومەرجە تایبەتییەکانی ئایدیایەك یان تەکنیکێکی تازەوە لە حاڵەتی بڵاوبوونەوە یان پایەداربوونیا بگۆڕدرێ و، گۆڕانکارییەکی بەرچاو نەهێنێتە ئاراوە.

لە کۆتاییدا، دەکرێ هەلومەرجەکان کاریگەریی لەسەر بەرفراوانی و پانتایی گۆڕان دابنێن. بۆ نموونە گۆڕان هەلومەرجێکی گونجاو و لە بەشێك یان لە ناوچەیەکی تایبەتی کۆمەڵگادا نایەتە ئاراوەو و، بەم جۆرە ناتوانێ ڕەخنەی تێبکات و یان ئەوەی گەلەك درەنگ بە حەقیقەتەوە پەیوەست ئەبێت.

### کارگوزارانی گۆڕان:

هەر بەو جۆرەی کە پێشتر دیمان، کارگوزارانی گۆڕان بریتین لە تاکەکان، گرووپەکان و ئەنجوومەن گەلێك کە گۆڕان ئەهێننە ناوەوە، پێشوازی لێ ئەکەن یان سەرپێچی لێ دەکەن.

کەواتە ئەم کارگوزارانە ئەو تاك و گرووپانەن کە لە هەندێ ڕووەوە کرداری کۆمەڵایەتی یان شێوە و خەسڵەتی کردارێکی مێژوویی لەخۆ دەگرێت. واتە تاکەکان یان ئەو گرووپانەی کە کردارەکانیان سەرچاوە لە ئامانجەکان، خواستەکان، بەهاکان و ئایدیۆلۆژیاکانەوە ئەگرێ کە کاریگەریی لەسەر ئایندەی کۆمەڵگا دائەنێن.

### پێشگۆیی و پێشبینی:

لە کۆتاییدا مەسەلەیەکی دی لە ڕاڤەکردنی گۆڕانی کۆمەڵایەتی و کرداری مێژوویی ئەخرێتە

ڕوو، ئـەویش ئەوەیــە كــە داخــۆ لــە توانــادا هەیــە جیاوازی لـە نێوان پێشـگۆیی و پێشـبینیدا بكـرێ؟ ئاشكرایە كە ئەم جیاوازییـە گەلـەك ئەستەمە، بـەڵام دیـاریكردنی ڕادە و سـنووری هـەر یـەك لەوانــەش گرنگە. لە ڕاستیدا بە سەرنجدان لەو لاوازییە زۆرەی كۆمەڵناسی كە لە سەرەتای ئەم بەشەدا سەبارەت بە پێشبینی ئاماژەی پێكرا، تێكەڵكردنی پێشگۆیی و پێشـبینی لــە كۆمەڵناســی هێنــدە ئاســان نییــە و نـاتوانرێ پێشـگۆیی لـە ژێـر پۆششـی پێشـبینیدا ئەنجام بدرێ.

### پێشگۆیی لای یەكەمین كۆمەڵناسان:

لـە ڕاسـتیدا زۆربـەی تیۆرسـینە ناسـراوەكانی وەرگۆڕان و گۆڕانی كۆمەڵایەتی ڕوویان لە پێشگۆیی كـردووە. تــا ڕادەیــەك تــەواوی ئەمانــە مــژدەی ئایندەیــەكی باشـتریان بـە هاوچەرخـەكانیان داوە، كۆمەڵگایـەكی مرۆیـی تـر، هاوئاهـەنگ تـر، ئـازادتر، ئاشتی ئـامێزتر و هـەروەها.. هـەروەك دەرئەكـەوێت، كۆمەڵناسـی بـەرایی بـە خۆشـبینییەوە داهاتوویـان پێشــگۆیی كــردووە ئەمـــەش پاســاودەری ئــەو حەقیقەتەیـە كـە تیۆرەكـانی وەرگـۆڕان لـە مێـژوودا هەریەكــە و بــە چەشــنێك بڕوایــان بــە جــۆرێ پێشكەوتنی مرۆڤایـەتی و چاكبوونی ژیـانی تـاك و كۆمـەڵی مرۆیــی هــەبووە، بـۆ نموونـە (ئاوگۆسـت كۆنت) دەورەی (سەلماندن)ی بە قۆناغێكی باڵاتری تێفكرین و ڕێكخستنی كۆمەڵایەتی لە قەڵەم ئەدا.

(سپنسـەر) لـە وەرگۆڕانـی كۆمەڵایـەتیدا ئاقاری بـەرزەرۆیی بـەرەو كۆمـەڵگای پیشەسـازی، لەسـەر بنـەمای لیـبرالیزم و تـاكخوازی ئاراسـتە ئـەكرد. (مـاركس) و ئـەنگلز بـە قـازانجی كۆمـەڵگای بێچـین قسەیان لەسەر هەڵوەشانەوەی حەتمی سەرمایەداری ئەكرد. لە لایەكی ترەوە، ئەندێشمەندانی دیكەی كە لە مێژوودا لە جیاتی ئاراستەكردنی وەرگۆڕانی تاك هێڵــی، بڕوایــان بــە جووڵانــەوەی بازنــەیی یــان (ســـيكليك)[29] هـــەبوو، لـــە تیۆرەكانیـــاندا خۆشـبینییەكی كـەمتر بـەدی ئـەكرا. لـەم ڕووەوە دەكرێ نموونە لەسەر (سوركين) بهێنینـەوە كە سێ قۆنــاغی لــە ژیــاری (بــاش، خــراپ و قۆنــاغی گواسـتنەوە) دیـاری كـردووە كـە بــە شـێوەیەكی بازنـەیی هەمیشــەیی هەریەكـە جێگـەی ئـەوی دی ئەگرێتەوە و، لە بەرامبـەردا (سوالدشبنگەر) هەندێ دیدگای بەدبینانە لە وەرگۆڕانی كۆمەڵایەتی ئەخاتە ڕوو. (ئەو) مێـژووی ژیارەكـان وەكـو ژیـانی مرۆیـی ڕاڤە ئەكات و چوار قۆناغی لەدایكبوون، باڵغ بوون، هەڵوەشانەوە، و مەرگ لە ژیارەكاندا دیاری ئەكات. هــەر بــە پێـی ئــەم بنەمایــە (ئــەو بــە ڕاڤــەكردنی هەڵوەشـــانەوەی هەنووكـــەیی ژیــاری خۆرئــاواوە سـەرقاڵەو، هـەواڵی كۆتـایی ئیحتیمـاڵی ئـەو ژیـارە ڕائەگەیەنێت[30].

### پێنج تایبەتمەندی جیاواز:

ئەو پرسیارەی لێرەدا ئەخرێتە ڕوو ئەوەیە كە، چــۆن ئــەكرێ پێشــگۆیی و پێشــبینی لەیــەكدی جیابكرێتـەوە. بـە ڕای ئێمـە دەكـرێ بـۆ پێشـگۆیی پێنـج تایبەتمـەندی بنـەڕەتی بژمـێرین كـە ئـەو لـە پێشــبینی جیائەكاتــەوە. یەكــەم، ئــەوەی هـــەر پێشــگۆییەك وەك خـــاڵێكی ســـەرەتا دیدگایـــەكی ڕەخنەگرانـــەی بەرامبـــەر كۆمـــەڵگای ئێســـتاو پێشــینەكان هەیــە. تــەمومژەكان، ناكۆكییـــەكان، نادادپەروەرییـــەكان، نابەرابـــەرە كۆمەڵایەتییـــەكان، وتووێژ و داوەریان لەسەر ئەكرێ و ئاشكرا ئەكرێن. بـەم جـۆرە بـە ڕەخنـەگرتن لـە كۆمـەڵگای ئێسـتا و ڕابوردووە كە كۆمەڵگایـەكی نوێ پێشنیار ئـەكرێ و ئەناسرێت.

لەگەڵ ئەوەشدا (هێربرت ماركۆز)ە کە ڕەخنەکەی لە ژێر ناوی "کۆمەڵگای پیشەسازی پێشکەوتو"دا ئەناسین، دان ئەنێ بەو ڕاستییەدا کە "تیۆری ڕەخنەگرانە لە کۆمەڵگا خاوەن ئەو چەمکانە نییە کە دەرفەتی تێپەڕین لە مەودای نێوان ئێستا و ئاینده دەستەبەر بکات و هەروەها بەڵێنگەلێك بدات و سەرکەوتو بێت و لە هەمان کاتدا بە نێگەتیڤی بمێنێتەوە" بەڵام، دیارە لە بیرمان نەچێ کە تەواوی ئەو تیۆرسینانەی ڕەخنەیان لە کۆمەڵگا گرتووە، هێندەی (مارکۆزە) بە پارێز نەبوون، چونکە لەو سنوورە زیاتر تێپەڕین کە ڕەخنە لە پێشگۆیی جیائەکاتەوە.

دووهەم، ئەو شتەی دەرفەتی پەڕینەوە لەو مەودایە ئەدات ئەوەیە، کە گرنگترین سەرچاوەی ئیلهامی پێشگۆیی لە شتێکدا شاراوە بێت کە بکرێ ئەوە بە "سیستمێکی تێفکرین لە جۆری میتازانستی"[31] ناودێر بکەین.

پێشگۆیی لە ڕەوشێکی تایبەتەوە سەرچاوەی گرتووە کە ئیلهامی لە یاساگەلی توێژینەوە زانستییەکانەوە نەبووە، بەڵکو بە پێچەوانەوە لە تێفکرینێکەوە سەرچاوەی گرتووە کە بنچینەکەی لە ئایدیاکان و بەهاکان و باوەڕەکاندا بەدەست دێ. کەواتە، تێفکرین و (غەیب گۆیی) پەیامبەران لە وەحی ئیلاهییەوە هەڵقوڵاوە کە سەبارەت بە پەیامبەرانی وەك (موسا) و (موحەمەد د.خ) ڕاستی لەخۆدەگرێت. بەڵام پێشگۆیی تازە، چیدی سەرچاوەی مەزهەبی نییە و سەرچاوەی لە تێفکرینی فەلسەفی و ئاکارییەوە گرتووە و، پەیوەندی بە جەوهەری بنەڕەتی چارەنووسی مرۆڤ و کۆمەڵگاوە هەیە، بەڵام پێشبینی زانستی بە نۆبەی خۆی نە ڕەخنەو نە ئیلهامێکە لە بەهاکان. ئەم جۆرە پێشبینییە لە بینین سەرچاوەی لە ڕابوردو و ئێستا وەرگرتووە و، هەوڵی دیاریکردنی ڕێگا مومکینەکانی داهاتوو لەسەر بنەمای هۆکارە جۆراوجۆرەکان، هەلومەرجەکان و بکەرە جیاوازەکان ئەدات، کە کەم تا زۆر کاریگەرییەکی گەلەك زۆریان هەیە. بەم جۆرە، ئەکرێ بڵێین کە پێشبینی لە بنەڕەتدا وەستاوە لەسەر ڕاڤەکردنی بایەخ و ڕۆڵی گۆڕانکارییە جیاوازەکان و ئەو دەرئەنجامانەی کە لەوانەوە سەرچاوە ئەگرێت. لەگەڵ ئەوەشدا، ئەبێ سەرنجی ئەو خاڵە بدەین کە بە کردەوە، دیاریکردنی ڕادەی مەودا یان سنووری نێوان تێفکرینی "میتازانستی"[33] و توێژینەوە، لە بنەڕەتدا زانستێکە لە زانستە مرۆییەکان و کارێکی گەلەك ناسك و ورووژێنەر و بە زۆری دژوارە، چونکە دەکرێ بە ئاسانی پێشگۆیی و پێشبینی بەهەڵە لە بەرچاو بگرین. سێهەم، ئەوەی پێشگۆیی تایبەتمەندییەکی (ئیختیار)ی هەیە، واتە پێشگۆیی ئیلهام دەریان دەربڕی مەبەستێکی تایبەتە و لە هەوڵی ئەوەدایە کە کاریگەری لە سەر ڕەوتی مێژوو دابنێت. پەیامبەر بە ئاگادارکردنەوە لە داهاتوو، لە هەوڵی هاندانی ئەو هێزانەدایە کە داهاتوو بە جۆرێ درووست بکەن کە دەبێ ببێت. پێشبینی خۆی لە خۆیدا، بە دووی ئەم جۆرە ئامانجانە ناکەوێ و پەیگیری پێشنیاری ڕێیەك لە جێی ڕێگەیەکی دی ناکات، بەڵکو بە سەرنجدان لەو گۆڕانکارییە جیاوازانەی کە لە ئارادان، هەندێ حاڵەتی مومکین یان شێمانەیی ئەخاتە ڕوو. چوارەم، ئەوەی بە شێوەیەکی گشتی پێشگۆیی لەتەك جۆرێ لە دڵنیاییەدا دیاری ئەکرێت. پەیامبەر بە دڵنیاییەوە چەمکی حەتمی مێژوویی دەرئەبڕی و بە جەختکردنێکی زۆرەوە پێشگۆیی داهاتووی ئەکرد. کەواتە، دەکرێ بە زۆری تێکەڵاوییەك لە (جەبر) و (ئیختیار)ەکان، تا ڕادەیەك لە تەواوی شێوە پێشگۆییەکانی پەیامبەراندا بەرچاو بخەین. لە

كاتیكدا كە بە پیچەوانەوە پیشبینی لە بنەرەتدا ریژەیی خواز و شیمانەخوازە، بە جۆریك كە بە سەرنجدان لە ئامانجی كارەكەی، لەسەر حسیبی شیمانەگەلیك راوەستاوە كە خۆی وابەستەیە بە توخمگەلیكی جۆراوجۆری دۆخی ئیستا و داهاتوو. لە كۆتاییدا، پینجەم، ئەوەی بە شیوەیەكی گشتی پیشگۆیی ئەتوانێ بە سەرنجدان لە چییەتی داهاتوویەك كە هەوالی رائەگەیەنیت، خۆشبینانە یان بەدبینانە بیت و ناتوانین ئەم تایبەتمەندییە لە پیشبینیدا ببینین، چونكە پیشبینی وەك ئەوەی میژوونووسانی داهاتوو ئەیكەن، تەنها بە چەشنیك لەسەر بنەمای هەلسەنگاندنی ئەو هۆكارانەی كە هەن وەسفی داهاتوو ئەكات. لە لایەكی دیكەوە، بە پیچەوانەی پیشگۆیی كە سەبارەت بەو باس لە زاراوەی خۆشبینی یان بەدبینی دیتە گۆرێ، ئەتوانین بلیین كە پیشبینی ئومیدهینەر یان نائومیدهینەرە.

**پرسیارگەلیك كە ئەخریتە روو:**

**"شەش پرسیاری سەرەكی"**

بە سەرنجدان لەو جیاوازییانەی كە خرانە روو ئەو دەرفەتەمان دەستكەوت كە لە چۆنییەتی رووبەرووبوونەوەی كۆمەلناسی هاوچەرخ لەتەك مەسەلەی گۆرانی كۆمەلایەتی تیبگەین.

دەكرێ لەم پەیوەندییەدا مەسەلەكە بەم جۆرە كورت بكەینەوە كە بلیین كۆمەلناسی لە بەرامبەر گۆراندا، شەش پرسیاری سەرەكی بەم شیوەیەی لای خوارەوە ئەخاتەروو:

*1*/پرسیاری یەكەم ئەوەیە كە چ شتیك ئەگۆرێ؟ چونكە مەسەلەكە ئەوەیە كە گۆرانی كتوپری كۆمەلگایەك لە تەواوی رەهەندەكانیا مەسەلەیەكی ئاوارتەییە. كەواتە گرنگ لەم مەسەلەیە ئەوەیە كە ئەو بەشانە دەربخەین كە تیایاندا گۆران روو ئەدات و، بۆ نموونە بزانین كە داخۆ ئەم گۆرانە لە توخمە بوونیادییەكاندایە یان لە كەلتووردا و یان لەسەر مەشقەكاندا، بەهاكاندا یان ئایدیۆلۆژییەكاندا؟

*2*/پرسیاری دووهەم، كۆمەلناسی ئەوەیە كە چۆن گۆران رووئەدات؟ چ ریگایەك ئەبرێ؟ ئایا بە شیوەیەكی ریكوپیك بەردەوام ئەبێ؟ یان بە شیوەیەكی ناریكوپیك، یەك لە دوای یەك و هەمیشەیی؟ ئایا گۆران رووبەرووی بەرگرییەكی سەخت ئەبیتەوە؟ و ئەگەر رووبەرووی بەرگری بووەوە، ئەم بەرگرییە لە كوی رووئەدات و بە چ شیوەیەك دەرئەكەویت؟

*3*/سیهەم، ئەوەی دەبێ ئاهەنگی گۆران لە بەرچاو بگرین، داخۆ ئەوەی كە رووئەدات وەرگۆرانیكی ئارام و پلە بە پلە، یان گۆرانكارییەكی ناهەموار و گۆرانیكی خیرایە؟

*4*/پاش ئەوەی كە چۆنیەتی گۆران ئاشكرا بوو، دەكرێ بە دوای ئەوەدا دەست بە راڤەكردنی بكەین، و لیرەدا بە راڤەكردنی هۆكارەكانی گۆران و هەروەها بە هەلومەرجە گونجاو و نەگونجاوەكانییەوە خەریك ئەبین.

*5*/لە قۆناغی پینجەمدا، ئەو كارگوزارە چالاكانەی كە گۆرانیان هینا و برەویان پیدا، بە هاندەران و جوولینەرانی هۆشیار و هەروەها مزگینیدەرانی سەرپیچیكردن و، یان خۆراگر لە بەرامبەر گۆراندا دەرئەكەون.

*6*/لە كۆتاییدا تەواوی ئەم شیكارییە، ئەم پرسیارە بۆ كۆمەلناسی ئەخاتە روو كە داخۆ دەكرێ رەوەندی داهاتووی رووداوەكان و پیشهاتەكان و ریگا جۆراوجۆرەكان پیشبینی بكرێ كە كۆمەلگا ئەتوانێ لە داهاتوویەكی دوور یان نزیكدا هەلی بژیریت؟

### ئـــەو شـــتانەی لـــە بەشـــەکانی داهـــاتوودا قسەی لەسەر ئەکرێ:

بە سەرنجدان لە گرنگی ئەم باسانە و، هەروەها بـــە ســـەرنجدان لـــە کارگـــەلێکی بـــەنرخ و ئـــەو توێژینەوانـــەی کـــە لـــەم بـــوارەدا ئـــەنجام دراوە، دەســـتکردن بـــە لێکۆڵینـــەوە دەربـــارەی گـــۆڕان بـــە شـــێوەیەکی جیـــا لـــە وەرگۆڕانـــی تیۆرەکـــان لـــە کۆمەڵناسیدا، کارێکی گەلەك ئەستەمە. بەم جۆرە، بە شـــێوەیەك بـــە دوای وەرگۆڕانـــی تێفکرینـــی کۆمەڵناسیدا ئەڕۆین کە لە هەمان کاتدا لە هەمان ڕێڕەودا بە خستنەڕووی پرسیارگەلێکەوە سەرقاڵ بین کە لە دەروونیا، ئەم مەسەلانە دەرکەوتن. لە بەشەکانی داهاتوودا بە ڕاڤەکردنی ڕۆڵی هەندێ لە هۆکارەکـان و بەشـێك لـە هەلومەرجـەکانی گـۆڕان سەرقاڵ ئەبین. لە بەشی دواتردا لە ڕۆڵی مزگێنیدەرە سەرەکییەکانی گۆڕان ئەکۆڵینەوە و پاشان لە دوو بەشـەکەی دوای ئـەودا بـە لێکۆڵینـەوەی قـووڵ و دیـاریکردنی کـردار، هۆکارەکـان و کـارگوزاران سەبارەت بە دۆخێکی تایبەت، واتە (پەرەسەندن) خەریك ئەبین، واتە پرۆسەیەك کە هانمان ئەدات بە وەسفکردنی وردی ئەو شتەی کە دەگۆڕێت و چۆن و بە چ ئاهەنگێ گۆڕان ڕووئەدات. لە کۆتاییدا، لە بەشی شەشەمدا بە ڕاڤەکردنی پرۆسەیەك لە گۆڕانی کۆمەڵایەتی، واتە پرۆسەی شۆڕشگێڕی کۆتایی بە باسەکەمان ئەهێنین.

**سەرچاوە**

تغییرات اجتماعی- گی روشه

# لە "گریمانەی سەرکوت"ەوە تا "بایۆ- دەسەلات"

**هیو برت دریفوس/ پل رابینو**

**لە فارسییەوە: ئیدریس شێخ شەرەفی**

فۆکۆ لە وانەکان و، دیمانە و کتێبەکانی دەیەی *1970*ی خۆیدا، جارێکی تر خۆی بە شیکردنەوەی کردارە کۆمەلایەتییەکانەوە خەریك کرد. لە دیسپلین و سزا (*1975*) و مێژووی جنسییەت (*1977*)دا بەشە سەرەکییەکانی تەعبیر و ڕاڤەی گشتگیری خۆی لە هەمبەر مۆدێرنیتە دەدا بە دەستەوە. لەم بەشەی (کتێبەکە)دا کورتەیەکی سەرپێی لە تیۆری گشتی فۆکۆ بەپێی هێڵە گشتییەکانی بەڵگەخوازی خۆمان دەخەینەڕوو. دەبێت جەخت لەسەر ئەوە بکەینەوە کە فۆکۆ هیچ کاتێك بیروبۆچوونەکانی بەم شێوەیە نەخستۆتە ڕوو، هەزری فۆکۆ تاکو ئێستاش لە حالەتی گۆڕان و تەعدیلدایە. هەندێ لە پانتایی نادیار و گشتی بێژی لە بەرهەمی فۆکۆدا هەیە پێویستە وەکو پەرێشانی و پشێوی فیکری لەقەڵەمیان بدەین و یان ئەگەر بمانەوێ بە هاودەردییەکی زیاترەوە باسی بکەین وەکو ئەو پانتاییانە حسێبیان بۆ بکەین کە ئەو بۆ تاوتوێکردنی زیاتر لە ئایندەدا و لە بەرهەمەکانی دواتری خۆی یان خەڵکانی تردا، هێنابوونیە بەرباس.

پێکەوە نەگونجانی ئەو لایەنە وردە مێژووییانەی کە فۆکۆ جەختیان لەسەر دەکات لەگەڵ مێژوونووسی باویشدا گرفت خوڵقێن و مشتومڕ وروژێن بووە[1]. لەبەرئەوەی ئێمە لە مەوقعیەتێکدا نین کە بتوانین لایەنە وردە مێژووییەکانی تیۆری فۆکۆ هەڵبسەنگێنن، هەر بۆیە تەنیا هەوڵ دەدەین بابەتە مێژووییەکانی بەرهەمەکانی تا ئەو شوێنەی پێویستە بە ڕوونی دەربڕین. لە ئەنجامدا، قەبارەیەکی مەزنی ئەو بابەتە بچووك و پڕ وردەکاریانەی کە فۆکۆ وەکو

جینالۆژیســـت لـــە ڕێگـــەی ئەوانـــەوە خەســـڵەتە تایبەتییەکان، جۆراوجۆری خۆجێیی و پێکهاتـە (ی کرداره کۆمەڵایەتییە)کان ڕوون دەکاتـەوە، پشتگوێ دەخرێن، هـەروەها لێرەدا، شـێوازی ئـاڵۆز و پـڕ لـە گرێوگۆڵی توێژینەوەکانی فۆکۆ لە پانتایی مێژوودا، وەبەرچاو ناگیرێن.. ئامانجی ئێمە یەکالاکردنی ئەو بابەتانە نییە کە پەیوەندییان بە فاکتەکانەوە هەیە، بـەڵکو دەمانـەوێت جـۆری تـێڕوانینی فۆکـۆ ڕوون بکەینەوە. ئەگەر تێگەیشتنێکی باشتر لەم ڕووانگانە بەدەست بێت، ئـەوا لـەم حاڵـەتەدا ئـەو باسانەی کـە تایبەتن بە شێوازی کاری تایبـەتی فۆکۆ لـە پانتـایی خستنەڕووی ڕووداوە مێژووییـەکان، لەوانەیـە لانـی کـەم لـە چوارچێوەیـەکدا شـوێنی ببێتـەوە کـە سنوورەکانی بۆ ئـەو کەسـانەی ئـەم جـۆرە بابەتانـە دێننە بەرباس لە هەموو لایەکەوە ڕوونتر بێت.

بێگومان دەبێ فۆکۆ شـیکردنەوەیەکی ڕوونـتر سەبارەت بە شێوەی کاری خۆی لە گـەلێك پانتاییدا بخاتـەڕوو. هێمـا و ئامـاژە و پێـوەری پێویسـت بـۆ سەلماندن، ڕەمز و ڕاڤەو شیکردنەوە تەعبیرییەکانی یان بیروبۆچوونی لەمەڕ مێـژووی ئێستا، بە ڕواڵـەت لە بەرهەمەکانیدا دەست دەکەون بەڵام دەبێ سۆسـە (حـدس)یـان بکـەین. مەبەسـت ئـەوە نییـە فۆکـۆ قەرزێکی لەسەر ملە و دەبـێ تیۆرێـك سـەبارەت بـە مێژوویـان کورتە کتێبێك لەمەڕ میتۆدۆلۆژی بخاتـە بەردەســـتی ئێمـــە، بـــەڵام وردە وردە کـــە بیروبۆچوونەکانی پەیڕەوکارانی زیـاتر پـەیدا دەکات و هــەندێ پاڵنــەر بـۆ توێژینــەوە دروســت دەکـا، پێویستە ئەم بابەتانە بە ڕوونی بخەینـە ژێـر باس و لێدوانـەوە، ئـەگینا لـە هـەناوی میتـۆدە مێژووییـە ئەزموونگەرایانـەکاندا شـی دەبێتـەوە و دەتوێتـەوە. (بێگومان فۆکۆ ناتوانێت پێشی ئەم جۆرە ئینتما و ئاراستەیە بگرێت بـەڵام لە هـەمان کاتیشدا نایـەوێ پشتیوانی لـەم چەشـنە ئـاڵوگۆڕەش بکـات. کەواتـە بێدەنگییەکـەی لـەم بارەیـەوە هیـچ یارمەتییـەك بـە ئامانجەکانی ناکات. ئەو شتەی لەوانەیە لە پانتایی ڕۆشنبیری پاریسـدا تـاکتیکێکی کاریگـەر بێـت، لـە زانکۆکانی ئەمریکادا ئەرکێکی جیاواز وەردەگرێت).

دوو چـــەمکی لێـــك بەســـتراو، ڕێکخـــەری بەرهەمـــەکانی دەیـــەی *1970*ی فۆکـۆن: یـــەکێکیان چـەمکی گریمانـەی سـەرکوتە و ئـەویتریان چـەمکی بایۆ -دەسەڵات و تەکنیکە (یان بایۆ- دەسەڵات /ئەو دەسـەڵاتەی بەسـەر ژیـاندا دەڕوانێـت/). فۆکـۆ لـە مێژووی جنسیەتدا دژی گریمانەی سەرکوت بەڵگەی هێناوەتـەوە؛ بـەپێی ئـەم گریمانەیـە حەقیقـەت لـە خودی خۆیدا دژی دەسەڵاتە و هەر بۆیە بمانـەوێ و نەمانەوێ ڕۆڵێکی ڕزگاریکەر دەگێڕێ. ئەم ڕوانگەیە بـە شـێوەیەکی ڕاسـتەوخۆ نەخراوەتـە پـاڵ هیـچ بیرمەند یان قوتابخانەیەکی حزبییەوە، بەڵکو وەکـو هەڵسەنگاندنێکی نیچەیی توانج ئامێز لە بیروباوەڕی بـاو یـان لانـی کـەم لـە بیروبـاوەڕی کـۆڕ و کۆمـەڵی چەپگەرای فەرەنسا دەخرێتەڕوو. (نەك هـەر لـە ڕاڤـە مێژووییـــەکاندا بـەڵکو لـە بانگەشـــە تیۆرییـــەکانی فۆکۆشدا جۆرە ئینتیمایەکی نیشتمانی و دیاریکراو بەرچاودەکـەوێت. ئەگـەرچی هـەندێ نموونـەی لـە وڵاتـــانی تـــری وەکـــو بـــەریتانیا و ئـــەمریکاش هێناوەتـــەوە، بـــەڵام بەشـــی ســـەرەکی بابەتـــە مێژووییـەکان، چوارچێـوەی بـاس و ئـەو نەیارانـەی فۆکۆ لە هزری خۆیدا ململانێیان لەگەڵدا دەکات، هەر هەموویان پەیوەندییان بە فەرەنساوە هەیە). بەڵام لە هـەمان کاتدا دەبێ ئـەوەمان لـەیاد بێـت کـە مێـژووی جنسـیـەت پوختـــەی پرۆژەیـــەکی (گەلاڵەیـــەکی) بەرفراوانترە کە جێبەجێکردنی تەواوی ئەم پرۆژەیـە پێویستی بە چەندین ساڵ هەیە. کەواتـە پێویسـتە تێڕوانینی گشتی فۆکۆ وەکو زێدەڕەوییـەکی تیـۆری

سەیر بکەین کە ئامانجەکەی، دیاریکردنی دووربینییەکی گشتی لە پانتایی باسەکە، ئەگەر هەندێ باسی بنەڕەتی و پێداچوونەوە بە بیروباوەڕ و بوارە باوەکانە.

فۆکۆ لە بەرانبەر گریمانەی سەرکوتدا، تەعبیرێکی زۆر جیاواز بۆ پەیوەندی نێوان جنسیەت، حەقیقەت، دەسەڵات، جەستە و تاك دەخاتەڕوو. ئەو دەرەنجامی ئەم فاکتەرانە بە بایۆ- دەسەڵات و تەکنیك یان بایۆ -دەسەڵات ناوزەد دەکات. لێرەدا دانانی گریمانەی سەرکوت و بایۆ - دەسەڵات لە تەنیشت یەکتریدا، شێوازێکی گونجاوە بۆ هێنانەبەرباسی، بابەتە سەرەکییەکانی بەرهەمی فۆکۆ. ژیل دۆلۆز (*Giles Deleuze*) بە زمانێکی ڕەمزاوی وتوویەتی دەبێ فۆکۆ نەك وەکو مێژوونووس بەڵکو وەکو نەخشەکێشێکی نوێ سەیربکەین، بەڵام ئەو نەخشانەی فۆکۆ دەیانکێشێت بۆ کێشانی وێنەی سەرزەوییەك نییە.

## گریمانەی سەرکوت:

بە گشتی بەپێی گریمانەی سەرکوت، مێژووی ئەوروپا شایەدی تێپەڕین بووە لە قۆناغێك لە ئازادی و ڕاشکاوی ڕێژەیی سەبارەت بە جەستە و وتەی مرۆڤ بەرەو قۆناغێکی تر لە سەرکوت و دووڕوویی ڕۆژ لەگەڵ ڕۆژ زیاتر. لەسەر بنەمای ئەم ڕیوایەتە بە درێژایی سەدەی حەڤدە جۆرێك لە ڕاشکاوی ئاشکرا و زیندوو هێشتا باڵادەست بوو: "ئەم قۆناغە، قۆناغی جوڵە و ئاماژەی ئاشکراو ڕاستەوخۆ، گوتاری خاڵی لە شەرم و گوناهکاری ئاشکرا بوو، قۆناغێك کە تێیدا جەستەکان نمایش دەکران و بە ئازادی لەگەڵ یەکتردا تێکەڵاو دەبوون و منداڵانی ئاگادار /لە کاروباری سێکسی/ لەنێو پێکەنینی بە تەمەنەکاندا دەسووڕانەوە" (مێژووی جنسیەت، ل3). بەڵام تا بەر لە نێوەڕاستی سەدەی نۆزدە بارودۆخەکە بە چەشنێکی بەرچاو ئاڵوگۆڕی بەسەردا هاتبوو و بەرەو خراپی و شڕی ڕۆیشتبوو. ئەم پێکەنینە جێگەخۆی بۆ "شەوە بێدەنگەکانی بۆرژوازی چەرخی ڤیکتۆریا" چۆڵ کرد. جنسیەت و یان ئەوەی لە پاشی بەجێمابوو، ئێستا تایبەت بوو بە سنوور و چوارچێوەی ماڵ و تەنانەت لەوێشدا بۆ ژووری خەوی دایك و باوك بەرتەسك کرایەوە. یاسای بێدەنگی داسەپێنرا و سانسۆر حاکم کرا. ئەو جنسیەتەی کە مابۆوە خاڵی بوو لە کەیف و چێژ و ببوو بە /شتێکی/ قازانجگەرایانە. جنسیەت لە خێزانی ناوەکیدا تەنیا ببوو بە ئامرازی بەرهەمهێنانەوە. هەموو ئەو کردەوە، گوتار و خواستانەی کە لەگەڵ ڕێسای توند، سەرکوتکارانە و ڕیاکارانەدا هەماهەنگ نەبوون، بە تۆبزی وەلانران و سەرکوت کران. لەبەرانبەردا، یاسا، سەرکوت و پووترین چێژ باڵادەست بوو. هەر ئەم لۆژیکە تەنانەت تەشەنەی کردە پەراوێزی کۆمەڵگای چەرخی ڤیکتۆریاش، بەو مانایە کە بەرەڵایی و عەیاشی (ڕابواردن) وردە وردە و بە تۆبزی چاوپۆشی لێکرا. تەنانەت لەم حاڵەتە و بە تایبەتی لەم حاڵەتەدا، مۆڵەتی چالاکی درا بە بازرگانییەکی چاودێری کراو و سودهێن کە وەکو ڕیزپەڕێك (استثناء) ڕێسای /ژیانی خێزانی/ پەسەند دەکرد. نەیارانی چەرخی ڤیکتۆریا تەنیا و بە نۆرەی خۆیان سەرکەوتنی ئەو ئەخلاقیاتە توند و تاقەت پڕوکێنەیان سەرلەنوێ پەسەند دەکردەوە کە لە ڕووخساری عەبووس و بێ بزەی شاژندا خۆی دەنوواند.

سەرنجڕاکێشی (جاذبە) ئەم جۆرە ڕوانگەیە بۆ ئەو کەسانەی بڕوایان پێی هەیە، ئەوەیە کە دەتوانین بە ئاسانی بە سەرهەڵدانی سەرمایەداری

ببەستینەوە. "کورتە مێژووی کورتی جنسیەت و بەلاکانی بەرەو ناو مێژووی پڕ لە ڕەسمیات و فۆرمالیتەی ڕوخسارەکانی بەرهەمهێنان دەگوازێتەوە؛ ڕەهەندە پڕ لە سووکایەتییەکەی لە دید /مان/ ون دەبێت" (پێشوو، ل5). لەم ڕوانگەیەوە، جنسیەت سەرکوت کرا چونکە لەگەڵ ئەخلاقکاری جێگەی مەبەستی سیستەمی سەرمایەداری نەدەگونجا. دەبووایە هەموو هێزەکان لە خزمەتی بەرهەمهێناندا کۆنترۆڵ بکرێن. بەم جۆرە دیالیکتیکی مێژوو، شتە لاوەکی و کەم بایەخەکان لەگەڵ شتە قووڵ و گرنگەکان لە هەناوی تاکە پێکهاتەیەکی گشتیدا لێك دەچنێت. لە دیدگایەکی ئەوتۆوە، جنسیەت تەنیا پاشکۆیەکی داستانی ڕاستەقینەی مێژوو، واتە سەرهەڵدانی سەرمایەدارییە؛ بەو حاڵەش پاشکۆیەکی گرنگە چونکە لە سیستەمی سەرمایەداریدا سەرکوت، شێوازی گشتی دەسەڵاتە.

لەگەڵ هەموو ئەمانەدا لێرەدا دەتوانین بە ئاسانی دژی فۆکۆ هەڵوێستێکی باشتر وەرگرین. ئەگەر لەو ڕستانەی کە لە سەرەوە وەرمانگرتوون لەجیاتی وشەی "بەرهەمهێنان" وشەی "دەسەڵات" دابنێین، وەسفێکی بێ ئینسافانەمان لە هزری فۆکۆ بەدەستەوە نەداوە. ئەگەرچی فۆکۆ لە هەوڵی دۆزینەوەی یاساکانی مێژوو یان نکوڵی کردن لە گرنگی سەرمایەداری نییە، بەڵام خاڵی سەرەکی ئەوەیە، ئەو هەوڵ دەدات ئەو گرنگییەی کە جنسیەت بەم دوایانە لە شارستانییەتی ئێمەدا وەدەستی هێناوە، پیشان بدات و دەری بخات کە ئەم گرنگییە، پەیوەندی بە جنسیەت یان دەسەڵاتەوە هەیە. لەبەرئەوەی فۆکۆ، هەروەك دەیبینین، بڕوای بە بوونی جنسیەتێکی بان مێژوویی و نێوان کولتووری نییە، هەر بۆیە بە هەموو هێزییەوە هەوڵ دەدات دەریبخات کە جنسیەتی ئێمە پەیوەندی لەگەڵ شتێکی تردا هەیە. ئەم "شتەی تر" لانی کەم تا ڕادەیەك، هەمان شێوازە تایبەتییەکانی دەسەڵاتە. ئەو /بابەتە/ کە چۆن ڕوانگەیەك لە هەمبەر دەسەڵاتەوە پێکبێنین کە بەرەو "خودێکی" بنەمایی یان مەفهوومێکی میتافیزیکی و یان دەستەواژەی گشتگیری بۆش و پووچ گۆڕانی بەسەردا نەیەت، گرنگترین پرسە کە بەرهەمەکانی دواتری فۆکۆ لەگەڵیاندا بەرەو ڕوویە.

یەکێکی تر لە سەرنجڕاکێشییە دەروونییەکانی گریمانەی سەرکوت ئەو ئەنجامگیرییەیە کە ڕزگاری سێکسی یان بەرەنگاربوونەوە لە بەرانبەر سەرکوتدا، تێکۆشانێکی گرنگ و بایەخدارە، ئەگەرچی سەرکەوتن تێیدا دژوارە. (تەنانەت هزری فرۆید لەم زەمینەیەدا دەسکەوتێکی کەمی هەبوو، چونکە بە خێرایی لەناو دەزگای زانستی پزیشکی و دەروونپزیشکیدا هەڵلوشراو شێوەیەکی نوێی وەرگرت). بێگومان لە سەدەی نۆزدە بەدواوە، قسەکردن بە شێوەیەکی ڕاشکاو و بوێرانە سەبارەت بە جنسیەت خۆی لە خۆیدا وەکو هێرشێك لە دژی سەرکوت و کردەیەکی لە بنەڕەتدا سیاسی، لە قەڵەم دراوە. ڕزگاری سێکسی و ڕووخانی سەرمایەداری هێشتا وەکو بەشەکانی یەك بەرنامەی سیاسی جسێبیان بۆ دەکرێ. بەپێی ئەم بەڵگەخوازییە کاتێك ئێمە باسی جنسیەت دەکەین، نکوڵی لە دەسەڵاتی سەقامگرتوو دەکەین و ڕەفزی دەکەین. مۆڵەت بە خۆمان دەدەین "تا دژی دەسەڵاتە مەوجودەکان قسە بکەین، ڕاستییەکان دەربڕین و بەڵێنی بەختەوەری و خۆشی بدەین؛ ڕۆشنگەری، ڕزگاری و چێژە جۆراوجۆرەکان لە یەکتر ببەستین؛ /ئەو مۆڵەتە بە خۆمان بدەین تا/ گوتارێك دەربڕین کە حەزی مەعریفە، ورەی گۆڕینی یاساکان و خۆزگەی

بەهەشتێکی زەمینی لەگەڵ یەکتر ئاوێتە دەکات" (پێشوو، ل 7). چ کەسێك دەتوانێت لە بەرانبەر ئەو هەمووانەدا بەرەنگاری بکات؟ گریمانەی سەرکوت رەگی لەناو نەریتێکدایە کە دەسەڵات تەنیا بە بەرتەسککردن، رەفز و زۆرەملێ دەزانێت. دەسەڵات وەکو بەرەنگارییەکی رێکوپێك لە بەرانبەر واقعیەتدا، وەکو ئامرازی سەرکوت و وەکو بەربەستی حەقیقەت، پێشی پێکهاتنی زانین و مەعریفە دەگرێ و یان لانی کەم لەکەداری دەکات و دەیپوشێنێ. دەسەڵات ئەم کارە لە رێگەی سەرکوتی حەزەکان، پێکهێنانی ئاگایی درۆ نییە، پەرەپێدان و بڵاوکردنەوەی نائاگایی و بەکارهێنانی گەلێك فرتوفێڵی دیکە، ئەنجام دەدات. لەبەرئەوەی دەسەڵات لە حەقیقەت دەترسێت، /هەربۆیە/ دەبێ سەرکوتی بکات.

لەم روانگەیەوە وا دێتە بەرچاو، دەسەڵات وەکو سەرکوت، لە لایەن حەقیقەتی گوتارەوە بە باشترین شێوە بەربەرەکانی و دژایەتی لەگەڵدا دەکرێ. کاتێك حەقیقەت دەوترێت، کاتێ کە دەنگی نارەزایی رزگاری بەرزدەبێتەوە، بە رواڵەت دەسەڵاتی سەرکوتکەر بەرەو ململانێ پەلکێش دەکرێت. حەقیقەتیش بۆ خۆی بە تەواوی خاڵی لە دەسەڵات نییە، بەڵام دەسەڵاتەکەی لە خزمەت راشکاوی و راستی و جۆرە چاکەیەکی بەرزدایە، هەرچەندە ئەم چاکە بەرزە شتێکی بنەرەتیتر و حەقیقتر نەبێت لە راشکاوی و ئاشکرایی. سەرەرای ئەوەی لێرەدا فۆکۆ بە توانجەوە دەدوێت بەڵام قسەکانی لە ئامانجەوە دوور نین. رەنگە ئەمرۆ ئاڵۆزترین هزری نەیاری مەوجود لە بەرانبەر بیروبۆچونەکانی فۆکۆدا، هزری یورگن هابرماس بێت کە بەرگری لە جۆرە تێگەیشتنێکی نیمچە ئستعلایی لە عەقڵ دەکات وەکو ئامرازی رەخنەگرتن لەو خواروخێچییانەی کە لە دەسەڵات و بەرەنگارییەوە سەرچاوە دەگرن.

فۆکۆ ئەم روانگەیە بۆ دەسەڵات بە "حقوقی- گوتاری" ناوزەد دەکات (پێشوو، ل *82*). ئەم روانگەیە سەرانسەر نیگەتیڤانەیە، دەسەڵات و حەقیقەت بە تەواوی نسبەت بە یەکتری دەرەکین. دەسەڵات شتێکی زیاتر لە "مەحدوودیەت و کەمایەتی" بەرهەم ناهێنێت. دەسەڵات، یاسا دادەنێت و پاشان گوتاری حقوقی /بابەتەکان/ بەرتەسك و سنووردار دەکات. سزای سەرپێچی، بەردەوام مومکینە. دەسەڵات لە هەموو شوێنێکدا یەکسانە: "و بە پێی هەندێ میکانیزمی سادە و لە رادەبەدەر دووبارە بۆوەی یاسا، حەرام کراوە و سانسۆر کار دەکات" (پێشوو، ل *84*). هێز دەسەڵاتە و کارەکەی تەنیا پێشگرتن و فرمانەکەی تەنیا فەرمانبەرییە. دەسەڵات، دواجار سەرکوتە، سەرکوت دواجار سەپاندنی یاسایە و یاساش دواجار خوازیاری ژێردەستەیی و تەسلیم بوونە.

لەم بارەیەوە فۆکۆ دوو بەڵگەی تر دێنێتەوە کە بۆچی دیدگایەکی ئەوتۆ بۆ دەسەڵات بەو ئاسانیە لەناو گوتاری سەردەمی ئێمەدا قبوڵ کراوە. سەرەتا ئەو لە شتێك وەکو "بەرژەوەندی قسەکەر" دەدوێت (پێشوو، ل *6*). قسەکەر لە پێگەی رۆشنبیرێکی هەموو شت زانەوە کە بۆ مرۆڤایەتی دەئاخڤێت، زۆر بە جدی ئاماژە بۆ ئایندە دەکات کە بە بڕوای ئەو بێگومان لە ئێستا باشتر دەبێت. ئاوازی پێغەمبەرانە و چێژی وادەدراو (موعود) بە باشی لەگەڵ یەکتردا دەگونجێن. بە هیچ جۆرێك، "دەربڕینی راستییەکان و بەڵێنی بەختەوەری و خۆشی" هەڵوێستێکی ناخۆش نییە بۆ قسەلەسەرکردن. رۆشنبیر وەکو قسەکەری ویژدان و ئاگایی، خۆی لە پێگەو هەڵوێستێکی بەم جۆرە نایابدا دەدۆزێتەوە. ئەو لە

دەرەوەی دەسەڵات و لەناو حەقیقەتدا جێگەی گرتووە. ئامۆژگاری و مەوعزەکانی لە هەمبەر زوڵم و ستەم و بەڵێنی سیستەمی نوێ بۆ ئەو چێژبەخش و لای ئەوانی دی پەسەندە. هەڵبەتە دەتوانین هەر ئەم وتەیە وەکو پێگەی نایابی خودی فۆکۆش حسێب بکەین؛ ئەویش بۆ خۆی تا ڕادەیەك لەم تۆمەتە بەری نییە. لەگەڵ هەموو ئەمانەدا فۆکۆ وەکو جینالۆژیستێك بێگومان لافی ئەوە لێنادات کە لە دەرەوەی پانتایی دەسەڵاتدایە و یان بەڵێنی دەستراگەیشتن بە یۆتۆپیاو بەختەوەری دەخاتەڕوو.

بەڵگەی دووەمی فۆکۆ زیاتر جێگەی پەسەندە. ئەو بەڵگەخوازی دەکات کە دەسەڵاتی مۆدێرن تەحەمول دەکرێ بە مەرجێك ڕووخساری خۆی حەشار بدات؛ و ئەم کارەشی بە چەشنێکی کارایانە ئەنجام داوە. ئەگەر حەقیقەت لە دەرەوەی دەسەڵات و دژی بێت ئەوا لەم حاڵەتەدا "بەرژەوەندی قسەکەر" تەنیا وەکو ئیمتیازێکی لاوەکی حسێب دەکرێ. بەڵام ئەگەر حەقیقەت و دەسەڵات نسبەت بە یەکتری دەرەکی نەبن، هەروەك فۆکۆ بە ئاشکرا بڕوای وایە، ئەوا لەم حاڵەتەدا "بەرژەوەندی قسەکەر" و سەرجەم گەمە پەیوەندیدارەکانی تر، دەبنە بەشێکی سەرەکی کاروکردەوەی دەسەڵاتی مۆدێرن. دەسەڵاتی مۆدێرن، خۆی لەگەڵ بەرهەمهێنانی گوتارێکدا کە بە ڕواڵەت دژی دەسەڵاتە بەڵام بە بەشێك لە پراکتیکە بوونی بەرفراوانتری دەسەڵاتی مۆدێرن دەژمێردرێ، پەنهان دەکات. هەروەك فۆکۆ دەڵێت: "دەسەڵات وەکو سنوورێکی پەتی کە بۆ ئازادی دانراوە، لانی کەم لە کۆمەڵگاکانی ئێمەدا، شێوەی گشتی مەقبوول بوونی ئازادییە"( پێشوو، ل *86*).

ڕەگ و ڕیشەی ئەم مەسەلەیە مێژووییە. بە بڕوای فۆکۆ دەسەڵات بەرلەوەی جنسیەت بکاتە ئامانجی سەرەکی خۆی، لە ڕاستیدا لە ڕێگای پێکهێنانی مەحدوودیەت و یاساغی کاری دەکرد. گرنگترین دەزگاکانی دەسەڵات واتە پاشا و دەوڵەت لە هەناوی کۆمەڵێکی مەزن لە هێزە بەرهەڵستکار و خۆجێییەکاندا سەریان هەڵدا. لەگەڵ دەرکەوتنی پاشایەتی ناوەندگەرا لە نێو هەزاران سازش و شەڕی خۆجێیی، دەرفەتی داڕشتنی ڕێسا، حوکمدان و دیاریکردنی سنوور بە شێوەیەکی گشتی سەری هەڵدا. لە هەمان کاتدا پاشایەتی ناوەندگەرا لە هەوڵی تێکشکاندنی نەریت و دابەکانی فیۆدالی بوو و تێکۆشا لە ڕێگای کۆنترۆڵ کردنی تیولدارییە (ڤیساله) پەرشوبڵاوە خۆجێییەکان، نەزم و ڕێکوپێکییەکی چەقبەستووتر بێنێتە ئاراوە. "ئەم جۆرە شێوە مەزنەی دەسەڵات کە لەگەڵ ژمارەیەکی زۆری هێزە شەڕخوازەکاندا بەرەو ڕوو بوو وەکو بنەماو بنەڕەتی مافێك کاری دەکرد کە لە ژوور هەموو بانگەشە جۆراوجۆرەکان بوو و سێ تایبەتمەندی ڕژێمی ناوەندگەراو یەکگرتووی ئاشکرا دەکرد کە /بریتی بوون لە/ بە یەکسان دانانی ئیرادەی خاوەن دەسەڵات لەگەڵ یاسادا، هەنگاونان لە ڕێگای کەناڵی تەحریم کردن و پێکهێنانی یاساغییەت و پیادەکردنی سزا" (پێشوو، ل *87*). بەڵام ئەو دەسەڵاتەی کە پێکهات لە بنەڕەتدا یەکپارچە نەبوو و سەرەڕای ئەوەی چەکی زۆری بەکار دێنا بەڵام زمانەکەی زمانی یاسا بوو. یاسا، یاسا و مەشروعییەتی دەبەخشی بە پاشا هەم بۆ خۆی و هەم بۆ پەیڕەوکارەکانی (ڕەعییەتەکانی). هەڵبەتە واقیعیاتی مێژووی وردی تایبەت بەم جۆرە مەشروعییەت بەخشییە یاساییە بە دەسەڵات، لە ڕادەبەدەر ئاڵۆزن. بە سەرنجدان لە بەرهەمەکانی ژێرژ دوبی (*Georges Duby*) و قوتابییەکانی سەبارەت بە مێژووی ئەم قۆناغە و بە

وەبەرچاوگرتنی گرنگی ئەم باسانە، چاوەڕوان دەکرێت لە ئایندەدا لەم مەیدانەدا توێژینەوەی تێروتەسەل تر ئەنجام بدرێت.

یەکێك لە خاڵە سەرەکییەکانی بەڵگەخوازی فۆکۆ ئەوەیە کە گوتاری یاسا وەکو سیستەمێکی مەشروعیەت بەخش شکلێکی وەرگرت کە تاکو ئێستاش باوە. ئەو ئاماژە بەوە دەکات کە تەنانەت نەیارەکانی ڕژێمێکی سیاسیش بە هەمان گوتار سەبارەت بە یاسا دەدوێن کە خودی ڕژێمەکە قسەی پێدەکات. لە چەرخی کلاسیکدا ڕەخنەگرتن لە سیستەمی پاشایەتی فەڕەنسا لە قاڵبی هێرشکردنە سەر سوودوەرگرتنی خراپی پاشا لە یاسا، دەهاتە بەرباس. دواتر ئەو ڕەخنە بنەماییانەی کە ئاراستەی دەوڵەت دەکران دەریخست کە ڕژێمە بۆرژوازییەکان چۆن چۆنی لە بەرژەوەندی خۆیان دەستکاری یاساکانیان دەکرد. هەروەك دیارە ئەم جۆرە دەستکاری کردنە لەبەرئەوە ناڕەوا بوو کە حکومەت یاسای لەکەدار دەکرد. بەپێی مانا ئەم خاڵە سەبارەت بە خودی فۆکۆش ڕاستە، چونکە ئەویش بە پێی ئەم بەڵگەخوازییە تەحەدای دەزگا و گوتارەکانی دەسەڵاتی مۆدێرنی دەکرد کە ئایدیا یاساییەکان بەردەوام لەگەڵ نەزمی کۆمەڵایەتی هەڵقولاو و لە تەکنەلۆژیای سیاسیدا لە گرژی و دژایەتیدان.

فۆکۆ بە ئاشکرا مەفهوومی گریمانەی سەرکوت وەکو گریمانەیەکی هەڵخەڵەتێنەر (فێڵاوی) وەبەرچاو دەگرێت کە دەبێ یەکالا بکرێتەوە. ئەو ناتوانێت تەنیا بە هۆی پێشنیارکردنی پێچەوانەی بابەتەکە، واتە تەنیا بە هۆی گۆڕانی شێوەی گوتار، لە هێرشی خۆیدا سەرکەوتن بەدەست بێنێت، چونکە مەسەلە ئەوە نییە کە کامە گوتار ڕاستە و یان تەنانەت بە ڕاستی دەسەڵات دەداتە بەر ڕەخنە. سەرەڕای ئەوە فۆکۆ بانگەشەی ئەوە ناکات کە مەفهوومی گریمانەی سەرکوت دوایین پێشکەوتنەکانی توێژینەوەی ئەزموونی وەبەرچاو نەگرتووە و کەواتە دەتوانین لە ڕێگای بەدەستهێنانی زانیاری ڕاست و دروست چاکسازی تێدا پێکبێنین، بەڵکو فۆکۆ ئەو هەڵوێستانەی کە هەر لەو سەردەمەدا بە هۆی پەیڕەو لایەنگرەکانی ئەم هەڵوێستانە، بە جیدی وەردەگیران، بە جیدی وەردەگرێ؛ ئامانجەکەی جینالۆژیای چۆنییەتی تەکوینی گریمانەی سەرکوت و ئەو ڕۆڵانەیە کە ئەم گریمانەیە لە کۆمەڵگای ئێمەدا، دەیانگێڕێت. فۆکۆ بەشە جیاوازەکانی گریمانەی سەرکوت نەك وەکو فرتوفێڵەکان بەڵکو وەکو بەشە سەرەکییەکانی پەیوەندی دوولایەنەی نێوان حەقیقەت و دەسەڵات سەیر دەکات کە بۆ خۆی لە هەوڵی شیکردنەوەیاندایە. بەم جۆرە ڕەهەندی شیکردنەوەیی باسەکە هێشتا لە (مێژووی جنسیەت)دا تەواو نەبووە..

به تەواوی ڕوون نییە فۆکۆ خۆی لە پەیوەندی لەگەڵ ئەو وەسفانەی کە بۆ گریمانەی سەرکوتی دەکات، چ شوێنگەیەکی هەیە. فۆکۆ لەو بابەتە کە ئایا ئەو بۆ خۆی لەو وەسفانەی کە دەیانخاتە ڕوو بەخشراو و بەریە یان نا، بە هێمنی ڕادەکات. بە تەواوی ڕوونە فۆکۆ شیکردنەوەکانی خۆی سەبارەت بە دەسەڵات و حەقیقەت لەبەرئەوە دێنێتە بەرباس کە بە بڕوای ئەو هەندێ گیروگرفت لە پانتایی پەیوەندی نێوان ئەم دووانە لە کۆمەڵگادا بوونی هەیە. فۆکۆ بە چەشنێکی جینالۆژیستیانە، ئەو شێوازەی کە لە ڕێگەیەوە بیرمەندەکانی تر ئەم چەمکانەیان لە یەکتر بەستووە تا پێشانی بدەن ئەم پەیوەندییە بە هیچ جۆرێك ڕەها نییە، وەکو بابەتێك دێنێتە بەرباس. ڕەنگە ئەم وتەیە ئەو گریمانەی لێ

بکەوێتەوە کە فۆکۆ خۆی دەخاتە دەرەوەی پانتایی نفوزی ئەم چەمکانە. بەڵام هەروەك لە درێژەی باسەکەدا بەڵگەمان بۆ هێنایەوە، فۆکۆ وەکو رۆشنبیرێك، ئیتر پێی وانییە کە خۆی لە دەرەوەی ئەو شتەیە کە شی دەکاتەوە.

فۆکۆ دەتوانێت تا رادەیەك لە میتۆدی ئارکیۆلۆژی دووربکەوێتەوە بەڵام ئەم دوورکەوتنەوەیە تەواو و کامڵ نییە. سەرەرای ئەمە میتۆدی جینالۆژی بۆ خۆی دەبێتە هۆی دەرگیری و دەستێوەردان. بەڵام هەوڵدان بۆ سەلماندنی ئەو /راستیە/ کە پەیوەندەکانی نێوان حەقیقەت و دەسەڵات لەبەر هەندێ هۆ، بە هەڵە وەکو پەیوەندێکی پارادۆکساڵ (پردژایەتی) لێك دراونەتەوە، هێشتا لە خۆگری بەکارهێنانی شێوازێکی نوێ و هەموارکراوی عەقڵە لە دژی تەعبیرێکی زۆر ئاڵۆز بۆ دەسەڵات. (کە لە خۆگری توخمێکە لە حەقیقەت وەکو یەکێك لە گرنگترین و بەرجەستەترین توخمەکانی خۆی). لەم پەیوەندییەدا فۆکۆ هێندە لە ئادۆرنۆ یان تەنانەت ڤیبەریش دوورنەکەوتۆتەوە.

لە رووی میتۆدۆلۆژییەوە فۆکۆ کاری خۆی لە تێروانینی ڤیبەر جیادەکاتەوە. بە بروای ئەو نموونەی ئایدیالی ڤیبەر ئامرازێکە کە کۆمەڵێك تێبینی مێژووی جیاواز بە گەرانەوە بۆ رابردوو دەستەبەر دەکات، بۆئەوەی "جەوهەری" بابەتی مێژوویی جێگەی خوێندنەوە (بۆ نموونە کالڤینیزم، سەرمایەداری، ریازەتکاری "رەنجکێشی" دونیەوی) روون بکاتەوە. بەم چەشنە نموونەی ئایدیالی، دیاردە پەرشوبڵاوەکان دەخاتە نێو پارادایمێکی مانادار کە مێژوونووس بە هۆی ئەوەوە، ئەو دیاردانە روون دەکاتەوە کە ئاماژەمان بۆ کردن. فۆکۆ میتۆدی خۆی /بە میتۆدێکی/ جیاواز دەزانێ، بەو مانایە کە ئەو هۆگری دەستنیشانکردنی "بەرنامە ئاشکراکانی" وەکو نەخشە (گەڵاڵە)ی سەرانسەربینی /بێنتهامە/ کە وەکو بەرنامەی زانستی بۆ هەنگاونان و چاکسازی خراونەتە روو. ئەم "بەرنامانە" لە هیچ روویەکەوە پەنهان و حەشاردراو نین و مێژوونووسەکانیش دایان نەهێناون تاکو روونکردنەوە و شیکردنەوە پێشکەش بکەن. لەبەرئەوە هەروەکو فۆکۆ بۆ گروپێك مێژوونووسی فەرەنسی روونی کردەوە، "دیسپلین"، دەربری "نموونەیەکی ئایدیالی: (نموونەی ئایدیالی مرۆڤی ژێر دیسپلین) نییە، بەڵکو بریتییە لە گشتییەت و پەیوەندی ئەو تەکنیکە جۆراوجۆرانەی کە خۆیان کۆمەڵێك دژکردەوەن لە بەرانبەر ئامانجە دیاریکراو و لاوەکییەکانی (وەکو قوتابی قوتابخانە، پێکهێنانی سوپایەك کە توانای چەکهەڵگرتنی هەیە)" (زیندان، ل *49*).

لە هەمان کاتدا ئەم جۆرە بەرنامە راشکاو و ئاشکرایانە هیچ کاتێك راستەوخۆ و بە تەواوی لەنێو دەزگاکاندا وەدی نەهاتن. هۆیەکەی ئەوە نەبوو کە واقعیەت هیچ کاتێك بە شێوەیەکی تەواو پەیرەو لە ئایدیال ناکات بەڵکو بەرنامەی دژ، ناکۆکی خۆجێیی و ستراتیژی تر لە ئارادا بوون کە بە تەواوی بۆ شیکردنەوە و شەکردن (تجزیە) دەشیان، ئەگەرچی سەرەنجام جیاوازیان هەبوو لەگەڵ بەرنامەی بەراییدا. فۆکۆ وەکو جینالۆژیستێك هەوڵ دەدات، تا ئەو شوێنەی دەلوێت لە ئاستی (رووکاری) حاڵەتەکاندا بمێنێتەوە و خۆی لە گەرانەوە بۆ مانای ئایدیالی، نموونەی گشتی و جەوهەری دیاردەکان ببوێرێت. بەهەرحاڵ، ئەگەر چاوپۆشی لە چەند راوبۆچوونێکی ڤیبەر سەبارەت بە میتۆدۆلۆژی بکەین (ئەو چەند دێرەی کە ڤیبەر لەمەر نموونە ئایدیالییەکاندا نووسیویەتی هاوتا نییە لەگەڵ ئەو

گرنگییە بەرفراوانەی کە پێی دراوە) و چاو بە شیکردنەوە مێژووییەکانیدا بخشێنین، دووری نێوان فۆکۆ و ڤیبەر بە جۆرێکی بەرچاو کەم دەبێتەوە.

لە ڕووی بنچینەیشەوە بێگومان ئەو وتەیەی فۆکۆ کە دەڵێت نابێ بە شێوەیەکی میتافیزیکی بەڵکو دەبێ لە ڕووی مێژووییەوە لەگەڵ "پرسی عەقڵ"دا هەڵسوکەوت بکرێت، لە لایەن ڤیبەر و ئادۆرنۆشەوە پەسەند دەکرێت. فۆکۆ بە ڕاشکاوی دەڵێ: "بە بڕوای من دەبێت واتای وشەی "بە عەقڵانی بوون" بۆ مانای ئامرازیی و ڕێژەیی بەرتەسك بکرێ.. و ئەوە ببینین چۆن شێوازەکانی بە عەقڵانی بوون لە هەناوی کردارەکان یان سیستەمگەلی کردارەکاندا بەرجەستە دەبن" (پێشوو، ل *47*). پێشڤەچوونی فۆکۆ بە بەراورد لەگەڵ نیچە، ڤیبەر و ئادۆرنۆ ئەوەیە کە ئەو، ئەم مۆڵەتەی بە جیدی وەرگرتووە و هەندێ شیکردنەوە انصمامی و ئاراستەکراوی مێژوویی تایبەتی بە دەستەوە داوە کە تێیاندا حەقیقەت و دەسەڵات پرسی سەرەکی پێکدێنن. فۆکۆ لە ڕێگەی شیکردنەوەیەکی ناسکتر لە شیکردنەوەی ڤیبەر، میکانیزمەکانی دەسەڵاتی بە عەقڵانی بوونی دەستنیشان کردووە و ناسیویەتەوە. بەڵام نابێت ئەم وتەیە بە واتای ڕەفزی هزری ڤیبەر لێك بدەینەوە بەڵکو دەبێ وەکو پێشکەوتنی ئەم هزرە سەیری بکەین.

دواین خاڵ ئەوەیە کە فۆکۆ هێرش ناکاتە سەر عەقڵ بەڵکو دەریدەخات کە چۆن عەقڵانییەت لە شکڵە مێژووییەکەیدا ئیشی کردووە. هەروەك بۆ خۆی دەڵێت: "ئەگەر ئەم شیکردنەوە، وەکو ڕەخنە لە عەقڵ بە مانای گشتییەکەی سەیر بکرێ، تەسەورێکی ئەوتۆ پێکدێنێت کە عەقڵ تەنیا دەتوانێ خوڵقێنەری چاکە بێت و خراپە (شر) تەنیا دەتوانێ لە ڕەفزی عەقڵەوە سەرچاوە بگرێت. ئەم وتەیە بێمانایە. عەقڵانیەتی شتە ناپەسەندەکان، واقعیەتێکە تایبەتە بە مێژووی هاوچەرخ. بەڵام ئەم بابەتە هیچ چەشنە مافێکی تایبەتی بە ناعەقڵانییەت نابەخشێت" (پێشوو، ل *31*). بەڵگەخوازی ئێمە لە سەرانسەری ئەم کتێبەدا ئەوەیە کە میتۆدی شیکردنەوەی تەعبیرکردنەکانی فۆکۆ ئامرازێکی بەهێز و پێویست بوونە بۆ خۆدوورکردنەوە لە هەندێ گیروگرفت. لەم ناوەدا بە تایبەتی بابەتی بێلایەنی بەهایی کە هزری ڤیبەری زۆر بە توندی بە خۆیەوە خەریك کردبوو و پرسی وەسوەسەی دژایەتی لەگەڵ عەقڵ و ئینتما بۆ نائومێدی (یان پەنابردنە بەر هونەر) کە لەنێو بیرمەندانی قوتابخانەی فرانکفۆرتدا گرنگی پێدەدرا، بۆئەوە دەبن ئاماژەیان پێ بکەن. فۆکۆ بە چەشنێکی زۆر مەعقووڵ هەڵسوکەوت دەکا؛ هەر لەبەرئەوە کار و کردەوەی "حەقیقەت" لە ڕژێمەکانی دەسەڵاتی مۆدێرن دەخاتە چەقی توێژینەوەکانی خۆیەوە.

## بایۆ - دەسەڵات

فۆکۆ بە هۆی دیاریکردنی شوێنگەی مێژوویی بەشەکانی گریمانەی سەرکوت، ئەم گریمانەیە سەرلەنوێ بە شێوازێکی جینالۆژیانە دەخاتەڕوو. ئەم بەشانە لە ڕووی مێژووییەوە بۆ دەوڵەت- شاری یۆنانی، لەشکری ڕۆم، کۆماری ڕۆم، ئیمپراتۆریەتی ڕۆمانی و بنەما ڕۆژهەڵاتییەکانی مەسیحییەت دەگەڕێنەوە. هەرچۆنێ بێت تەنیا لە سەدەی حەڤدەدا بوو کە بایۆ -دەسەڵات /ئەو دەسەڵاتەی بەسەر ژیاندا دەڕوانێت "زیندە- دەسەڵات"/ وەکو تەکنەلۆژیایەکی سیاسی یەکگرتوو (منسجم) دەرکەوت، هەرچەندە تەنانەت لەو سەردەمەشدا واتە لە ماوەی چەرخی کلاسیکدا هێشتا بە کردەوە وەکو تەکنەلۆژیای سیاسی باڵادەست لە قەڵەم نەدەدرا.

بەم حاڵەش ئەمە قۆناغێك بوو كە تێیدا پیادەكردنی سەرپەرشتی كردنی ژیان و گەشەی دانیشتووان و چاوەدێری كردنی بوو بە یەكێك لە هۆگرییە سەرەكییەكانی دەوڵەت و جۆرێكی تازە لە عەقلانیەت و كرداری سیاسی لە شكلێكی یەكگرتوودا سەری هەڵدا. فۆكۆ ناوەرۆكی شێوازی نوێی عەقلانیەتی سیاسی لەگەڵ ئەو شۆڕشەدا بەراورد دەكات كە گالیلۆ لە زانستی سروشتیدا پێكیهێنا. لە زانستی سروشتیدا ئازادسازی شت و دۆخەكان لە چنگی بوونیادەكانی مەعریفەی تەقلیدی، ئاڵوگۆڕێكی تیۆری سەركەوتووانە و زۆر گرنگی بەرهەم هێنا. بەلام لە پانتایی سیاسەتدا، فەیلەسووفەكان هەروا بڕوایان بە تیۆرییە تەقلیدییەكانی سەروەری، مافی سروشتی و پەیمانی كۆمەلایەتی هەبوو و بە جیدیان وەردەگرتن. فۆكۆ بەڵگەخوازی دەكات كە ئەم جۆرە گوتارە، ئەو ئاڵوگۆڕە بنەماییانەی پەنهان دەكرد كە بە كردەوە لە ئاستی كرداره كولتوورییەكاندا لە حاڵی ڕوودانددا بوون. "دەسەلاتی /مۆدێرن/ تەنیا بەو مەرجە تەحەموول دەكرێت كە بەشێكی گرنگی خۆی بە حەشاردراوی بهێڵێتەوە. سەركەوتنەكەی پەیوەندییەكی ڕاستەوخۆی بە توانای پەنهانسازی میكانیزمەكانییەوە هەیە" (مێژووی جنسییەت، ل *86*).

هەر لەوكاتەدا كە تیۆرییە سیاسییەكانی پێشوو بەردەوامیان هەبوو، چەرخی كلاسیك، عەقلانییەتێكی سیاسی و ئامرازێكی نوێی بە دیاری هێنا. لە نێوەڕاستی سەدەی حەڤدەدا، توێژینەوەی ڕێكوپێك و ئەزموونی لە بارودۆخی مێژوویی، جوگرافی و دانیشتووان بووە هۆی سەرهەڵدانی زانستێكی كۆمەلایەتی نوێ. ئەم مەعریفە نوێیە، پەیوەندی لەگەڵ شێوازەكانی بیركردنەوەی ئەخلاقی و كردەیی كۆن و تەنانەت لەگەڵ ئامۆژگارییەكانی ماكیاڤیلی بۆ دەسەلاتدارە سیاسییەكانیش نەبوو. لە بەرانبەردا زانستە كۆمەلایەتییە پسپۆڕییەكان لە داوێنی تێبینی ئیداریدا دروست بوون. ئەم زانستە بە پێچەوانەی زانستە سروشتییەكان زانستێكی جیهانشمول، سەربەخۆ لە زەمینەی كۆمەلایەتی، گشتی و "ئامادەی قاڵببەندی صوری" نەبوو، بەڵكو لە بەرانبەردا بریتی بوون لە شێوازێكی تێگەیشتن كە لایەنە وردەكانی (جزئیات) وەبەرچاو دەگرت. زانستە كۆمەلایەتییە نوێیەكان لە تیۆری سیاسی تەقلیدی حیكمەتی كردەیی و لە تیۆرییەكی گشتی لەمەڕ كۆمەڵگا جیابوونەوە كە هۆبز بە لاساییكردنەوەی زانستە سروشتییەكان، خستبوویە ڕوو. دواتر دەری دەخەین كە ئەم جۆرە هاوبەندییەی نێوان زانستی مرۆڤ و بونیادەكانی دەسەلات چ شوێنەوارێكی بۆ زانستە كۆمەلایەتییە هاوچەرخەكان پێكهێناوە. لێرەدا ئێمە تەنیا خەریكی تاوتوێكردنی ئەو شێوازە دەبین كە بە هۆی ئەوەوە هەندێ لە زانستە كۆمەلایەتییەكان پەیوەندییان لەگەڵ تەكنەلۆژیاكانی بایۆ-دەسەلاتدا پەیدا كرد. "بایۆ-دەسەلات، ژیان و میكانیزمەكانی هێنایە ناو پانتایی محاسبەی ئاشكراوەو مەعریفە/ دەسەلاتی كردە فاكتەری گۆڕانی شێوازی ژیانی مرۆیی.. مرۆڤی مۆدێرن ئاژەڵێكە كە سیاسەتەكەی، بوونەكەی /بوونی مرۆڤ/ دەخاتە ژێر پرسیارەوە" (پێشوو، ل *143*).

بە پێی ڕیوایەتی فۆكۆ بایۆ-دەسەلات لە سەرەتای چەرخی كلاسیك لە دەوری دوو جەمسەر گەلاڵە بوو. ئەم دوو جەمسەرە تا سەرەتای سەدەی نۆزدە لە یەكتر جیابوون بەلام لەو سەدەیەدا ئاوێتەی یەكتری بوون و تەكنەلۆژیای ئەو دەسەلاتەیان دروست كرد كە تاكو ئێستاش

تایبەتمەندی ئاشکرای بارودۆخی هەنووکەیی ئێمە دیاری دەکات.

یەکێك لەم دوو جەمسەرانە، هۆگری بۆ جۆری مرۆڤ بوو. بۆ یەکەمین جار لە مێژوودا، هەندێ چەمکی زانستی وەکو جۆر، دانیشتووان و هتد لەجیاتی چەمکی حقوقی، بە شێوازێکی هەمیشەیی و بەردەوام لە رووی سیاسییەوە وەبەرچاو گیران. بەم جۆرە هەوڵدان بۆ تێگەیشتن لە پرۆسەکانی نوێکردنەوەی ژیانی مرۆڤ، لە نزیکەوە لکا بە ئامانجێکی سیاسی ترەوە. وا بریارە کۆنترۆڵ و رێکوپێك کردنی جموجوڵی ژیان بەم چەشنە، بکەوێتە ناوەندی باسی بەرگی شەشەمی مێژووی جنسیەت.

جەمسەری دووەمی بایۆ– دەسەڵات، نە هێندە وەکو ئامرازی سەرلەنوێ بەرهەم هێناوەی مرۆڤ بەڵکو زیاتر وەکو بابەتی دەستکاری سەیری جەستەی کردووە. زانستێکی نوێ و یان بە جۆرێکی راستتر تەکنەلۆژیای جەستە وەکو بابەتی دەسەڵات، هێدی هێدی لە پانتاییە پەرشوبڵاو پەراوێزییەکاندا پێکهات. فۆکۆ ئەم زانستە نوێیە بە "دەسەڵاتی دیسپلینی" ناوزەد دەکات و بە دوور و درێژی لە کتێبی (دیسپلین و سزا) شی کردۆتەوە. ئامانجی سەرەکی دەسەڵاتی دیسپلینی بەرهەمهێنانی مرۆڤێك بوو کە وەکو "جەستەیەکی رام و لارەمل" سەیر بکرێ. ئەم جەستە رامە دەبووایە لە هەمان کاتدا جەستەیەکی بەرهەمهێنەریش بووایە. تەکنەلۆژیای دیسپلینی لە کارخانەکان، مەعەسکەرەکان، زیندانەکان و نەخۆشخانەکاندا گەشەی سەند و پەرەی پێدرا؛ لە هەر کام لەم دەزگایانەدا، ئامانجی گشتی "زیادکردنی سودمەندی و لارەملی" تاکەکان و دانیشتووان بە شێوەیەکی هاوکات بوو. تەکنیکە پێویستەکان بۆ پیادەکردنی دیسپلین بەسەر جەستەکاندا بە تایبەتی بەسەر چینە کریکار و دەستکورتتردا پیادە کران ئەگەرچی هەر ئەوانی نەدەگرتەوە، چونکە لە زانکۆ و قوتابخانەکانیشدا پیادە کران.

کۆنترۆڵی دیسپلینی و دروستکردنی جەستەی رام و لارەمل بێگومان پەیوەندی لەگەڵ سەرهەلدانی سەرمایەدارییەوە هەیە. ئالوگۆرە ئابوورییەکان کە کەلەکەبوونی سەرمایەی لی کەوتەوە و ئالوگۆرە سیاسییەکان کە کەلەکەبوونی دەسەڵاتی بە دوای خۆیدا هینا بە تەواوی لە یەکتر جیا نین. بۆ نموونە "تەشەنەدان و بڵاوکردنەوەی شیوازە سەربازییەکان بۆ ناو ریکخراوی ئابووری لە ئاستیکی بەربڵاودا نموونەیەك بۆ پارادایم بەخشین بە دابەشکردنی کار کە پاشکۆی پارادیمیك بوو، کە بە هۆی شیوازەکانی دەسەڵاتەوە بەرقەرار کرابوو. بەڵام ئەم شیوازانەی دەسەڵات لە بەشەکانی ئابووریدا پەیدا نەبوون و لە سنووری ئەم پانتاییەشدا نەدەمانەوە" (دیسپلین و سزا، ل *221*).

فۆکۆ ئەم دوو ئالوگۆرە سەرەکییە بە شیوازیکی ناهۆ و هۆبەندی لە پەنا یەکتری دادەنیت، بەڵام بە ئاشکرا ئاماژە بەوە دەکات کە تەکنەلۆژیای سیاسی لە تەعبیری ئەودا بەر لە تەکنەلۆژیای ئابووری سەری هەڵداوە. ئەو بەلگەخوازی دەکات کە تەکنەلۆژیا دیسپلینەکان بنەمای گەشە و بەرفراوانبوون و سەرکەوتنی سەرمایەداریان وەکو بزوتنەوەیەکی ئابووری پیك دینا. بە بێ ئامادەیی تاکی ریکوپیك و بە دیسپلین لەنیو دەزگای بەرهەمهیناندا، نیازە نوییەکانی سەرمایەداری وەدی نەدەهات. لەبەرئەوە سەرمایەداری بەبێ ناوەندیتی، کۆنترۆل و دابەشکردنی عەقلانی دانیشتووان لە ئاستیکی بەریندا نامومکین دەبوو. بەپیی بەلگەخوازی فۆکۆ

ئـەم جـۆرە تەکنیکـە دیسـپلینانە، پشـتیوانیان لـە ئاڵوگۆڕی مـەزنتر و بـەرچاوتر دەکرد لـە ڕێکخـراوی بەرهەمـهێناندا. لانـی کـەم لـە فەرەنسـادا، گەشـەی هێواشـی تەکنـەلۆژیای دیسـپلینی، هـەم لـە ڕووی مێژوویـی و هـەم لـە ڕووی لۆژیکییـەوە، بـەر لـە سـەرهەڵدانی سـەرمایەداری دەسـتی پێکـرد. ئـەم تەکنەلۆژیانـــە نەبوونـــە هـــۆی ســـەرهەڵدانی ســـــەرمایەداری بـــــەڵکو وەکـــــو زەمینـــــە تەکنەلۆژیکییـەکانی سـەرکەوتنەکەی لـە قەڵـەم دەدرێن.

هـەروەك پێشـتر وتمـان، فۆکـۆ لەسـەر ئـەو بڕوایەیە کە تەکنەلۆژیا دیسپلینەکان هەر لەو کاتەدا کە تا ڕادەیەك بە پەنهانی مانەوە، بەرفراوان بوون. ئەوان بە سادەیی گوتاری تیـۆری سیاسـی، یاسـا، مـاف و ئەرکـەکان و دادپـەروەریان بـەلاوە نـەنا. جێبەجێکارانی تەکنەلۆژیا دیسپلینەکان لە ڕاستیدا چەندین تیۆریان لە هەمبەر دەوڵەتەوە بەکارهێنا کە هەرکامێکیان لـە زەمـەنێکی تایبـەتی لـە ڕابـردوودا خرابووە ڕوو. ئەم تیۆرییە جیاوازانە دەیانتوانی لە شوێنگە جیاوازەکانی دەرکەوتنی دەسەڵاتدا، واتـە لـە کارخانـەکان، قوتابخانـەکان، زانکـۆ و ئیداراتـی حکومی بە یەکەوە بژین. مەبەست ئەوە نییە کە ئەم جـۆرە تیۆرانـە گرنگییـان نـەبوو بـەڵکو ئـاڵۆزی و تەنانەت ڕکەبەرایەتی نێوان هەڵوێستی تیۆری، ئەم واقیعیەتەی پەنهان دەکرد کە کردارە تەواو نوێیەکان لە پانتایی بایۆ– دەسەڵاتدا، بە شێوەیەکی بەفراوان لـە لایـەن خەڵکـەوە پەسـەند دەکـران. بـۆ نموونـە، گوتاری هیومانیستی (مرۆڤگەرایی) سەدەی هەژدە لە هەمبەر یەکسانییەوە، بزاڤێکی سیاسی تەواو بێ پێشـینەی وروژانـد. بـەڵام لـە هـەمان کـاتدا، دیسپلینێکی توند لە ناو کارخانە پیشەسازییەکان، ناوەندەکانی بێگاری کردن بە بێ کار و بەرەڵاکان و چاوەدێری و تێڕوانینی ڕوو لە زیادی پۆلیس بەسەر تاکـەکانی کۆمـەڵگادا، گرانتـی گەشـەی هێمـن و بێدەنگی کۆمەڵـە پەیوەندییـەك بـوو کـە بێگومـان نەیاندەتوانی پەیوەندی یەکسانی، برایەتی و ئازادی بن. ئەگـەرچی ڕوودانی ڕادەیـەك لـە پێشـکەوتن لـە دەزگا حکومییەکان لە ڕووی بەشداری و یەکسـانی سیاسییەوە ناکرێ نکوڵی لێبکرێت، بەڵام تەکنیکە دیسپلینەکان دەریان دەخست کە ئەندامانی کۆمەڵگا نـە یەکسـان بـوون و نـە بـە یـەك ڕادە دەسـەڵاتیان هەبوو: "دیسپلینە واقعی و جەستەییەکان، بنەمای ئازادییـە صـوری و حقوقییـەکانی پێکدێنـا. ڕەنگـە پەیمان /ی کۆمەڵایەتی/ وەکو بنەمای ئایدیایی یاسا لـە قەڵـەم بدرێـت، بـەڵام تەکنـەلۆژیای دیسـپلینی، تـەکنیکی ناچـارکردن و دیلایـەتی لـە ئاسـتێکی بـەرفراواندا پێکدەهێنـا" (دیسـپلین و سـزا، ل *222*، لەگەڵ هەندێ گۆڕانکاری لە وەرگێڕاندا).

ئەگەرچی ئەم تەکنەلۆژیا سیاسییە لەناو تۆڕی ئـاڵۆزی تیـۆری سیاسـی تـەقلیدیدا نـەبوو بـەڵام ناعـەقڵانی و بێ بابـەتیش نەبوو بـەڵکو لـە ڕاسـتیدا عەقڵانییەتی سیاسی تایبەتی خۆی هەبوو. ڕێك هەر ئـەم عەقڵانییەتـە و تەکنـەلۆژیای نوێـی بـایۆ– دەسەڵاتە کە بابەتی شیکردنەوەی فۆکۆ پێك دێنێت. بۆ تێگەیشتن لـەم جۆرە هزرە سیاسییە دیاریکراوە دەبـێ ئـەو هەڵوێسـتەی کـە لـە درێـژەی چـەرخی کلاسـیکدا سـەریهەڵدا لەگـەڵ تیۆرەکـانی پێشـوو سەبارەت بە سیاسـەت و مەعریفە، بەراورد بکەین و لە بەرانبەر یەکتریان دابنێین.

بە شێوەیەکی تەقلیدی، لە کولتووری ڕۆژئاوادا هـزری سیاسـی نیگـەرانی ژیـانێکی عادیلانـە و بەختەوەرانـە بـوو. عـەقڵی کردەیـی هـەوڵی دەدا خەسـڵەتی تاکەکەسـی و ژیـانی کۆمەڵایـەتی و سیاسی، لەسەر بنەمای تێگەیشتنێکی میتافیزیکی

بەربڵاوی نەزمی جیهان، ڕێك بخات. تەعبیرە مەسیحییەکانی ئەم ڕوانگەیە وەکو تەعبیری سن تۆماس لەسەر هەمان هێڵی فیکری ئەرستۆدا بوون. سن تۆماس هۆگری کۆمەڵگایەکی فازڵانە بوو کە ڕەگوڕیشەی بۆ جیهانبینی تیۆری ئەنتۆلۆژیانە دەگەڕایەوە. سیاسەت غایەتێکی بەرزتر بوو کە پاڵی بە نەزمێکی گشتی ترەوە دابوو و پێیان وابوو لە توانادا هەیە ئەم نەزمە بناسرێت. هزری سیاسی، تەکنیکێك بوو کە لە جیهانی پڕ کەموکوڕی، مرۆڤەکانی بەرەو ژیانێکی بەختەوەرانە ڕێنمایی دەکرد، تەکنیکێك کە وەك خوازەیەك لە حکومەتی خواوەند بەسەر سروشتدا لەقەڵەم دەدرا.

جۆری دووەمی عەقڵانییەتی سیاسی لە ماوەی ڕێنسانسدا سەریهەڵدا و بە زۆری لەگەڵ ناوی ماکیاڤیلیدا دێت. ماکیاڤیلی ئامۆژگاری میری دەکرد کە چۆن دەوڵەتەکەی خۆی بپارێزێت. پەیوەندی نێوان دەسەڵاتی میر و جۆری ئەو دەوڵەتەی کە ئەو حوکمڕانی بەسەردا دەکرد، بەم جۆرە دەبووە بابەتی توێژینەوە. هەروەك هەندێ کەسی تر ئاماژەیان پێکردووە، ئەم ئاڵوگۆڕە، وەکو دابڕانێکی سەرەکی لە نەریتی هزری سیاسی پێشووی ڕۆژئاوا دەژمێردرێ. لێرەدا ئیدی هیچ چەشنە تێبینییەکی میتافیزیکی لە ئارادا نەبوو و هیچ ئامانجێکی دیکە جگە لە پاراستنی دەسەڵاتی میر وەبەرچاو نەدەگیرا. لە نامیلکەکانی ئەم قۆناغەدا ئامانجی کۆتایی زیادکردن و یەکگرتوویی دەسەڵاتی سیاسی بوو نەك ئازادی یان بەختەوەری و یان تەنانەت ئاشتی و هێمنی هاوولاتیان. بەم چەشنە مەعریفەی کردەیی و تەکنیکی بەسەر تێبینییە میتافیزیکییەکاندا زاڵ بوو و تێبینی پەیوەندیدار بە جێبەجێکردنی دەسەڵات، گشتگیر و باڵادەست بوو.

ئاڵوگۆڕێکی تر لە هزری سیاسیدا ڕووی دا کە بە زۆری وەکو سەرهەڵدانی تیۆری بەرژەوەندی دەوڵەت دەناسرێت و لەو دوو ئاڵوگۆڕەی باسمان کرد جیان. ئەگەرچی تیۆریسێنەکانی بەرایی لەم پانتاییەدا لە هەمان سەردەمی ماکیاڤیلیدا دەرکەوتن و بە زۆریش ناویان لە پەنای ناوی ئەو دێت، بەڵام فۆکۆ لە دیدگایەکی جیاوازەوە سەیریان دەکات و بە تایبەتی نووسەرانی نامیلکە و ئەجیندا پسپۆڕییەکانی پەیوەندیدار بە پۆلیسی ئەو سەردەمە وەبەرچاو دەگرێت. خاڵی جێگەی سەرنجی فۆکۆ ئەوەیە کە ئەم نووسەرانە کە بە زۆری ناوەکانیان بۆ ئێمە نائاشنایە، هەندێ سیاسەتیان بۆ بەکارهێنانی کردەیی داڕشت و هەندێ تەکنیکی وردیان بۆ سەپاندنی نەزم و دیسپلین بەسەر تاکەکاندا خستەڕوو و لە هەمان کاتدا نەریتی سەرەکی هزری سیاسی ڕۆژئاوایان بۆ پەنهانسازی میتۆدی زانستی تایبەتی خۆیان، بەکارهێنا. لەگەڵ هەموو ئەمانەدا ئەوان نوێنەری ئاڵوگۆڕێکن لە فەلسەفەی سیاسیدا. ئەو کەسانەی کە بۆ پاراستنی بەرژەوەندی دەوڵەت تەدبیریان پێشکەش دەکرد، دەوڵەتیان وەکو ئامانج سەیر دەکرد و چارەنووسەکەیان لە هەموو جۆرە نەزمێکی ئەخلاقی بەرفراوانتر و هەروەها لە چارەنووسی هاوولاتیان بە جیا دەژمارد. بە پێی بەڵگەخوازی فۆکۆ ئامانجی ئەوان مۆدێرنترین و بنەماییترین ئامانج بوو، چونکە لە ڕوانگەی ئەوانەوە عەقڵانییەتی سیاسی ئیتر بەرەو بەدەستهێنانی ژیانێکی بەختەوەرانە و یان تەنیا پاراستنی میر لەسەر دەسەڵات نەبوو بەڵکو دەیەویست لە ڕێگەی پیادەکردنی دیسپلینێکی توندتر بەسەر جەستەی ڕەعییەتەکانی دەوڵەتدا، پانتایی دەسەڵات لە پێناوی خودی دەسەڵاتدا بەرفراوان بکات.

یەکەمین پرنسیپی ئەم عەقڵانییەتە سیاسییە نوێیە ئەوە بوو کە غایەتەکەی خودی دەوڵەت بوو نەك ئەو یاسایانەی کە حاکم بوون بەسەر مرۆڤ و سروشتدا. بوونی دەوڵەت و دەسەڵاتەکەی بابەتی ڕاستەقینەی مەعریفەی تەکنیکی و ئیداری نوێ بوو، لە بەرانبەر گوتاری حقوقی کۆندا کە دەسەڵاتی لە هەندێ غایاتی تری وەکو دادپەروەری، بەختەوەری یان مافی سروشتی دەبەست. مەبەست ئەوە نییە کە ماف بێ سوود یان نابودکرا بەڵکو هێدی هێدی ڕۆڵی تری لە کۆمەڵگای مۆدێرندا وەرگرت.

ئێستا بابەتی تێگەیشتنی مەعریفەی ئیداری خودی دەوڵەت بوو نەك مافی خەڵك، ماهییەتی یەزدانی یان مرۆیی یاسا. لەگەڵ ئەوەشدا ئامانجی ئەم مەعریفەیە ئەوە نەبوو کە تیۆرێکی گشتی دروست بکات بەڵکو مەبەست ئەوەبوو کە ماهیەتی تایبەتی هەر دەوڵەتێکی مێژوویی تایبەتی پێناسە و دیاری بکات. ئەمە خۆی لە خۆیدا پێویستی بە کۆکردنەوەی زانیاری هەبوو سەبارەت بە ژینگەی پەراوێزی دەوڵەت و دانیشتووان و سەرچاوە و بابەتە پەیوەندیدارەکان پێیەوە. هەروەك پێشتر بینیمان، بۆ بەرهەمهێنانی ئەم جۆرە مەعریفەیە دەبووایە کۆمەڵە شێوازێکی ئەزموونی توێژینەوە و پشکنین پێکبهێنرێت. بەم چەشنە خوێندنەوەی مێژوو، جوگرافیا، بارودۆخی هەرێمایەتی و دانیشتووانی هەر وڵاتێك لە ڕادەی بەدوادا گەڕانی تیۆری زیاتر چوو و بوو بە توخمێکی سەرەکی لە پێکهاتەی نوێی دەسەڵات و مەعریفەدا. حکومەت و بە تایبەتی دەزگای بەڕێوەبردنەکەی لە پێناو ئەوەدا کە بە شێوازێکی کارا ئیش بکات پێویستی بە مەعریفەیەکی عەینی، دیاریکراو و قابلی پێوان بوو. هەر ئەم مەعریفەیە ئەو دەرفەتەی لە بەردەم حکومەتدا دەرەخساند تا بە وردی بارودۆخی هێزەکانی خۆی دیاری بکات و خاڵە لاوازەکانی خۆی و چۆنیەتی چارەسەرکردنیان بزانێ. بەم چەشنە عەقڵانیەتی سیاسی نوێی بایۆ- دەسەڵات پەیوەندی لەگەڵ زانستە کۆمەڵایەتییە ئەزموونی و تازە دامەزراوەکاندا هەبوو. بۆ نموونە ئەوەی لە سەرەتادا خوێندنەوەیەکی دانیشتووان بوو، بە زوویی گۆڕا بۆ زانستی موحاسەبەی سیاسی. لێرەدا دەکەوینەوە یادی گەلێك بەشی (ڕۆحی یاساکان)ی بەرهەمی مۆنتسکیۆ لە هەمبەر ئاو و هەوا، جوگرافیا، دانیشتووان و هتد کە بە زۆری لە لایەن شیکەرەوە و ڕاڤەکارە نوێیەکان کورت کراوەتەوە یان وەلا نراون. لە ڕوانگەی فۆکۆوە هەر ئەم بەشانە گرنگترین بەشی نامەی مۆنتسکیۆ پێك دێنن، نەك ئەو بەشانەی کە تێیاندا باسی فەزیلەت کراوە.

دەرەنجام ئەوە بوو کە بەڕێوەبەران و کاربەدەستە دەوڵەتییەکان نە تەنیا هەر پێویستیان بە ناسینی وڵاتی خۆیان هەبوو بەڵکو پێویستیان بە ناسینی وڵاتەکانی تریش هەبوو. ئەگەر غایەتی ئەم عەقڵانییەتە سیاسییە، دەسەڵاتی دەوڵەتی بوو، ئەوا ئەم دەسەڵاتە دەبووایە بە پێی هێز و توانا بپێورێت. لەبەرئەوەی هەموو دەوڵەتەکانی دیکەش، هەمان گەمەی سیاسیان ئەنجام دەدا، بەراوردکردنی نێوانیان شتێکی بنەڕەتی و گرنگ بوو. خۆشگوزەرانی و تەنانەت مانەوەش دەرەنجامی فەزیلەت نەبوو بەڵکو وەکو بەرهەمی هێز و توانا لە قەڵەم دەدرا. لێرەشدا توخمی سەرەکی، مەعریفەی ئەزموونی بوو نەك تیۆری ئەخلاقی.

بەم چەشنە سیاسەت گۆڕا بۆ "بایۆ-سیاسەت /ئەو سیاسەتەی بەسەر ژیاندا دەڕوانێت/ "*Bio-Politics*". هەرکە بایۆ- سیاسەت سەری هەڵدا، ژیانی دانیشتووان و نابودکردنیان بوو بە پاشکۆی دانانی سیاسی. لەبەرئەوەی کە ئەم حەشیمەتە هیچ

نەبوو جگە لەو شتەی کە "دەوڵەت لە پێناوی خۆیدا گرنگی پێدەدان" هەر بۆیە دەوڵەت دەیتوانی بە پێی بەرژەوەندییەکانی خۆی جێگۆڕکێیان پێبکات و یان بەژێر نووکی چەقۆدا تێپەڕیان بکات.

**بە کورتی:**

"دەتوانین دەستتێوەردانی ڕۆژ لەگەڵ ڕۆژ زیاتری دەوڵەت لە ژیانی تاك بە تێپەڕین، لەم هزرە کە دەوڵەت خاوەنی خەسڵەت و غایەتێکی تایبەت بە خۆیەتی، بەرەو هزرێکی تر کە مرۆڤ بابەتی ڕاستەقینەی دەسەڵاتی دەوڵەتە، ببینین؛ مرۆڤ تا ئەو شوێنەی کە بەرهەمهێنەری دەسەڵاتێکی زێدەیە، تا ئەو شوێنەی کە بوونەوەرێکی زیندوو، کرێکار و قسەکەرە، تا ئەو شوێنەی کە کۆمەڵگایەك پێکدێنێت، تا ئەو شوێنەی کە لە ژینگەیەکی سەر بە دانیشتوواندایە، /بابەتی ڕاستەقینەی دەسەڵاتی دەوڵەتە/. گرنگی ژیان لەبەر ئەم بابەتە پەیوەندیدارن بە دەسەڵاتی سیاسی زیاد دەبێت، جۆرە ئاژەڵسازییەکی مرۆڤ لە ڕێگەی ئاڵۆزترین تەکنیکە سیاسییەکان دێتە ئاراوە. هەم سەرهەڵدانی دەرفەتی زانستە مرۆڤایەتی و کۆمەڵایەتییەکان و هەم سەرهەڵدانی دەرفەتی پاراستنی ژیان و دەرفەتی کۆکوژی بە شێوەیەکی هاوکات، لەسەر سەکۆی مێژوودا دەردەکەوێت" (وتاری ئستانفۆرد).

فۆکۆ لە شیکردنەوەی ئەم جۆرە نوێیەی عەقڵانییەتی سیاسیدا، پەیوەندییەکی تازە لە نێوان سیاسەت و مێژوودا دەستنیشان دەکات. یاسادانەری دانا و تێگەیشتوو ئیدی ناتوانێت هەموو ڕەگەز و کۆڵەکەکانی دەوڵەت دەستەبەر بکات و هەماهەنگییەکی تەواو و بێ کەموکوڕی دروست بکات. لە بەرانبەر ئەمەدا دەبێ ئەو چاوەدێری کۆمەڵە هێزێك بێت کە لە حاڵی گۆڕاندان کە بە نۆرە لە لایەن بڕیارە سیاسییەکانی ڕژێمەوە بەهێز یان لاواز دەکرێن. لەبەرئەوەی ئیتر ناتوانرێت هیچ چەشنە بنچینەیەکی هاوسەنگ، یان ڕادەیەك لە دەرەوە ڕابسەپێنرێت، هەر بۆیە هیچ چەشنە ڕادەیەکی ناوەکی بۆ ئەو هێز و دەسەڵاتەی کە لەوانەیە دەوڵەت بە دەستی بێنێ، بوونی نییە. دەسەڵات کە لە سنوورەکانی سروشت و ئاین ئاسوودە بووە، دەچێتە ناو جیهانێکەوە کە لانی کەم وەك بنچینەیەك، لە توانایدا هەیە بە چەشنێکی بێڕادە و سنوور بەرفراوان بێت. ئەم بەرفراوانبوونە (یان وێرانییە) لەسەر سەکۆی مێژوودا ڕوودەدات. هەڵبەتە هەندێ هێزی مادی لە ئارادان کە کاریگەری لەسەر ڕەوتی مێژوو دادەنێن. بێگومان سەرهەڵدانی قۆناغێکی ئەوتۆ لە ژیانی سیاسیدا پەیوەندی لەگەڵ ئاڵوگۆڕی سەرەکی ئابووری و دیمۆگرافی و بە تایبەتی لەگەڵ سەرهەڵدانی سەرمایەدارییەوە هەیە. لەگەڵ هەموو ئەمانەدا، پاش ئەوەی زیاتر لە سەدەیەك بەسەر مێژوونووسی مارکسیستیدا تێدەپەڕێت، دیسان گرنگی تایبەتی ئەم عەقڵانییەتە سیاسییە تایبەتییە شیکردنەوەیەکی تەواوی بۆ نەکراوە. دەستنیشانکردن و شیکردنەوەی ئەم کردارە سیاسییە دیاریکراوانە دەکەوێتە ناوەندی گرنگیپێدانی فۆکۆ.

بۆ نموونە، سەرەرای ئەوەی گرنگیپێدانی نەوەی نویی بەریوەبەران و کاربەدەستانی دەولەتی بەرەو دانیشتووان شۆربۆتەوە، بەڵام لە هەمان کاتدا لە دیدگای ئیدارییەوە پیناسەیەکی تازە بۆ سیاسەت و تاك بڕەوی سەند. لە پانتایی روو لە بەربڵاوی دەولەتی مۆدیرن و دەزگا ئیدارییەکانی، مرۆڤەکان لە هەر کایەیەکدا، وەکو یەکیك لە سەرچاوەکان لە قەلەم دەدرین. تاك ریك تا جیگەیەك سەرنج و گرنگی پیدەدریت کە بەشدارییەك بکات لە

بەهێزکردنی دەوڵەتدا. ژیان، مەرگ، چالاکی، کار، بەدبەختی و خۆشی تاکەکان تاکو ئەو شوێنە بە گرنگ وەردەگیرێت کە لە رووی سیاسییەوە سوودمەند بێت. هەندێ جار ئەو شتەی دەبووایە تاك لە روانگەی دەوڵەتەوە ئەنجامی بدات ئەوە بوو کە بە شێوەیەکی تایبەتی ژیان یاخود کار و بەرهەمهێنانی ئەنجام بدا و هەندێ جاریش دەبووایە تاك لە پێناو بەهێزکردنی دەوڵەتدا بمرێت. پەیدابوونی تاکی مۆدێرن وەکو بابەتێکی پەسەندی سیاسی و زانستی و شوێنەوارەکانی ئەم ئاڵوگۆڕە بۆ ژیانی کۆمەڵایەتی، ئێستا دەبێتە بابەتی سەرەکی شیکردنەوەی فۆکۆ.

ئەرکی پۆلیس رێکخستن و جێبەجێکردنی تەکنیکەکانی بایۆ- دەسەڵات بوو بە مەبەستی زیادکردنی چاوەدێری دەوڵەت بەسەر دانیشتواندا. ئەگەرچی پۆلیسی فەرەنسا لە سەدەکانی حەڤدە و هەژدەدا وەکو بەشێك لە دەزگای دادوەری حسێب دەکرا، بەڵام لەگەڵ تاکەکاندا نەك وەکو سوژەی دادوەری بەڵکو وەکو بوونەوەری زیندووی گیرۆدە لە کار و بازرگانیدا هەڵسوکەوت دەکرا. (ئەم رەهەندەی بابەتەکە بە دوور و درێژی لە (نظم اشیاء) بە شێوازی ئارکیۆلۆژی تاوتوێ کراوە). فۆکۆ لەسەر بنەمای کورتە کتێب و ئەجێندای ئیداری ئەو قۆناغە، دەریدەخات کە ئەرکی سەرەکی پۆلیس کە بە چەشنێکی روو لە زیاد ئەولەویەتی زیاتری پێ دەدرا، چاوەدێری کردنی تاکی تایبەتی و گشت دانیشتووان بوو تاکو ئەو شوێنەی کە پەیوەندی بە بەرژەوەندی دەوڵەتەوە هەیە. هەر بۆیە ئەرکەکانی پۆلیس گەلێك بەربڵاو بوون: "مرۆڤەکان و شتەکان لەو پەیوەندییە کە لەگەڵ خاوەندارێتیدا هەیانە، ئەو شتەی بەرهەمی دێنن، پێکەوە ژیانی مرۆڤەکان لەسەر خاکێك، ئەو شتەی لە بازاڕدا ئاڵوویر دەکرێ /بابەتی چاوەدێری پۆلیسن/. ئەم رۆڵانە، چاوەدێریکردن بەسەر ژیانی مرۆڤەکان، نەخۆشی و ئەو رووداوانەی کە تووشی ئەوان دەبێت لەخۆ دەگرێ. بابەتی چاوەدێری پۆلیس، مرۆڤی زیندووی چالاك و بەرهەمهێنە. کتێبێکی بچووك کە هی قۆناغی پاشایەتی لویسی چواردەیە دەڵێت: "بابەتی راستەقینەی پۆلیس مرۆڤە" (پێشوو). بەر لەمە دەسەڵاتی دەوڵەت بەسەر تاکەکاندا وەکو تاکی خاوەن ماف و ئەرك پیادە دەکرا. بەڵام لەو سەردەمەدا پۆلیس لەگەڵ مرۆڤەکان لە چالاکی رۆژانەیاندا وەکو توخمی سەرەکی هێز و چالاکی دەوڵەت سەروکاری هەیە. پۆلیس و پاشکۆ ئیدارییەکانی ئێستا بەرپرسیارێتی باشکردن و خۆشگوزەرانی و لە هەمان کاتدا کۆنترۆڵی مرۆڤەکانی لەسەر شانە.

دەزگای ئیداری دەوڵەت پرسی خۆشگوزەرانی لەژێر ناوی دابینکردنی پێداویستی و بەختەوەری خەڵك دێنێتە بەرباس. هەڵبەتە ئەمانە هەر ئەو ئامانجانە بوون کە دابینکردنیان غەمی سەرەکی حکومەتەکانی پێشووتریش بوو، بەڵام ئێستا پەیوەندییەکە ئاوەژوو بۆتەوە. ئێستا نیازەکانی مرۆڤ ئیدی وەکو غایەتێك لە خودی خۆیدا یان بابەتی گوتارێکی فەلسەفی کە لە هەوڵی دۆزینەوەی ماهییەتی زاتیاندا بێ، تەسەور ناکرێت، بەڵکو لە روانگەیەکی ئامرازگەرایانە و ئەزموونی وەکو هۆی زیادکردنی دەسەڵاتی دەوڵەت دەژمێردرێت. بەم چەشنە فۆکۆ پەیوەندی نێوان تێگەیشتنی ئیداری نوێ بۆ خۆشگوزەرانی مرۆڤ و بەرفراوانبوونی بایۆ- دەسەڵات پێشان دەدات.

دوو جەمسەری بایۆ- دەسەڵات، واتە پیادەکردنی کۆنترۆڵ بەسەر جەستە و بەسەر جۆری مرۆڤ کە لە سەدەی هەژدەدا جیا لە یەکتری

گەشـەیان سـەندبوو، لـە سـەدەی نـۆزدەدا لـە چوارچێـوەی گرنگیپێدانێکـی ڕوو لـە زیـاد بـە جنسیەتدا لە یەکتری بەسران– سەرەڕای دەوڵـەت، شێوازی دیکەی دەسەڵاتیش هاتنە ناو ئیشەکەوە و ئـەوانیش بـە مەبەسـتی کۆنـترۆڵکردنی کـرداره سێکسییەکان، شێوازی نوێ و هەروەها گوتاریان لە هەمبەر جنسییەتەوە بەکارهێنا. جنسییەت بوو بە بوونیادێك کە لە ڕێگای ئەوەوە دەسەڵات، چالاکی حەیاتی جەستەیی لەگەڵ چالاکی حەیاتی جۆری مرۆڤدا لێك دەبەست؛ جنسییەت و ئەو مانایەی کە پێی دەدرا ئێستا ئیتر بـوو بـە کـەناڵی سـەرەکی بەرفراوانبوونی بایۆ–دەسەڵات.

ئێمە باسە سەرەکییەکانی فۆکۆ لە هەمبەر جنسییەت (یان بە وتەی خۆی بڵاوبوونەوەی جنسییەت– *deployment of sixuality*) دواتر دێنینە بەرباس. لێرەدا تەنیا دەمانەوێ جەخت لەسەر ئەوە بکەینەوە کە بابەتی جنسییەت وەکو بەشێك لە پانتایی ڕوو لە زیادی بایۆ–دەسەڵات، دەرکەوت. نابێت ئەم جۆرە گوتارە لەمەڕ جنسییەتەوە بە مەفهوومە ڤیبەرییەکەی واتە وەکو سەرهەڵدانی جۆرە ڕەنجکێشییەکی نادینی وەربگرین. لە هەناوی تۆڕی تەعبیری بایۆ–دەسەڵاتدا، بڵاوبوونەوەی جنسییەت، نەك هۆگری نسبەت بە جنسییەتی لێ نەکەوتەوە بەڵکو بوو بە هۆی سەرهەڵدانی گوتار و هۆگری نسبەت بە چالاکی حەیاتی جەستە لە ڕادەیەکی یەکجار مەزندا. بە پێی بانگەشەی فۆکۆ، ئامانجەکە بریتی بوو لە "قووڵکردنەوەی گرنگی جەستە و هێنانە بەرباسی تەندروست و شێوازی دابینکردنی وەکو بابەتێك کە بۆ تاوتوێکردن دەشێت"؛ "مەسەلەکە، خستنەڕووی کۆمەڵە تەکنیکێك بوو بۆ زیادکردنی تەمەن بۆ بەرزترین ڕادە. ئەو بابەتەی کە بە شێوەیەکی سەرەکی گرنگی پێدەدرا.. جەستە، ساخلەمی، درێژی تەمەن، لەدایکبوون و ئەسڵ و نەسەبی چینایەتی بوو کە "حکومەتیان دەکرد" (مێژووی جنسییەت، ل *123*).

وا دێتە بەرچاو کە هیچ کاتێك بەو ڕادەیە گرنگی بە لایەنە جیاوازەکانی جەستە و ڕەهەندە جۆراوجۆرەکانی جنسییەتەکەی نەدرابوو. بەم چەشنە لە هەناوی جنسییەتدا، مانا، دەسەڵات و مەعریفەیەکی نوێ بە ئەمانەت دانرا.

تا بەر لە سەدەی نۆزدە بەکارهێنانی گشتی جنسییەت بە سەرانسەری کۆمەڵگادا بڵاوبووەوە. چینەکانی ناوەڕاست هەر بەو جۆرە کە لە سەرەتای سەدەی نۆزدە خۆیان لە ئەرستۆکرات و "سیمبۆلەکانی شەرەف و نەسەب"ی ئەو چینە جیاکردبۆوە، ئێستاش خۆیان لە چینی کرێکاران کە بەرەو ناو تۆڕی جنسییەت و بایۆ– دەسەڵات ڕادەکێشران، جیادەکردەوە. لە سەرەتای سەدەی نۆزدەدا ئەخلاقگەراکانی بۆرژوازی ئامۆژگاری تاکی هاوچینی خۆیانیان دەکرد کە بە وردی سەرنج لە مەسەلەی جنسییەت و ژیانی پەنهانی ناوی و هەروەها ئەو مەترسییانەی لەوەوە سەرچاوە دەگرن، بدەن. تا بەر لە کۆتایی سەدەی نۆزدە مەترسییەکانی جنسییەت گرنگییەکی زیاتری پێدرا و سەرکوت و بەنهانسازی بە شێوەیەکی ئەخلاقی وەك ئامۆژگاری دەخرایە ڕوو. فۆکۆ گوتاری نوێ بەم جۆرە وەسف دەکات: "جنسییەت نە تەنیا هەروەك ڕێنوێنیکەرانی ویژدان، ئەخلاقگەراکان، مامۆستا و پزیشکەکان بەردەوام بە نەوەکانی پێش خۆیانیان دەگوت، ڕاز و ڕەمزێکی گەورەیە، و نە تەنیا دەبێت ئێمە ئەو حەقیقەتەی کە /جنسییەت/ حەشاری دەدات بدۆزینەوە، بەڵکو ئەگەر ئەو هەمووە مەترسییەی هەیە لەبەر ئەوەیە کە ئێمە بۆ ماوەیەکی دوور و درێژ لە بارەیەوە بێدەنگ بووین (جا چ بە

هۆی تێبینی ئەخلاقییە یان هەستی توندی گوناه یان دووڕوویی و یان هەر هۆیەکی دیکە بێت" (پێشوو، ل *128* و *129*). پاش ئەوەی کە سێکسی سازی تاک و کۆمەڵەکان بە سەرانسەری کۆمەڵگادا بڵاوبۆوە، ئیدی خۆخەریکردنی بۆرژوازی لە هەمبەر جنسییەتەوە نەیدەتوانی هێمای جیاکردنەوەی چینەکان بێت. ئێستا جنسییەت وەکو مانا بەرەو جنسییەت وەکو کۆنترۆڵی ئیداری تەشەنە دەسێنێ.

هەر لەم قۆناغە لە فراوانبوون و بڵاوبوونەوەی بایۆ- دەسەڵاتدا بوو کە بەرنامەکانی ئێمەی (دابین کردن) خۆشگوزەرانی کۆمەڵایەتی، بە شێوەیەکی ڕەسمی (فەرمی) سەری هەڵدا. بۆرژوازی لە کاتێکدا سەبارەت بە خەیاڵپەروەری لەمەڕ زینا لەگەڵ محارمدا قسەی دەکرد و بابەتی دەنووسی، هەندێ بەرنامەی بۆ دابینکردنی خۆشگوزەرانی لە ناوچە دێهاتی و گەڕەکەکانی پەراوێزی شاریشدا ڕێکدەخست. ئەنجوومەنە جیاوازەکانی چاکسازی هەوڵیان دەدا کردەوەی زیناکردن لەگەڵ محارم و لاڕێی تری ناجایز لەنێو چینی کرێکاردا لە ڕەگوڕیشەوە هەڵکەنن. لە ژمارەیەکی زۆری ڕاپۆرت و وتارەکانی ڕۆژنامەکان سەبارەت بە بوونی ئەم جۆرە مەترسییانەوە هۆشداری بە جەماوەری خەڵك دەدرا. سەرەڕای ئەمە، شارەوانییەکان، هەندێ دەرمانخانەیان بۆ ڕووبەڕووبوونەوە لەگەڵ ئەو نەخۆشیانەی کە لە جووتبوونەوە سەرهەڵدەدەن، دامەزراند و لە هەمان کاتدا لە ڕێگەی دەستەبەرکردنی کۆمەڵێکی ئاڵۆزی دۆسییەی پزیشکی و دروستکردنی مەلهە (فاحشەخانە)ی مۆڵەت پێدراو، کۆمەڵێك هەوڵ بۆ ڕێکوپێکی بەخشین و پیادەکردنی چاوەدێری بەسەر فەحشاگەرییەوە ئەنجام درا. بەرفراوانبوونی تۆڕی دیسیپلینی بەم جۆرە، بە ناوی پاراستنی تەندروستی گشتی و لە ترسی فەساد و دارمانی وەچە ئەنجام دەدرا. خودی ئامارژەکردن بە چارەنووسی وەچەو نەژاد و نەتەوە بە شێوەیەکی سەرەکی لەسەر بنەمای کار و کردەوە سیکسییەکەی دامەزرابوو.

زۆری پی نەچوو کە دەروونشیکاری، بۆ بەکارهێنانی /لە لایەن/ بۆرژوازییەوە، هاتە ناو /کارەکە/وە. دەروونشیکاری هێمای لوتکە و کەماڵی گریمانەی سەرکوت، پەیوەندی حەز و یاسا لە پەتیترین شێوەی خۆیدا و ئاویتەبوونی مانایی و مەحرەمانە و سەرسوڕهێنەر بوو؛ دەروونشیکاری لانی کەم بۆ هەندێکیان، دەرمانی سەرکوت بوو. بە پێی دەروونشیکاری پەیوەندی نێوان جنسییەت و یاسا وەکو سەرکوت، پەیوەندییەکی تەواو گشتی و سەرانسەری بوو و هەر ئەم پەیوەندییە بنەمای شارستانییەتی پێکدەهێنا. بەڵام ئەو حەز و ئارەزووە زیناکارانەی کە ببوونە هۆی بەرقەرارکردنی کردەی سەرکوت لە هەموو کۆمەلگاکاندا، ئێستا بە چەشنیکی بی مەترسی لە ڕێگای دەروونشیکارییەوە قابلی هێنانە بەرباس بوون لەنێو گوتاردا. بۆرژوازی کاتێ دەسەڵاتی مۆنۆپۆلی خۆی بەسەر گوتار لە مەڕ جنسییەتەوە لە دەست دا، ئیمتیازیکی تری بۆ خۆی دروستکرد: ئێستا بۆرژوازی دەیتوانی سەبارەت بە جنسییەتی سەرکوتکراو و قوولترین حەز و ئارەزووەکان قسە بکات. لانی کەم بۆ چینی بۆرژوا، "ئێستا ئەرکی دۆزینەوەی حەقیقەت پەیوەندی بە تەحەدی کردن لە حەرامکراوەکانەوە هەبوو". ئاخاوتن سەبارەت بەو شتانەی کە دەسەڵاتی یاساغی دەکرد، لە شکلی دانپیاناندا سەری هەڵدەدا.

هەردوو بەشی دیسیپلینی و دانپیانان وەرگرانەی بایۆ-دەسەڵات، سەرەڕای ئەوەی لە

ڕووی ئەرکـــە چینایەتییەکانیانـــەوە جیاوازییـــان هەبوو، بـەڵام لـەو گریمانـە هاوبەشـانەی کـە لەمـەڕ گرنگـی جنسـییەتەوە هـەیانبوو، یەکسـان بـوون. یەکێك لـەو نموونانـەی کـە فۆکـۆ دەیهێنێتـەوە ئـەم خاڵە ڕوون دەکاتەوە. لە سەرەتای سەدەی نۆزدە لە ڕووی زانسـتییەوە ڕاگەیـەنرا کـە تـابۆی زینـاکردن لەگـەڵ محارمـەکان ڕێسـای گشـتی هـەموو کۆمەڵگاکانـە؛ لـە هـەمان کـاتدا دەزگـا ئیدارییـەکانی دەوڵەت هەوڵیان دا کە کردەوەی زینا لەگەڵ محارم لـەنێو دانیشـتووانی دێـهاتی و چینـی کرێکـاردا لـە ڕەگوڕیشـەوە هەڵکـەنن و ڕۆشـنبیرانیش لـە ڕێگـەی زانستی دەروونشیکارییەوە قەناعـەتیان بـە خۆیـان دێنا کە بە قسەکردن سەبارەت بەم تابۆیە لە بەرانبەر سەرکوتدا بەرهەڵستی و بەرگری دەکەن. بەم چەشنە خوڵگەکـە دادەخـرا. گریمانـەی سـەرکوت بـوو بـە بەردی بناغەی پێشکەوتنی بایۆ دەسەڵات.

بەم جۆرە ئەگەر بۆ پرسیارە بەدیهییەکەی فۆکۆ لە سەرەتای کتێبی مێژووی جنسییەت بگەڕێینـەوە کە ئایا گوتاری ڕەخنەگرانە سـەبارەت بـە سـەرکوت لەمپەرێك بوو لە بەرانبەر دەسەڵاتدا یان بەشێك بوو لـە میکـانیزمی ئـەو دەسـەڵاتەی کـە دەخرایـە بـەر ڕەخنەوە، دەتوانین ئێستا وەڵام بدەینەوە کە گوتاری ڕەخنەگرانە بۆ خـۆی بەشـێکی سـەرەکی دەسـەڵات بوو. فۆکۆ بە کورتی ئەم خاڵە بەم جۆرە دەردەبڕێت: "بـەم چەشـنە یاسـا، تەنانـەت لـە زانسـتی میکـانیکی نوێی دەسەڵاتدا، لە ئاسایشدایە و پایەدارە، چونکە ئەوە لوغزی کۆمەڵگایەکە کە لـە سـەدەی نۆزدەوە تـا ئێسـتا گـەلێك تەکنـەلۆژیای دەسـەڵاتی دروسـت کردووە کە سـەبارەت بـە مەفهوومـی یاسـا بێگانـە و نـامۆن: /ئـەم کۆمەڵگایـە/ لەدەسـت شـوێنەوار و بڵاوبوونـەوەی ئـەو تەکنەلۆژیایانـە وەزاڵـە هـاتووە و هـەوڵدەدات بیانخاتـە شـکڵی یاسـاوە، (مێـژووی جنسییەت، ل *109*).

بەڵگـەخوازی فۆکـۆش بـۆ خـاڵی دەسـتپێکی گەڕاوەتـەوە. بایۆ–دەسـەڵات، لـەناو خۆیـدا جێگـای داوە بـە گریمانـەی سـەرکوت. بـارودۆخی مێـژووی سەرهەڵدانی گریمانەی سەرکوت واتە ئەو دەستە لە کرداره کولتوورییەکان کە ئـەم تیۆرییـە لـە هەمبـەر جنسییەتەوە لە هەناوی ئەوانەوە سەریهەڵدا، ئێستا لەگەڵ هەلومەرجی قبوڵکردنی ئەم گریمانەدا جووت و گونجاوە. بە شێوازی تەعبیری باو، تەنیا کاتێك لە هـــەردووکیان تێدەگـــەین کـــە لـــەنێو "تـــۆڕی ڕەمزکردنـەوەی مێژوویـی" تـەواوتردا دابـنرێن. بـە وەبەرچاوگرتنی ئەم تۆڕە ئێستا دەتوانین ئاراستەی باسـەکە بگۆڕیـن و بـە شـێوەیەکی تێروتەسـەلتر خـەریکی تـاوتوێکردنی تەکنـەلۆژیاکانی دەسـەڵات و عەقڵانییەتی پەیوەندیدار بەوەوە بین.

### ژێدەر

میشـل فۆکـۆ فراسـوی سـاختگرایی و هرمینوتیـك، هیوبرت دریفوس/ پل ڕابینو ت: حسین بشیریه، *1379*.

### پەراوێز

*1*–بێگومـان نـاتوانین لـە هەڵسـەنگاندنی بەڵگەخوازییـە مێژووییەکانی فۆکۆ بە شێوەیەکی سادە بگەڕێینەوە سەر ڕووداو و حاڵەتـەکان: مێژوونووســە فەڕەنســییەکان ســەبارەت بــە هەڵســەنگاندنی بەرهەمــەکانی فۆکــۆ جیاوازییـەکی زۆریـان لـە نێوانـدا هەیـە. دەسـتەیەك لـە مێژوونووسە پسپۆڕەکانی مێژووی سـەدەی نـۆزدە لـەم کتێبەی خوارەوەدا تاوتوێی کتێبی (دیسپلین و سزا)یان کردووە:

*L'Impossible Prison (Paris: Editions de seuil, 1980)*

دژکردەوەی هەندێ لەم نووسەرانە خۆپارێزانە و هەی هەندێکی تریان سەرکەتووانە بووە، ئەگەرچی هەموویان جگە لە هەندێ حاڵەتدا نەبێ ناتوانن ئەوە پێشان بدەن کە فۆکۆ "حاڵەت و رووداوەکان"ی خستۆتە ژێر ڕکێفی خۆیەوە. هەروەك فۆکۆ بە زمانێکی توانجئامێز وتوویەتی زۆربەی ئەو نووسەرانە لە بەڵگەخوازییەکانی خراپ تێگەیشتوون و هەر لەم ڕوویەوە تەنانەت ڕاستکردنەوە بچووکەکانیشیان هیچ پەیوەندییەکی بە بابەتەکەوە نییە.

بە باشی سوود لەم دەرفەتە وەرنەگیرا چونکە لەو کتێبەدا بە شێوەیەکی سوودبەخش و بیرمەندانە گرنگی بە لایەنە وردە (جزئیات) مێژووییەکان نەدرا. لە لایەکی ترەوە پۆل ڤێن مامۆستای مێژووی ڕۆم لە کۆلیژی دوفرانس لەم وتارەی خوارەوەدا ستایشی فۆکۆی کردووە وەکو مێژوونووسێکی درەوشاوە، وردو تیژ بین:

*Paul Veyne, "foucault revolutionne L'historie" in comment on Ecrit L'Historie, Editions de seuil, 1978.*

# ئاڵتۆسیۆس (1557–1638)

د. موسا ئیبراهیم
لە عەرەبییەوە: شوان ئەحمەد

**بەگشتی:**

"ئاڵتۆسیۆس" ساڵی *1557* لە هەرێمی وستڤالیای ئەڵمانیا هاتۆتە دنیاوە. خوێندنی لە كۆلۆنیا و باڵ و جنیڤ تەواو كردووەو لە سەروەختی خوێندنیدا كەوتۆتە ژێر كاریگەری ڕێبازی كالڤینیەوە.. ماوەیەكی زۆر مامۆستای یاسا بووە لە زانكۆی (*Herbon*). ساڵی *1603* كتێبە بەناوبانگەكەی (سیاسەتی مەنهەجی) نوسی، پاشان داوای لێكرا ببێتە ئەندامی ئەنجومەنی شارەوانی شارۆچكەی (*Emden*).

"ئاڵتۆسیۆس" تیۆریایەكی سیاسی لەسەر بنەمای پەیمان و ڕێكەوتن دارشت و خۆی لە كاریگەریە ئایینیەكان بە دوورگرت، بەڵام ئەوانەی لەسەر پەیمانەكە ڕێك دەكەون تاكە كەس نین بەڵكو گروپە سەرەكیەكانی كۆمەڵگەن. ئەو پەیمان و ڕێكەوتنەی "ئاڵتۆسیۆس" باسی دەكات، لە ڕاستیدا زۆر بەو ئارەزووە كۆمەڵایەتیە خۆڕسكە دەچێت كە لە تیۆری ڕواقیەكاندا هەبوو، بەبێ هیچ جۆرە گەڕانەوەیەك بۆ كاریگەریە ئایینیەكان یاخود كاریگەریە تیۆلۆژیەكان. بەلای "ئاڵتۆسیۆس"ەوە ئامانج لە سیاسەت ئەوە بوو: (باس لە مەرجە جەوهەری و سەرەكیەكانی ژیانی كۆمەڵایەتی بكات، هەر لە خێزانەوە تا دەوڵەت)[1].

بەمجۆرە دەبینین ئەو بازنەی سیاسەت فراوانتر دەكات تا تەواوی ڕێكخراو دامەزراوەكان بگرێتەوە، لەوانەش دەوڵەت كە سیاسەت تیایدا دەستێكی باڵای هەیە.

**بنەمای دروستبونی دەوڵەت:**

"ئاڵتۆسیۆس" بە پێچەوانەی "تۆماس هۆبس"ەوە پێی وا نیە كۆمەڵگە قەوارەیەكی دروستكراو بێت، لەبەر ئەوەی بەلای ئەوەوە مرۆڤ بوونەوەرێكی كۆمەڵایەتییە و بە ناچاری وابەستەی دەستە و گروپە و ژیانی ئادەمیزادیش تەنها بە هاوكاری و پەیوەندی بەستن بەردەوام دەبێت.

ئــەوەتا دەڵێــت: (هــەر کۆمەڵگـــە و کۆمەڵـــە ئادەمیزادێك و یاسایەکی دوولایەنەی خـۆی هەیـە: یـەکێکیان جــۆری ئــەو کۆمەڵگــە و کۆبوونەوەیــە پێناس دەکات کە لە نێوان ئەندامەکانیدا دروســت بووە، ئەوی دیکەشیان دەسەڵاتێك دێنێتە ئاراوە تا ئەرکی بـەڕێوەبردنی کۆمەڵگـە لـە ئەسـتۆ بگرێـت و سنور و سانسۆریشی بۆ دابنێت).

کەواتە تیۆریای "ئاڵتۆسیۆس" باس لـە بوونی دوو پەیمان یان ڕێکەوتن دەکات: یەکێکیان سیاسیە و پـەیوەندی فـەرمانڕەواو هاوڵاتیان دیـاری دەکـات، واتــە پەیوەندیــەکانی نێوانیـــان تـــاوتوێ دەکـــات. دووەمیـــان کۆمەڵایەتیـــە و بـــاس لـــە چۆنیـــەتی دروستبونی کۆمـەڵگا و پێکـەوە ژیـانی ئەندامـەکانی دەکات.

"ئاڵتۆســـــیۆس" جـــــۆری کۆمـــــەڵگاکان بەشێوەیەکی ورد پۆلێن دەکات و دەکرێت بۆ پێنج جۆری سەرەکیان کورت بکەینەوە.. سەرەتاش وەکی "جان بودان" لە خێزانەوە دەستپێدەکات و پێی وایە خێزان یەکەمین خانە و یەکەمین گروپی یەکگرتووە و دەکرێت بە کۆمەڵگەیـەکی سادە و ساکار ناونوسـی بکەین، پاشان دەزگایـەکی خۆویسـتانە (*Comagnie*) دێتـە ئـارا، ئەمـەش لـە ئـەنجامی کۆبوونـەوەی ئـەو خــێزان و بنەماڵانــە پێکدێــت کــە بەرژەوەندیــەکی گشـتی هاوبەش لـە نێوانیـاندا هەیـە.. دوا بـە دوای ئەمەش گروپی لۆکـاڵی دێـت. پاشـان قۆنـاغی ئـەو هــــەرێم و ناوچانــــە دێتــــە پێــــش کــــە لــــە چــــەند کۆمەڵگەیــــەکی لۆکــــاڵی پێکدێــــت و دوا جــــاریش دەزگــــای دەوڵــــەت دێتــــە ئــــاراو دروست دەبێت.

بەمجۆرە و لە سەرەنجامدا کۆمەڵگەی ئینسانی دوای فراوانبـــــون و گـــــەورەبوونی یەکــــــە کۆمەڵایەتیەکان، دەگات بە دەوڵەت..

"ئاڵتۆسـیۆس" پێـی وایـە ئـەو کۆمەڵگایانـەی زۆر پێشـــکەوتوون، هۆکـــاری ســـەرەکی ئـــەم پێشکەوتنەیان تاکە کەس نییە، بەڵکو ئەو پەیمان و ڕێکەوتنەیــە کــە لــە نێــوان گــروپ و ڕێکخــراوە جیاجیاکاندا هەیە.

### دەوڵەت و سەروەری:

"ئاڵتۆسیۆس" پێی وایە دەوڵەت ڕاستەوخۆ لە ڕێکــەوتنێکی نێــوان خــەڵکێکی زۆرەوە دروســت نابێت، بەڵکو بەرەنجامی پەیمان و ڕێکەوتنێکە کە لە نێوان هەرێمە جیاجیاکـان و دەسەڵاتە لۆکاڵیـەکاندا مۆردەکرێت.. ئەمەش مانای ئەوە ناگەیەنێت کە هەر ناوچەیـەك یـاخود شـارێك دایـە پـاڵ دەوڵــەت ئیــتر هـەموو مافـەکانی خـۆی لـە دەسـت دەدات و وازی لێدێنێت بۆ دەوڵەت، بەڵکو بە پێی ئـەو ڕێکەوتنـە دەست بەرداری بەشێکی مافەکانی خۆی دەبێت بۆ قەوارەیـەکی لـە خـۆی گـەورەتر، مەبەسـت لەمـەش هێنانـە ئـاراو دامـەزراندنی دەزگـای دەوڵەتــە. ئـەو خەسڵەتەشــی دەوڵــەت لــە ســەرجەم گــروپ و دامەزراوەکانی تر جیادەکاتەوە، بوونی دەسەڵاتێکی خاوەن سەروەرییە.

دەوڵــەت بــەو پێیــەی ترۆپکــی دەســەڵاتە و لەســەرو هــەموو دامەزراوەکانەوەیـە، بــەرەنجامی یەکگرتنی نێوان هەرێم و شارە سەربەخۆکانە، بەڵام "ئاڵتۆسـیۆس" لـەم ڕووەوە پـێ لەسـەر یەکیـەتی نەتـەوەیی دەوڵـەت دادەگرێـت. کـاتێك بـاس لـە دەوڵـەتیش دەکـات وەك دامەزراوەیـەکی گرنـگ و تایبەت باسی دەکات کە جگە لە خۆی پێویستی بە کەسـی دیکـە نیـە. "ئاڵتۆسـیۆس" زۆر پـێ لەسـەر گرنگی ئەم تایبەتمەندیـەی دەوڵەت دادەگرێـت، بـۆ ئـەوەی لێیــەوە بگاتــە مەســەلەی ســەروەری کــە خەسڵەتێکە هەرگیز لە دەوڵەت جیا نابێتەوە.

لــەم ڕووەوە دەکرێــت بڵێــین کــە ئــەو قوتــابی "جـان بـودان"ە، بـەڵام جیـاوازی نێوانیـان لەوەدایـە کـــە "ئاڵتۆســـیۆس" گـــەل -بـــەو پێیـــەی قەوارەیـــەکی دەســـتەجەمعیە- بەســـەرچاوەی دەسەڵات و سەروەری دەزانێت و ئەوە ڕەتدەکاتـەوە ســـەرۆکی دەوڵـــەت ســـەرچاوەی ســـەروەری و دەسەڵات بێت.

پادشا ملکەچی یاسایە و نوێنەرێکە کە پابەندە بـە پـەیمان و ڕێکەوتنێکـەوە. بـەمجۆرە دەبینـین "ئاڵتۆسـیۆس" هـەموو دەسـەڵاتێکی تاکـە کەسـی ڕەتدەکاتـەوە و پێی وایە میللـەت بـە هیـچ بەهانـەو بروبیانویـەك نـاتوانێت دەسـتبەرداری دەسـەڵات و ســەروەری بێــت یــان سازشــی لەســـەر بکــات و بیداتـە کەسـێکی دی. لەبەرئـەوەی هــەر کــاتێك گــەل دەســتبەرداری ئــەوەبوو، دەوڵــەت بوونـــی نــامێنێت (چونکـــە زیندویـــەتی و دڵ و ژیـــانی دەدۆڕێنێت)[2].

هــەرچی ئــەو دەسەڵاتەشــە کــە فەرمانبــەرە ئیداریـــەکان یـــاخود دەســـتەی حوکمڕانـــی مومارەسەی دەکەن، لە یاسای دەوڵەتەوە سەرچاوە دەگرێت.

دووەمین پەیمان لای "ئاڵتۆسیۆس"، لە نێوان گەل و دەستەی حوکمڕانیدا دەبەسترێت و مەبەست لێـی بـەڕێوەبردنی کاروبـاری کۆمەڵگەیـە. بۆیــە هــەرکاتێك حکومــەت ئەرکــەکانی خــۆی بەرامبــەر هاوڵاتیـــان جێبـــەجێ نـــەکرد و پابـــەندی ڕێکەوتنامەکـەی نێـوان نـەبوو، ئـەوا لـەو کاتــەدا دەســەڵاتێکی لــێ دەســەندرێتەوەو دەدرێتــەوە بــە میللەت.

تیۆریـــای ئـــەو ســـەبارەت بـــە دەســـەڵات و ســـەروەری، لـــەو کاتـــەدا ڕونـــترین و ئاشـــکراتین تیۆرییەك بوو دەربارەی سەروەری و دەسەڵاتی گەل.

تەنانـەت لـە تیۆریەکـەی "جـان بـودان"یـش ڕەوانـتر بـوو، لەبـەر ئـەوەی "بـودان" جیـاوازی لـە نێـوان سەروەری و فەرمانڕەوای خـاوەن دەسـەڵات یـاخود پادشـادا نـەکردبوو. ئـەم تێکەڵکردنـەش کـەلێنی کردبووە تیۆریاکەی "بودان"، چونکە لە کاتێکدا ئەو پێـی وابـوو دەسـەڵات ڕەهـا و بـێ سـنورە، بـەڵام دەستەوسـتان بـوو لــەوەی تێکســتە یاســاییە ســەرەکیەکانی دەوڵــەت بگۆڕێــت وەك دەســتوری مێژوویی.

لەســەروبەندی تێگەیشــتنی "ئاڵتۆســیۆس" سـەبارەت بـە دروسـتبونی دەوڵـەت و ئـەو پێکهاتـە پــەیمان ئــامێزەی نێــوان لایەنــە جیاجیاکــانی و هـەروەها تیۆریاکـەی لـە مـەڕ دەسەڵات و سـەروەری، دان بەوەشــدا دەنێــت کــە میللــەت مــافی بــەگژا چونـەوەی ستەمکاری هەیە و داکۆکیشـی لـەم مافـە کـردووە، بـەڵام ئـەو مـافی بەگژاچونـەوەی زوڵـم و ستەمکاری بە تاکە کـەس ڕەوا نەدەبینی، بەڵکو بـە مافی دەستەیەك لەو دەسەڵاتدارە گشتیانەی دەزانی کە ناوی نابوون (*Ephors*)، ئەمانـەیش ئەو کەسانەن کــە کۆمەڵگــە بــۆ پاراســتنی مافــەکانی خــۆی دەستنیشـــانیان دەکـــات. ئـــەم بۆچونـــەی "ئاڵتۆسیۆس"یش گونجاوو لـە جێـی خۆیـدا بـوو، چونکە ئەو پێی وابوو دەوڵەت بەرەنجامی یەکگرتنی نێوان شـار و هەرێمە جیاجیاکانـەو هەریەکـەیان بـە پێـی ڕێکـەوتنێك، دەسـت بـەرداری بـە شـێك لـە مافەکانی خۆیان بوون بۆ دەوڵەت تا کاروبارەکانیان بـۆ بەڕێوەبـەرێت، بـەڵام گـەر دەوڵـەت لـەم کـارەیدا سـەرکەوتوو نەبوو نـەیتوانی ئەرکـەکانی سەرشـانی ڕاپـەڕێنێ یـاخود حوکمڕانــەکان خــراپ مامەڵــەیان لەگــەل کۆمــەڵدا کــرد، ئــەوا لــەو کاتــەدا مــافی دەسەڵاتدارە گشتیەکانی هەرێمەکانە (*Ephors*) کە بە گژ ستەمکاری دەسەڵاتدا بچینەوە.

تیـۆری سیاسـی "ئاڵتۆسـیۆس" کـە لەسـەر بنەمای فیدرالیەت دامەزرابوو، دەریدەخات کە ئەو لە ژێر چ کاریگەریەکی توندی ئەو سستمە سیاسیەدا بووە کە لە ولاتێکی وەك هۆڵەندادا هەبووە. وەکو پێشتریش باسمانکرد ئەو ماوەیەکی زۆر لە (*Emden*) ژیاوەو، لەوێشدا حکومەتێکی مەرکەزی هەبووە کە لە یەکگرتنی نێوان چەند هەرێم و ناوچەیەك پێکهاتبوو، سەرەڕای جیاوازیشیان لە رووی زمان و ئایین و هەستی نەتەوایەتیەوە. ئەم حکومەتە مەرکەزیە ماف و ئازادیەکی زۆری بە هەرێمەکان ڕەوا دەبینی و پێی وابوو کۆبوونەوەو یەکگرتنی شار و هەرێمەکان بە پێی پەیمانێك بناغە و سەرچاوەی دروستبونی دەوڵەتە، ئەمەش تەواو پێچەوانەی ئەو تیۆریایەیە کە لەسەر یەکگرتنی تاکەکەسان دروست بووە، وەکی لە فەرەنسا و ئنگلستاندا لە ئارادا بوو. ئەم دوو ولاتەش لە سەدەی شانزە و حەڤدەدا، مەڵبەندی فیکری سیاسی بوون لە ئەوروپادا. لەبەرئەوە نوسەرانی سیاسی لەم ولاتانەدا تیۆریاکانی "ئاڵتۆسیۆس" یان فەرامۆشکرد، سەرەڕای ڕونی و ئاشکرایی و هەروەها خەسڵەتە ئیجابیە زۆر و زەوەندەکانی.

**کۆتایی:**

فیکری سیاسی "ئاڵتۆسیۆس" بە توندی لە ژێر کاریگەری بارودۆخی ئەڵمانیادا بوو کە تایبەتمەندیەکی ناوچەیی و هەرێمایەتی هەبوو، هەروەها دەسەلاتە لۆکاڵیەکانیش زۆر وابەستەی سەربەخۆیی و خۆڕێبەرێکردن بوون، هەموو ئەمانەش هەڕەشەیەکی جدی بوون بۆ سەر گەشەکردنی دەوڵەتی نەتەوەیی لەو ولاتەدا. لاوازی تیۆریا سیاسیەکەی "ئاڵتۆسیۆس"یش لەوەدایە کە لەلایەك بەرگری لە خۆڕێبەی و سەربەخۆیی دەکات: (بە تایبەتی سەربەخۆیی شارە گەورەکان) و لە لایەکی دیکەشەوە دەیەوێت پارێزگاری لە جەوهەری یەکیەتی و یەکگرتوویی چەمکی دەوڵەت بکات، ئەوەشی چارەسەری ئەم ناکۆکیە تیوریە دەکات، سستمی فیدرالیە کە دەخوازێت لە نێوان هەرێمە جیاجیاکاندا ئەرك و دەسەلاتەکان دیاری بکات.

"ئاڵتۆسیۆس" لەژێر کاریگەری کالڤینیەتدا بوو، تەنانەت وەکی دواین پرۆتستانی نەیاری سستمی پاشایەتی ناونوس دەکرێت.. ئەگەرچی هەستێکی قوڵی ئایینی هەبوو، هاوکات بەڵگەی زۆریشی بە ئینجیل دەهێنایەوە، بەلام خوازیاری ئەوەش بوو بونیادی کۆمەڵگە و دەوڵەتێك دابڕێژێت کە لەگەل ئەقڵدا بگونجێت.

گرنگترین دەسکەوت و بەشداریکردنەکانی "ئاڵتۆسیۆس" لەسەر ئاستی فیکری سیاسی بریتین لە : دەسەلاتی گەل کە لەسەرو دەسەلاتی پادشاوەیە، هەروەها بیرۆکەی هاوپەیمانێتی و ڕۆڵی فەرمانڕەوایان و پاساودانەوەی بەگژا چونەوەی ستەمکاری و دواجاریش فیدرالیزم (*Federaliste*)، بەلام دیارترین بۆچونێك لە سستمی سیاسی "ئاڵتۆسیۆس"دا، لە بانگەشە کردنیدا بوو بۆ (*orporatisme*) کە بە شێوەیەکی تایبەتی ڕەگ و ڕیشەیەکی ئەڵمانیایی هەبوو.

دواجار لەو پرسیارە گرنگانەی ڕووبەڕووی فیکری سیاسی "ئاڵتۆسیۆس" دەبنەوە، ئەوەیە کە ئاخۆ دەکرێت ئەو دەوڵەتەی بەپێی پەیمانێك لە نێوان شاروناوچەکاندا دێتە ئارا نەك لە نێوان تاکە کەسەکاندا، بە دەوڵەتێکی دیموکراسی وەسف

بکرێـــــت؟ یـــــا خود ئــــــەو دیموکراســـــــیە مەرکەزیــەی "ئاڵتۆسـیۆس" بەشـداری لـە هێنانــە ئـارایدا کـرد، بــە سســتمێکی نمونــەیی و دەگمــەن دابنرێت؟

## پەراوێز

*1*–جــان توشـــار: تــأریخ الفکــر السیاســی – ترجمــة : د. علــی مقلــد – الــدار العالمیــة للطباعــة و النشــر و التوزیــع، بــیروت – الطبعــة الثانیــة، *1983*، ص *237*.

*2*–جان جاك شوفالییه: تـأریخ الفکـر السیاسـی مـن المدینه الدوله الی الدوله القومیه، ص *310*.

## سەرچاوە

الدکتـور موسـی ابراهیـم: معـالم الفکـر السیاسـی الحدیث و المعاصر – بیروت، الطبعة الاولی، *1994*.

# کۆمەڵناسیی سیاسی

داریووش ئاشووری
لە فارسییەوە: عەدنان حەسەنپوور

کۆمەڵناسیی سیاسی لقێکی کۆمەڵناسییە کە لەسەر هۆکارەکان و ئاکامەکانی چۆنێتی دابەشبوونی دەسەڵات لە کۆمەڵگاکاندا یان لە نێوان کۆمەڵگاکاندا ڕائەوەستێت. هەروەها باسی ئەو ململانێ سیاسی و کۆمەڵایەتییانە ئەکات کە ئەبنە هۆی هەندێ گۆڕانکاری لە چۆنیەتیی دابەشبوونی دەسەڵاتدا. هەر چەشنە خوێندنەوەیەك دەربارەی پرۆسە (*Process*) سیاسییەکان، یەکسەر دەمانباتەوە بۆ سەر چەمکی "دەوڵەت" کە وەکو ماکس ڤێبێر "*Max weber*" دەبێژێت، بریتییە لە "پاوانکردنی بەکارهێنانی زەبروزەنگ لە چوارچێوەیەکی دیاریکراودا". "زانستی سیاسەت"ی باڵا زۆربەی سەرنجی خۆی ئەخاتە سەر دەزگای حکوومەت و چۆنێتی بەڕێوەبردنی کاروباری گشتی، بەڵام لە ڕوانگەی کۆمەڵناسییەوە توێژینەوەی دیاردە سیاسییەکان بریتییە لە خوێندنەوەی پێوەندییە دوولایەنییەکانی سیاسەت و پێکهاتەی کۆمەڵایەتی یان پێوەندییە دوولایەنییەکانی پرۆسە سیاسی و کۆمەڵایەتییەکان. زانستی سیاسیی نوێ زێدەتر سەرنج ئەداتە ئەو کاروکردەوانەی کە ئامانجیان بەشداریکردنە لە دەسەڵات یان هەوڵدان بۆ نفوزکردنە نێو دەسەڵات -جا ئەمە بۆ نفووز لەناو دەوڵەتەکاندا بێت یان لەناو گرووپ و ڕێکخراوەکانی نێو دەوڵەتدا.

کەسێك کە سەرقاڵی چالاکیی سیاسیە، یان بۆ بەدەستهێنانی دەسەڵات لەبەر خودی دەسەڵات تێدەکۆشێت یان دەخوازێت بیکاتە ئامرازێك بۆ بەرگری لە بیروڕا و بەرژەوەندییە ئایدیۆلۆژیك، ئابووریەکان یان هەر مەبەستێکی دیکەی خۆی. لە هەمان کاتدا کردەوەی سیاسی لەناو نەزمێکدا بەڕێوە ئەچێت و قبووڵکردنی ڕێساکانی ئەو نەزمەیش دەگرێتە خۆی، ئەمە بۆ ئەو کەسانە ئەبێت کە لە گەمەی سیاسەتدا بە شێوەی شۆڕشگێڕانە کاردەکەن. بونیادە سیاسییەکان، کە تا ڕادەیەك نەگۆڕن، پێویستییەك دەهێننە ئاراوە، ئەویش

ئەوەیە کە ئەبێ هەمیشە لە نێوان کاربەدەستە سیاسییەکاندا -تەنانەت ئەو کاتەیش کە بیروڕای جیاوازیان هەیە، لەسەر کۆمەڵێك ڕێسا و پێوانەی گشتی ڕێککەوتن و تەبایی هەبێت. کاتێك کە چین یان گروپێکی گرنگی جەماوەر ڕێساکانی گەمە لە بونیادێکی سەقامگیردا پەسەند نەکەن، ئەتوانین بێژین ئەو بونیادە کەوتۆتە قۆناغی شۆڕشەوە یان پێداویستییەکانی شۆڕشی تیا درووست بووە.

جیاوازی و ناتەبایی و هەروەها هاودەنگی و هەبوونی ڕێگاچارەسەریی گونجاو بۆ چارەسەرکردنی کێشە ناوخۆییەکانی گرووپ، بناغەی پرۆسە سیاسییەکانە و کۆمەڵناسانی سیاسی دەبێ سەرقاڵی لێکۆڵینەوەی ئەم دوو ڕەهەندە سەرەکییە بن. کۆمەڵناسێك کە تەنیا نەزم و هاودەنگی لەبەرچاو بگرێت، ناتوانێت ڕاستیی ئەو ململانێ سیاسییانە وا لەناو هەر سیستەمێکی سیاسیدا هەیە، دەربخات. بە هەمان شێوە ئەگەر ڕوانگەیەك تەنیا سەرنج لە ناتەبایی و ململانێ بدات، ناتوانێت ئەو هاوسەنگییەی کە ئەبێتە هۆی سەقامگیربوونی ڕێژەیی سیستەمە سیاسییەکان، بناسێت. هەربۆیە پێویستە کۆمەڵناسی سیاسیی سەرنج بداتە هەموویان: تەبایی/ ناتەبایی و نەزم/ ململانێ. ئەڵبەت لەوانەیە توێژەرێك لە توێژینەوەیەکی تایبەتدا تەنیا سەرنج لە یەکێك لەم ڕەهەندە سەرەکییانە بدات، بەڵام سەرنجدان لە تاکە ڕەهەندێك، ئەبێتە هۆی لێکدانەوەگەلێکی هەڵە و نادرووستی ئایدیۆلۆژیی.

دەتوانین بڵێین کۆمەڵناسیی سیاسی تا ڕادەیەك کەم تەمەن و لاوە، هەرچەند کە ڕیشەی دەگەڕێتەوە بۆ بیریارانی سەدەی نۆزدەهەم وەکو کارل مارکس (*Karl Marx*) و ئالێکسی دێ تۆکڤیل (*Alexi de tocqueville*) و هەندێك لە بنەما تیۆریەکانی لە لایەن کۆمەڵناسانی سەدەی بیستەمەوە وەك ماکس ڤیبەر و ڕۆبەرت میشێلز و ئەمیل دۆرکهایم دارێژراوە. لە کاتێکدا کە زانستی سیاسی بە تەواوەتی لە بواری سیاسەتدا چەقی بەستبوو، کۆمەڵناسیی سیاسی پێی وابوو کە بۆ باش تێگەیشتن لە پرۆسەی سیاسی ئەبێ پرسە سیاسییەکان لە پێوەندی لەتەك هەموو پێکهاتەی کۆمەڵگادا بخوێنینەوە. لە دەرئەنجامی ئەمەدا پێوەندیی نێوان پۆلێنبەندیی کۆمەڵایەتی و هۆکارە کۆمەڵایەتییەکانی دیکە لەگەڵ کرداری سیاسیدا کەوتە بەر سەرنجی کۆمەڵناسانی سیاسەت.

ئەم کۆمەڵناسانە لەسەر ئەم ڕایە جەختیان ئەکرد کە بۆ لێکۆڵینەوەی کردارە سیاسییەکان -بۆ نموونە دەنگدان- دەبێ بە گەڕانەوە بۆ هۆکارە ناسیاسییەکان، وەك: "بەکۆمەڵایەتی بوون" (*Socialization*)ی لاوان یان بەها ڕەسمی و ناڕەسمییەکانی کردار لە کۆمەڵگاکاندا، یان بە گەڕانەوە بۆ ئەو سیستەمە بڕوایی و ئەو ئایدیۆلۆژیانە کە ڕۆڵی جۆراوجۆر ئەبەخشنە یاریچیانی سیاسەت، پرۆسەکە شیبکرێتەوە.

جەختکردن لەسەر پێوەندیی دوولایەنەی سیاسەت بە پانتاییە کۆمەڵایەتییەکەیەوە، ئاسۆی شیکردنەوەی کرداری سیاسیی فراوانتر کرد. لە ڕوانگەی کۆمەڵناسییەوە ئیدی ناتوانین ئەو پێناسەیە پەسەند بکەین کە تیۆری کلاسیکی دیموکراسی بۆ هاوولاتیی جۆری ئایدیال (*Ideal type*) ئەیخستە بەردەست. بە پێی ئەم بیرۆکە کۆنە، هەر هاولاتییەك خاوەنی بیروبڕواگەلێکە یا ئەبێ ببێت، واتە ئەبێ ڕوانگەیەکی دیاریکراوی -کە لە

کـاتی باسـکردندا بتوانـرێ بـەرگریی لێ بکرێـت- سـەبارەت بـە پێداویسـتییەکانی وڵات و چۆنیـەتیی بـەڕێوەبردنی و هــەروەها ئەوانــەی کــە ئــەبێ دەسەڵاتدارێتی بخرێتە ئەستۆیان، هەبێت. بەڵام بە ڕای کۆمەڵناسانی سیاسـەت تەنانـەت تـێڕوانینێکی ســـەرپێیی بۆئـــەوەی کـــە هەنووکـــە لـــە دیموکراســـییەکاندا بـــە چ جۆرێـــك کاروبـــارە سیاسـییەکان یـەك ئـەخرێن و بیروبڕواکـان چـۆن دروسـت دەبـن و لـە قـاڵبی بڕیـارێکی سیاسـیدا دەرئەکەون، بۆمان دەرئەخات کـە ئـەم گریمانەیـە - تەنانـەت تـا ڕادەیـەکی کـەمیش- ڕاسـت نییـە. بیروبڕوای سیاسیی خەڵك لە ڕێگای خوێندنەوەیەکی خوێن سـاردانەوە لـە چۆڵـەوانیدا بەدەسـت نایـەت، بەڵکو بەرهەمی چالاکیی بە کۆمەڵ و دەستەجەمعیی مرۆڤەکانـە لـە "جڤـات" گـەلێکدا کـە زۆربـەیان بـە شێوەی ڕەسمی یان ناڕەسمی سیاسی نین. خێزان، قوتابخانە،دراوسێیەتی و تاقمی هاوکایە کەسایەتیی منـداڵ قاڵـبڕێژی دەکـەن و فۆرمـی پـێ ئـەدەن. لـەم گرووپانەدایە کە منداڵ فێری ئەوە ئەبێت خۆی لە پێوەنـدی لەتـەك دونیـای دەوروبـەریدا بناسـێت. دیدوبۆچوونـەکان، بـەهاکان و هـەروەها بـیروبڕوای سیاسیی ئەو هەر لەم پێوەندییە سەرەتاییانە لەگەڵ کەسانی تردا -کە بۆ ئەو بایـەخدارن- چێ دەبێت. بە واتایـەکی دی "بەکۆمەڵایـەتی بـوون"ی سیاسـی هەر لە بێشکەوە دەست پێدەکات. بۆ نموونـە مـەیلی تاکەکەس لە پێوەندییە شەخسییەکانیدا بۆ نواندنی زەبروزەنگ یان هێمنایەتی و تەساهول، لە سەردەمی منداڵییەوە سەرچاوە دەگرێت کە دواتر لە تێڕوانینی سیاسیی ئەودا ڕەنگ ئەداتەوە.

لەگەڵ هەمووی ئەمانەشدا، ئەگەر نەمانەوێت بە تـەواوەتی و بێ هیچ پرسیارێك تەسلیمی ئەم ڕایـە بـین، ئـەبێ ئەمـە زیادکـەین کـە هـەندێ لـە دیـد و بۆچوونـەکان و بـەهاکان لـە منداڵیـدا و لـە قۆناغـە سـەرەتاییەکانی ژیاندا دائـەڕێژرێت و لـە سـاڵەکانی دواتـری ژیـاندا سـەرلەنوێ قاڵـبڕێژی دەکرێنـەوە. هەڵوێسـتی سیاسـی تـەنیا لـە ڕێـی ئـەو جڤاتـە سیاسـییانەوە وا مـرۆڤ گرێدراویانـە نایەتـە چـێ بوون، بەڵکو هـەموو جـۆرە گرووپێـك کـە مـرۆڤ بـە درێژایـی ژیـانی بـە شـێوەیەك لەگـەڵیان پێوەنـدی دەگرێـت -وەکـو جڤاتگـەلی پیشـەیی، پەیوەندییـە ئاینی و چینایـەتی و ئەتنیکی (*Ethnic*) و هتد- لـە ئاسـتگەلێکی جیـاوازدا لەسـەر ئـەم ڕەوتـە کاریگەرێتیان هەیە. کۆمەڵناسیی پێی وایە کە ئەبێ هـەموو ئـەم هۆکارانـە لەبەرچاو بگرین تاکو بتوانـین تێگەیشتنێکی تەواو گونجاومان بۆ کرداری سیاسی هـەبێت. زانسـتی سیاسـەتی تـەقلیدی و تیۆریـی کلاسیکی دیموکراسی ناوەڕۆکێکی تەسکیان هەیـە، هـەر بۆیـە نـاتوانن بـە باشـی باسـی ئـەو پرۆسـە کۆمەڵایەتییـە چـەند ڕەهەندییانـە بکـەن کـە ڕێنمـایی کـردەوە سیاسـییەکانن. جـا ئـەم کـردارە لـە لایـەن هاووڵاتیـە ئاسـاییەکانەوە بێـت یـان لـە لایـەن دەسـتەبژێرانی (*Elit*) ی بڕیـاردەر لـە سیاسەتدا.

کۆمەڵناسـیی سیاسـی وەك باسمـان کـرد، ئیدیعای ئەوەی هەیە کە بە بەراورد لەگەڵ ڕابردوودا تـێڕوانینێکی بـەربڵاوتری لـە بـارەی هۆکـارە دیاریکـەرەکانی پرۆسـە و کـردەوە سیاسـییەکاندا دەستەبەر کردووە. هەر لە سەرەتاوە کۆمەڵناسـیی سیاسـی لەگـەڵ بابەتەکـەی خۆیـدا بـە شـێوەیەکی جیـاواز ڕووبـەڕووی زانسـتی سیاسـی بـۆوە. ئـەم زانستە لە بەرانبەر ئەو زانستە کۆنەیەدا کە زێدەتر ماقووڵانە و جێکەوتوو بوو، ئاژاوەچی و هێرشبەر و ڕەخنەگر دەرکەوت. لە کاتێکدا کە زانستی سیاسەت زۆرتر تەسلیمی نـەزمی جڤات بـەرگریکردن بـوو لـە

دۆخی باو، کۆمەڵناسیی سیاسی -لانی کەم لە قۆناغی درووستبوونیدا -فرەتر سەرنجی ئەدایە ئەو هێزە ئاشکرایانە کە هۆکاری لێکشێوان و ململانێن لەناو سیستەمی سیاسیدا. هەروەها ئەیویست سەبارەت بە هێزە ئاژاوەگێڕ و شاردراوەکان لە ژێر سیستەمی سیاسیدا زانیاریی فراوانتر بەدەسەت بهێنێت. بە وتەی یەکێك لە کۆمەڵناسان: "زانستی سیاسەت حەزی لەوە بوو کە زانستی خوێندنەوەی "دەوڵەت" بێت، واتە سەرنجی ئەدایە کارکردە پۆزەتیڤەکانی ڕێکخراوە ڕامیارییەکان، لە حاڵێکدا کە کۆمەڵناسیی سیاسی زانستێکی "ڕادیکاڵ" بوو و فرەتر لەسەر کێشمەکێش و گۆڕانی کۆمەڵایەتی ئەوەستا و سەرنجی ئەخستە سەر کارکردە نهێنییەکان و ڕەهەندە ناڕەسمییەکان و کارکردی لێکپچڕانی (*Dysfunctional*) پرسە سیاسییەکان"[1]. ئەگەر بخوازین ئەم بابەتە سادە بکەینەوە ئەتوانین بێژین کە زانستی سیاسەت زۆرتر سەرنجی لە بەشی دیار و بەرچاوی کێوە سەهۆڵی سیاسەت ئەدا، لە کاتێکدا کە کۆمەڵناسیی سیاسی زۆربەی قورساییەکەی ئەخستە سەر بەشە نادیار و شاردراوەکەی[2].

لە سەدەی بیستەمدا لە ڕووی توێژینەوەی ئەزموونییەوە، کۆمەڵناسیی سیاسی لە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا زێدەتر لە هەموو شوێنێك بایەخی پێدراوە و بە قووڵی لەسەر کۆمەڵناسیی ئەوروپاییش شوێنەواری جێهێشتووە. بۆئەوەی کە جیاوازی تێڕوانینی زانستی سیاسەت و کۆمەڵناسیی سیاسی لە ڕوانگەی ئاراستەی جووڵەیانەوە ڕوونتر بێتەوە، خستنە بەردەستی نموونەگەلێك دەربارەی چۆنیەتی کاروباریان یارمەتیدەرێکی باشە. لە کاتێکدا کە لە سەرەتای سەدەی بیستەمدا هۆگرانی زانستی سیاسەت تێدەکۆشان ڕێگاکانی چالاك کردنی کاردانەوەی کارکردەکانی دەوڵەت و بەڕێوەبەرایەتیی کاروباری گشتی بدۆزنەوە، کۆمەڵناسانی سیاسی چاویان بڕیبووە مەسەلە گشتگیرەکانی بیرۆکراسی. بە گشتی مەبەستی ئەوان لە خوێندنەوەی بیرۆکراسی لە ڕێکخراوە دیموکراتییەکاندا.. هەموو یەکێتی و پارتە سیاسییەکان -ئەوە بوو دەری بخەن کە بە چ شێوەیەك شێوازی بۆرۆکراتیکی ڕێکخراوەکان واتە "ئامراز"، دەبێتە هۆی تێکچوونی "ئامانج" کە ئامانجیش پرۆسەی دیموکراسییە. ئەوان هەوڵ دەدەن دەری بخەن کە بەڕێوەبردنی بۆرۆکراتیك درووست کاتێك کە لە هەموو وەختێ کارامەتر بێت، ڕوودەکاتە زۆرەملێ و داسەپاندن و لە کاتێکدا کە بۆرۆکراسی کەمتر کارامە بێت، ئەم تایبەتمەندییانەی گەلێك کەمتر تێدا بەدی ئەکرێت.

کۆمەڵناسان هەوڵیان دەدا دەری بخەن کە هۆکارە نائیداری و ناڕەسمییە ئابوورییەکان دەتوانن دەست لە پرۆسەی دیموکراتییەوە بدەن، هەروەها دەیانویست نیشانی بدەن هۆکارگەلێك کە بە ڕواڵەت سیاسی نین چ ئاکامگەلێکی سیاسی دەهێننە ئاراوە. ئەوان هەوڵیان دەدا تاکو ڕوونی بکەنەوە چۆن ڕێکخراوە ڕامیارییەکان، جڤاتگەلی ئەتنیکی، گرووپ و دەستەکانی کاری و پیشەیی، یان زلهێزانی ناوچەیەك (ئەهلی)، ڕەوتە ڕەسمییەکانی بڕیاردانی سیاسی دەگۆڕن.

پێش ئەم هەوڵدانانە، هەمووان ئەوەیان قبووڵ کردبوو کە پرۆسە سیاسییەکانی دیموکراسی لە مۆدێلێکەوە کە جان لاك و جێنشینانی دایانڕشتبوو، سەرچاوە دەگرێت. بە پێچەوانەوە کۆمەڵناسیی سیاسی سەرنجی دایە جیاوازی و مەودای قووڵی نێوان بڕیاردانی "دەستەبژێرانی

سیاسی" و جەماوەری بندەست، یان نێوان چینە دەسەڵاتدار و ژێردەستەکان، زۆربەی کۆمەڵناسانی سیاسەت پێیان وابوو کە زانستی سوننەتیی سیاسەت تەنیا سەیری بەرزایی لووتکەی کێوە سەهۆڵەکەی دەکرد و لە هێزە نادیارە ژێر وێنەکان بێئاگا بوو و بایەخی نەدەدایە ئەو هێزانەی وا دەستیان ئەخستە نێو پرسی "بەشداربوونی یەکسانی هەموو هاوڵاتیان" و بە لاڕێیاندا دەبرد (دەیشزانین کە ئەم بابەتە خواست و ئامانجی دیموکراسی بوو). کۆمەڵناسان بە توندی گرژی و دژکردەوەیان نواند لە هەمبەر کاریگەریێتیی بەرژەوەندییە چەسپاوەکاندا و هەروەها ئەو ئامرازانەی کە بندەستان و سەردەستان -خوازراو یا نەخوازراو- بەکاریان ئەهێنن تا لە دەزگای ڕەسمیی دیموکراسیدا بۆ گەیشتن بە ئامانجە تایبەتییەکانی خۆیان کەڵك وەرگرن[3].

**سەرهەڵدانی کۆمەڵناسیی سیاسی:**

هەرچەند خوێندنەوە و توێژینەوەی بابەتەکانی سیاسەت دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی ئەرەستوو، بەڵام کۆمەڵناسی، کەم تا زۆر لقێکی تازەیە و دەسپێك و سەرەتای لەو کاتەوەیە کە توێژەران، کرداری "کۆمەڵایەتی" یان لە کرداری "سیاسی" جیا کردەوە و ئەم جیاکردنەوەیە لە مێژووی ئەندێشەدا تەمەنێکی درێژی ئەوتۆی نییە. پێش ئەمە ئەو نووسەرانەی سەبارەت بە سیاسەت و دەوڵەت شتیان دەنووسی، هیچ هۆیەکیان بەدی نەئەکرد تاکو بابەتەکەی خۆیان بە خوێندنەوەی "کۆمەڵایەتی" نەزانن. لە ڕاستیدا ئەم جیاکردنەوەیە لە مێژووی ئەندێشەی ئەورووپاییدا لەو وەختەوە دەست پێدەکات کە لەتەك سەرهەڵدانی دیموکراسی و شێوازە تازەکانی دەوڵەتدا، بابەتگەلێك کە بە تایبەت بە "سیاسی" ئەناسران، کەوتنە گۆڕەپانی ژیانی مرۆڤەوە کە مێژووی ئەم دیاردەیە نەختێ زیاتر لە دەسە و نیوێکە.

مافی دەنگدانی گشتی، بۆرۆکراسییە گەورەکان و پارتە جەماوەرییەکان، هەموویان خەسڵەتگەلێکن کە لەم دواییانەدا پەیدا بوون. پێویستە وەبیر بهێنینەوە کە مافی دەنگدانی گشتی (واتە ئەوەی کە هەموو کەسانی ئاقڵ و باڵغ- چ ژن و چ پیاو مافی یەك دەنگیان لە هەڵبژاردندا هەبێت) لە ئینگلستاندا لە *1929*وە، لە فەرەنسەدا لە *1945*ەوە و لە بێلژیکدا لە *1949*وە باوە. لە فەرانسەدا بە درێژایی نیوەی دووهەمی سەدەی نۆزدەهەم پیاوان مافی دەنگدانی گشتیان هەبوو، بەڵام هیچ کەس لەسەر شێوازی بەڕێوەبردنی دەنگدان توێژینەوەیەکی چڕوپڕی ئەنجام نەدا و تەنانەت پرۆدۆن (*Proudhon*) کە تا سەردەمی کۆمۆنی پاریس لە رووی تیۆرییەوە بە نفووزترین کەسایەتیی ڕادیکاڵ لە فەرانسەدا دەژمێررا، هەڵبژاردنی تەنیا بە "ئامرازێك بۆ گوشار خستنە سەر خەڵك بۆ درۆکردن" ئەزانی. خوێندنەوەکەی ئالێکسی دێ تۆکڤیل لەژێر سەردێری دیمۆکراسی لە ئامریکادا، کە لە *1930*دا نووسراوە، بە تاقە پێشەنگی ئەو خوێندنەوانە دێتە ئەژمار کە لە سەدەی بیستەمدا دەربارەی "کۆمەڵگای جەماوەری" بە ئەنجام گەیەندراون.

لێکۆڵینەوە سەبارەت بە پارتە سیاسییەکانیش هەر بەم شێوەیەیە. دوو بەرهەمی کلاسیك لەم بوارەدا یەکێك کتێبەکەی "ئۆستروٚ گۆرسکی" (*Osterogorsky*) بە ناوی دیموکراسی و ڕێکخستنی پارتە سیاسییەکان و ئەوی تر کتێبەکەی "میشێلز" لەژێر ناوی پارتە سیاسییەکاندا لە سەرەتای سەدەی بیستەمدا نووسراون و بابەتی بۆرۆکراسی

لەتەك توێژینەوەكانی ماكس ڤێبێردا بوو كە بوو بە بابەتی لێكۆڵینەوە.

## جیاكردنـەوەی كۆمـەڵگا لـە دەوڵـەت لـە هـزری سیاسیدا:

لـە مێـژووی ئەندێشـەی ئـەوروپاییدا، لـە ناوەڕاستی سەدەی سێزدەهەم بەملاوە، سیاسـەتی ئەرەستو كاریگەرێتییەكی فراوانی هەبوو و بەشێكی زۆری بنەما گشتییەكانی (وەكو ئەوەی كە چینێكی مامنـاوەندیی بـەربڵاو چاكـترین گەرەنتییـە بـۆ پشتگیری لە شۆڕش) تا ئێستا نفووزێكی بەردەوامی هەبووە.

بەڵام ئەرەستو جیاوازیی لە نێوان پێوەندیی كۆمەڵایەتی و سیاسی نەدەكرد. لە ئەندێشەی ئەودا دژایەتی قووڵ و سەرەكی لە نێوان ژیانی شەخسی یـان خـێزانی لـە بەرانبـەر ژیـانی سیاسـی- كۆمەڵایەتیدایە، نەك لە نێوان كۆمەڵگا و دەوڵـەتدا. بەڵام هاتنە پێشی ئەم بابەتە كە پێوەندیی كۆمەڵگا و دەوڵەت چۆنە، لەو كاتەوەیە كە لەم سەدە تازانەدا تێفكرین لەسەر "دەوڵـەت" دەستی پێكرد و ئـەم پرسیارە هاتـە گـۆڕێ كـە كـام یـەكیان ئـەوی دیـان دەستنیشان دەكات؟ یـا دەوڵـەت یـا كۆمـەڵگا؟ وەك جاروبار لە ئەندێشـەی ماكیاولیشـدا دەرئەكـەوێت، ئەو دەوڵەت (یان سیاسەتمەداری ئەمیر)ە كە شێوە و ناوەڕۆكی دەوڵـەت دیـاری دەكات. ئەڵبـەت وەڵامـی دروست ئەمەیە: لە نێوان ئەم دووانەدا پێوەندییەكی دوولایەنـــە هەیـــە و لەوانەیـــە مۆنتێســـكیۆ (*Montesquieu 1689-1755*) یەكـەمین نووسـەری بەرجەستە بێت كە سەرنج ئەداتە ئەم خاڵە، هەرچەند لە بەرهەمەكانی "ژان بوودێن" (*Gean bodin*)یشدا ئاماژەگەلێك بۆ ئەم بابەتە ئەبینرێت. مۆنتێسكیۆ پەنجـەی خسـتە سـەر ئـەوەی كـە هۆكـارە كۆمەڵایەتییەكان كار ئەكەنە سەر ناوەڕۆكی دەوڵەت، هـەروەها ئـەو دەسـەڵاتدارانەی ئاگـاداریی هۆكـارە كۆمەڵایەتییـەكانن دەتوانـن كۆمـەڵگا بگـۆڕن. بـەڵام تیۆریسـینە سـەرەتاییەكان زۆرتـر سـەرقاڵی پرسـی دەسـەڵاتدارێتی (حـاكمیت) بـوون. ئـەوان فرەتـر دەیانویست هۆیـەك بۆ شـێوە دەسـەڵاتدارێتیی ڕەوا بدۆزنەوە و بایەخێكی ئەوتۆیان نەئەدایە ئەو هۆكار و هۆگرانەی كە لە كۆمەڵگای مەدەنیدا كاریەدەستن. بۆ وێنە هابز كۆمەڵناسێكی سیاسەت-بەو واتایەی كـە ئەمڕۆكـە دەیناسـین- نییـە، بـەڵكو "پـەیمانی كۆمەڵایـەتی"ی ئـەو مۆدێلێكـی مێژووییـە نـەك گریمانەیەكی كۆمەڵناسانە.

ئەو جیاوازییـەی كە "ڕۆسـۆ" دەیخاتـە نێـوان مرۆڤ "لە دۆخی سرووشتیدا" (كە خاوەن "مافی سروشتی"یە) و مرۆڤ وەكو هـاوڵاتی (گوێڕایـەڵی دەوڵـەت)، هەنگاوێكە بەرەو جیاكردنەوەی كۆمـەڵگا لـە دەوڵـەت، بـەڵام هێشـتا هـەر بناغەكـەی گریمانـە فەلسـەفییەكان و توێژینـەوەی میتـافیزیكی كۆمەڵگایـە، نـەك جیاكردنەوەیـەكی كۆمەڵناسـانە. ڕۆسـۆ بـە پێچەوانـەی ئەرەسـتۆ و تومـاس ئاكویناسەوە -كە دەوڵەت بە گشتێتییەك ئەزانن كە بنـەمای كۆمـەڵگای مەدەنییـە و لـە خۆیـدا جێـی دەكاتـەوە- دەوڵـەت بـە ڕێكخراوێكـی دەسـتكرد ئەزانێت، نـەك سرووشتی، كە بنەماكەی "پـەیمانی كۆمەڵایـەتی"یە. هەر ئـەم جیـاوازی خسـتنە نێـوان ژیـانی سرووشـتی (كـە زیـاتر ژیـانێكی سـاكاری سـەرەتاییە لـە خـێزانێكی باوكسـالاردا) و ژیـان لـە كۆمـەڵگای مـەدەنی (سیاسـی)دا، هەنگاوێكـە بـەرەو جیاكردنـــەوەی لایەنـــە "كۆمەڵایـــەتی" و "سیاسیەكانی" ژیانی كۆمەڵایەتی.

سـەن سـیمۆن (*Saint simon 1825-1760*) هزرڤانی كۆمەڵایـەتیی فەرانسە، كە لـە پێشـەنگانی

ئەندێشـەی سۆسـیالیزمە. یەکـەمین کـەس بـوو کـە پێکهاتـەی ئـابووریی کۆمـەڵگای –بـە مانایـەك– بـە بناغـەی شـێوەی دەوڵـەتزانی. ئـەو بـە پێچەوانـەی مارکسـەوە هـەموو دەزگـا کۆمەڵایەتییـەکانی بـە بەرهـەمی ئەندێشـەکان ئـەزانی، پێـی وابـوو کـە ئـابووری تاقـە بنـەمای سیاسـەتە. بـەڵام دژایـەتیی نێوان دوو چەمکی "کۆمەڵایـەتی" و "سیاسـی" لـە نووسـراوەکانی سـەن سـیمۆندا کـەم تـا زۆر هـەمان ئاسـتی جیـاوازی خسـتنە نێـوان دوو چـەمکی "حکومـەتکردن" (*government*) و "بەڕێوەبەرایـەتی" (*administration*)یـە کـە دواتـر بـە شـێوەیەکی بـەرفراوانتر لـە ئەندێشـەکانی ئێنگێلـس و لینینـدا دەرکەوت.

(سەن سیمۆن) لە بری ئەوەی ڕوونی بکاتەوە کە کاروباری حکومەت و سیاسەت چ پێوەندییەکیان بە کاروباری بەڕێوەبەرایەتی و کۆمەڵایەتییەوە هەیە، هـەوڵ دەدا کـە سیاسـەت لـە دەسـەڵاتدارێتی جیـا بکاتەوە. کۆمەڵگای ئایدیالی سەن سیمۆن بریتییە لە زنجیرەیەك لە پسپۆڕان. ئەو خوازیاری کۆمەڵگایەکە کە تێیدا قبووڵکردن و پێڕەوی بە زۆرەملێ نەبێت.

جیاوازییـەکیش کـە ئانارشیسـتەکان دەیخەنـە نێوان کۆمەڵگا و دەوڵەت هەمان جیاوازییە کە سـەن سیمۆن دایدەنێت. تامس پین (*Thomas paine 1809-1727*) دەبێژێـت: کۆمـەڵگا بەرهـەمی پێویسـتییەکانمانە و دەوڵـەت بەرهـەمی خراپییـەکانمان. ویلیام گـادوین (*W. Godwin 1756-1836*) ئەڵێت: دەسەڵاتی سیاسی "ئەو ماشینە کوێر و کەڕەیە کە تاقە هۆکاری هەمیشـەیی خراپییـەکانی مرۆڤایـەتی بـووە". بـەڵام ئـەو شـتەی کـە ئانارشیستەکان بەم جیاوازییە زیادی دەکەن هـەمان ئەفسانەی "بێتـاوانیی سـەرەتایی"یـە کە لـە ڕێگـای "فووریـە" (*Fourier*)وە دەتوانـین جـێ پەنجـە و شوێنەواری لـە "ئۆڤێـن" (*Owen*)ەوە تـاکو مـارکس، ئینگلێـس و لینـین پـەیدا بکـەین. هـەموو ئانارشیسـتەکانی پێـش و پـاش سـەن سـیمۆن هەڵەیەکی هاوشێوەیان دووپات کردۆتەوە. ئەوان بە باشـی لـە نێـوان هاریکـاری زۆر و بەڕێوەبەرایـەتی و حکومـەتکردندا جیاوازیـان دانـا، /بـەڵام بـە دەستپێکردن بەم جیاوازییە/ گەیشتن بە لایـەنگریی لە جۆرە /حکومـەتێکی ناسیاسی/. بەبێ ئـەوەی کە ئاگاداری ناتەبایی نێوان ئەم زاراوانە یا گەشبینیی زێدە لـە ئـەندازەی خۆیـان بەرانبـەر بـە سرووشـتی مرۆڤ بێن.

بـۆ دۆزینـەوەی ڕوونـترین بـاس دەربـارەی جیـاوازیی دەوڵـەت و کۆمـەڵگا ئـەبێ بگەڕێینـەوە بـۆ نووسـینەکانی بـەناوبانگترین هزرڤـانی هاوچـەرخی سەن سیمۆن –واتە هێگل (*Hegel*).

هیگڵ لە کتێبی فەلسەفەی مافدا، کە لە *1821*دا بڵاوکرایەوە، زۆر هەوڵ ئەدا تاکو دوورمـان بخاتـەوە لـە تێکـەڵکردنی "دەوڵـەت" و "کۆمـەڵگای مـەدەنی". ئەو لەسـەر ئـەوە جـەخت ئـەکات کـە "بەرژەوەندییـە تاکییە تایبەتییەکان، کە هەمووان هەیانە، ئەکەوێتە نێـو بـواری کۆمـەڵگای مەدەنییـەوە و بـە تایبـەتی ئەکەوێتـە دەرەوەی بەرژەوەندییـە ڕەهـاو گشتییەکانی دەوڵەتەوە". هەرچەند هیگڵ کۆمەڵگەی مـەدەنی لـە دەوڵـەت جیادەکاتـەوە، بـەڵام بەرژەوەندییـەکانی دەوڵـەت وەکـو بـەرژەوەندیی "ڕەهـای گشـتی" ئەخاتـە سـەرەوەی کۆمەڵگـەوە. بـە ڕای هیگڵ دەوڵـەت گشـتێتی و واتـای ڕاسـتەقینەی کۆمەڵگایە.

یەکـەمین توێژینـەوەی بـەپێز لەمـەڕ جیـاوازیی نێوان کۆمەڵگا و دەوڵەت لە ڕەخنە سـەرەتاییەکانی مارکسـدا لـە هیگـڵ ئـەبیندرێت. مـارکس کـە دوای تەواوکردنی کۆلیژی ماف، بەرەو فەلسەفە کشا، لە

کەش و هەوایەکی ڕۆشنبیرانەدا چاوودەمی کردەوە کە بە توندی لەژێر کاریگەرێتیی هێگڵدا بوو، سەرەتا لەناو ئیلاهیاتی هیگڵیدا ون بوو و دواتر لێی هەڵگەڕایەوە و چووە ڕیزی هیگڵیە چەپەکانەوە و لە یەکەمین وتارە سیاسییەکانیدا ڕەخنەی لە فەلسەفەی "ماف" و "دەوڵەت"ی هیگڵ گرت و هەر لە هەمان سەرەتاوە نیشانی دا کە بە باشی ئاگاداری خاڵە لاوازەکانی تیۆریی سیاسیی هیگڵە. مارکس لەم نووسراوانەدا دەبێژێت: "قووڵی (فەلسەفەی) هیگڵ لەوەدایە کە کۆمەڵگەی مەدەنی و سیاسی، دوو دژ، لە یەکدی جیادەکاتەوە". بەڵام هەڵەی هیگڵ لەمەدایە کە بە ئاکامی رووکەشی ئەم جیاوازییە ڕازییە و قەناعەتی پێ دەکات. مارکس پێی وایە کە زنجیرە پلەی سیاسی، جیایە لە سیستەمی غەیرە سیاسیی کۆمەڵگا، هەرچەند کە پێوەندییەکی دوولایەنەیان هەیە. مەبەستی هیگڵ لە تێکەڵکردنی ئەوانە (لە شێوەی یەکگرتنێکی دیالێکتیکیدا) وەکو زەرووڕەتێك، ئافراندنی هاودەنگییەکی میتافیزیکییە لە سەرووی دژایەتییەکی کردەوەیی ڕاستەقینەوە. مارکس لە جیاکردنەوەی دەوڵەت و کۆمەڵگەدا لەگەڵ ئانارشیستەکاندا هاوڕێیە کە دەڵێن دەوڵەت شەرێکی سەپێندراوە. بەڵام بە پێچەوانەی ئەوان لێکۆڵینەوەیەکی بەپێز لەم بابەتە ئەخاتە بەردەست کە چۆن و بۆچی دەوڵەت لە هەلومەرجگەلی جۆراوجۆری ئابووریدا لەتەك کۆمەڵگادا پێوەندیی هەیە. مارکس زۆر ڕوون و ئاشکرا جیاوازی ئەخاتە نێوان باسی کۆمەڵناسانە و باسی میتافیزیکی دەربارەی سیاسەت. بەهەرحاڵ، ئەمە لەگەڵ مارکسدایە کە کۆمەڵناسیی سیاسی لەدایك دەبێت.

هەرچەند کە مارکس جیاوازی ئەخاتە نێوان دەوڵەت و کۆمەڵگا، بەڵام ئەم کارە لە نووسینەکانی ئەودا هێشتا کامڵ نییە و لە نووسینەکانی ماکس ڤێبێردایە کە بۆ یەکەمجار واتای دەوڵەت لە ڕوانگەیەکی کۆمەڵناسانەوە لێك ئەدرێتەوە. ڤێبێر دەپرسێت: "کۆبوونەوەی سیاسی" (*Political association*) لە ڕوانگەی کۆمەڵناسییەوە، بە چ مانەیەکە؟ دەوڵەت چییە؟ لە رووی کۆمەڵناسییەوە ناتوانین دەوڵەت بە پێی ئەو کارانەی کە ئەنجامی ئەدات لێك بدەینەوە، چونکە بە دەگمەن ئەرکێك هەیە کە کۆبوونەوەیەکی سیاسی نەیگرتبێتە ئەستۆ و هیچ ئەرکێکیش نییە کە هەموو کات تەنیا تایبەت بە کۆبوونەوەگەلێك بێت کە پێیان دەگوترێت سیاسی. سەرئەنجام تەنیا بە پێی ئەو ئامرازە تایبەتییانە کە تایبەتی دەوڵەتی نوێن، دەتوانین دەوڵەت پێناس بکەین، واتە بەکارهێنانی زۆر. ئەگەر "زۆر" لە ئارادا نەبایە، چەمکی "دوڵەت" بە تەواوەتی ئەسڕایەوە و لەم حاڵەتەدا "ئانارشی" (بێ سەرۆکایەتی) -لە واتا تایبەتییەکەی ئەم وشەیەدا- دەهاتە گۆڕێ. دەوڵەت جڤاتێکی مرۆڤانەیە کە بە سەرکەوتووییەوە ئیدیعای مافی پاوانکراو و ڕەوای بەکاربردنی زۆری لە چوارچێوەیەکی دیاریکراودا هەیە. هەر بۆیە واتای "سیاسەت" بۆ ئێمە هەوڵدانە بۆ بەشداریکردن لە دەسەڵاتدا و نفووزکردن لەنێو دابەشکردنی دەسەڵاتدا، چ لەنێو دەوڵەتەکاندا و چ لەنێو گرووپەکانی ناو دەوڵەتەکاندا.

کاتێك بابەتێك بە "سیاسی" لە قەڵەم ئەدرێت کە مەبەست لەو بابەتە، هێنانەدی بەرژەوەندیگەلێك بێت کە لە دابەشکردن، پاراستن یا گوێزانەوەی دەسەڵاتدا هەیە.

بە جیاکردنەوەی کۆمەڵگا و دەوڵەت لە یەکتر و پێناسی کۆمەڵناسانەی دەوڵەتە کە کۆمەڵناسیی سیاسی لەدایك دەبێت، کە لەسەر تەختی تەوێڵیدا و لە سەرووی هەمووانەوە ناوی "کارل مارکس" و "ماکس ڤێبێر" ئەبینرێت.

## پەراوێزەکان

*1-robertk. Merton, sociology today, new york 1959.*

*2*–ئاماژەیەکە بۆ تیۆرییەکانی فرۆید لەسەر خودئاگا و ناخودئاگا کە دەڵێت مێشکی مرۆڤ وەکو کێوێکی سەهۆڵ لەناو ئاودا وایە. بەشە دیار و ئاشکراکەی کە بەشی چکۆلەیەتی دەبێتە خودئاگا و بەشی ژێرئاو و نادیاریش کە بەشە گەورەکەیەتی دەبێتە ناخودئاگا یا نەست. و.

*3-political sociology, selected essays, eaited by lewis A. coser, Harper & Row publishers, new york, 1966.*

## سەرچاوە

کتێبی "آشوری، داریوش: در آمدی به جامعە شناسی و سیاسی/ انتشارات مروايد/ چاپ اول *1358*. از صفحەی *35* تا *48*".

## فەرهەنگۆك

پاوانکردن: انحصار

هزرڤان: متفکر

زاراوە: اصطلاح

مامناوەندی: متوسط

هۆکار و هۆگر: علت و معلول

هاوسەنگی: تعادل

ئەتنیك: قوم

جۆری ئایدیال: نمونەی آرمانی/ نوع آرمانی

بەرژەوەندی: منفعت

پۆلێنبەندی: طبقە بندی، قشربندی.

کۆمەڵگەی جەماوەری: جامعەی تودەای

جڤات: اجتماع

پسپۆڕ: متخصص

نڤیسکار: نوسیندە

دەستەبژێر: سرامد. نخبە

لێکپچڕان: گسل

نەگۆڕ: پاب رجا، ثابت

گریمانە: فرضیە

بزووتن: حرکت

پۆزەتیڤ: مثبت

ڕەها: مطلق

پەیمانی کۆمەڵایەتی: قرارداد اجتماعی

پرۆسە: فرآیند، فراشد

# سیاسەت و دیمۆکراسی لە ڕوانگەی کلۆد لۆفۆردەوە

ڕامین جەهانبەگلوو
لە فارسییەوە: موحەممەد ئیزەدی

کلۆد لۆفۆر یەکێکە لەو لێکۆڵەرانەی کەوا دەبینرێت ژیان و هزریان لەژێر کاریگەریێتیی هەراوهوریای ڕووداوە سیاسییەکانی ئەم سەردەمەدا بێت. کلۆد لۆفۆر قوتابی و دۆستی "موریس مێرلۆپۆنتی" -مامۆستای بەپێزی وانەکانی مارکس و ماکیاول- و هاوڕێ و هاوکاری "ک. کاستۆریادیس" بوو کە لە پێکنانی تاقمی "سوسیالیزم یا وەحشیگەری" لە ساڵی *1948*دا -کە خۆی لەساڵی *1958*دا دەستی لێ شۆردەوە- و لە ڕێگای توێژینەوە و هەڵوێستە سیاسییەکانیەوە، بەردەوام ڕۆڵێکی گرنگی لە ژیانی فیکری و هزریی ئەوروپای هاوچەرخدا گێڕاوە. هەر بۆیەش لە دید و بۆچوونەکانی لۆفۆردا- لە "ڕێساگەلێك بۆ ڕەخنەی بورۆکراسی"یەوە هەتا "چەند گوتارێك سەبارەت بە سیاسەت"- بەردەوامی و توندوتۆڵییەکی بەرچاو دەبینرێت. پاشان دەبینین کە لۆفۆر لە دوایین کۆمەڵە وتارەکانیدا بە هێنانە ئارای پرسیارگەلێك دەربارەی بۆچی و چۆنیەتی سیاسەت لە سەدەکانی *19* و *20*دا، دیسانەوە خۆ بەو باسانەوە خەریك دەکات و جەختیان لەسەر دەکات کە لە بەرهەمەکانی پێشتریشیدا هێنابوونیە گۆڕێ.

بەمجۆرە ڕوودەکاتە لێکدانەوە و توێژینەوەی پرسی سیاسەت لە ڕێگەی شێوازە جۆراوجۆرەکانییەوە بە تایبەتی شێوازی دیموکراسی و توتالیتاریزم. بەڵام دەبێ ئەوە بڵێین کە مەبەستی لۆفۆر لە لێکۆڵینەوەی سیاسەت، نیشاندانی "بەشێکی تایبەت لە ژیانی کۆمەڵایەتی" نییە، بەڵکو بە پێچەوانەوە، پەروەردەکردن و دروستکردنی "چەمکی بنەمایەك یان کۆمەڵێك بنەمایە کە دەبنە هۆی پەیوەندیی مرۆڤەکان لەتەك یەکدیدا و لەتەك جیهاندا". کەوابوو مەبەستی ئەو دەری دەخات کە بۆچی "سەرنجدان لە ڕووداوە مێژووییەکان" بە گرنگتر لە "ڕەخنەگرتنی دوور و درێژ و چڕوپڕی مێژوو وەك مێژوو" دەزانێ. بەم

شێوەیە لۆفۆر بڕیار دەدات سەرلەنوێ و ئەمجارە بە شێوەی "هانا ئارێنت" بیر لە سیاسەت بکاتەوە. واتە: پێویستێتی هوشیاری تیۆرێك لە بەرانبەر ڕووداوەکانی ژیانی سیاسیدا. کەوابوو ئامانجی ئەو پەردە هەڵماڵینە لە ڕوخساری هەڵخەڵەتێنەری سیستەمی توتالیتەر؛ ئەو سیستەمەی "کە لەودا هەموو شتێ سیاسی دەنوێنێ"، ئەو دەخوازێت "بەرنامەی زاڵبوونی تەواو"ی ئەم سیستەمە ئاشکرا بکات، بەلاّم لە ڕاستیدا بە وتەی لۆفۆر: لە جێگایەکدا کە هەموو شتێ سیاسیە، تەنانەت چەمکی سیاسەتیش ئەسڕدرێتەوە و لەناودەچێ. چونکە "سیاسەت تەنیا لە شوێنێکدا دەبینرێت کە تیایدا لەو کەشوهەوایەدا کە مرۆڤەکان یەکتر وەکو هاولاّتی ناس دەکەن و هەموویان لە گۆڕەپانی جیهانێکی هاوبەشدا ئامادەن، جیاوازییەك بەدی بکرێت". مرۆڤەکان بە بەشداریکردن لەم کەشوهەوا سیاسییەدا دەتوانن بەسەر دۆخی داماڵینی سیاسەتدا و بێهودەیی لە بەرانبەر کاروباری گشتیدا -کە بەرهەمی توتالیتاریزمە- زاڵ بن و سەرکەون.

لۆفۆر هاوکات لەگەڵ ڕەدکردنەوەی توتالیتاریزم، پرسیارێکی فەلسەفی سەبارەت بە دیموکراسی دەخاتە بەردەست، ئەو دەخوازێت کە لە ڕەخنەی "دیموکراسی ڕووکەشی" تێبپەڕێت و وەك شێوەیەك لە کۆمەڵگەی سیاسی باس لە دیموکراسی بکات کە خاڵی دیاریکەری ئەو شتەیە کە خۆی پێی دەڵێ "جێگای چۆڵی دەسەلاّت". لەسەر ئەم بنەمایەش، بە بۆچوونی لۆفۆر، تایبەتمەندیی دیموکراسی هەر ئەم جێگا بۆش و پڕەوەنەبووەی دەسەلاّتە کە بەرهەمی خەبات و ململانێیە لەنێو جەرگەی کۆمەڵگادا. ئەمەش بەو مانایە دێت کە "کۆمەڵگەی دیموکراتیك، کۆمەڵگایەکی بێ چوارچێوەیە، کۆمەڵگایەکە کە نوێنەرایەتیی هەمەجۆرە گشتییەتێکی ئۆرگانیکی، ڕووبەڕووی ڕووخان و شکست دەکاتەوە". بەم پێیە، دیموکراسی تەنها لە شوێنێکدا بوونی هەیە کە لەوێدا هەڤپەیڤین یان باسێك دەربارەی ڕاستییەکانی سیاسەت لە ئارادا بێت. لە ڕێگای ئەم دەمەتەقێ و باسە دیموکراتیکانەوەیە کە ئازادییە باسکراوەکان لە یەکەمین بەیاننامەکانی مافی مرۆڤدا، سەریان هەڵداوە. "وە ئەزموونەکان بە ڕوونی(ێکی تاڵەوە) دەری دەخەن کە چۆن سووکایەتیکردن بە مافەکانی مرۆڤ، دەبێتە هۆی ئەوەی کەسانێك کە لافی شۆڕشگێڕبوون لێ دەدەن، یا حکوومەتگەلێك لە شێوەی حکوومەتە توتالیتەرەکاندا دابمەزرێنن، یان ئاواتی چێ کردنی ئاوەها دەوڵەتێکیان لە مێشکدا بێت".

لێرەدا لۆفۆر ڕێگا لە بەردەم ئەو لێکۆڵینەوەیەدا دەکاتەوە کە دەخوازێت لە ترۆری شۆڕشگێڕانە بفکرێت. ئەو دەڵێ: ترۆر بابەتی ئەو گوتارەیە کە هاوکات هەم سەلمێنەری ئازادیی ڕەهایە و هەم نکوڵی لێکەریشی. لێرەوە، ئەو سیاسەتە گومانا وییەی کە لەناو دڵی گوتارە شۆڕشگێڕانەکاندایە، لە بوونی نەیارێکدا کە دەمامکیان لە ڕووی هەڵماڵیوە، بە دوای ئامێرێکدا دەگەڕێ کە بتوانێت بە کەڵك وەرگرتن لێی "هێڵێکی قایم بخاتە نێوان پاکژێتی و جینایەت". بەم شێوەیە بە کەڵك وەرگرتن لە ترۆر، "کەش و هەوایەکی ڕێکوپێکی کۆمەلاّیەتی لە دەوروبەری جەمسەری دوو ڕەهەندیی ئیرادەی بەرەو خێر و ئیرادەی بەرەو شەڕدا درووست دەبێت..". لەم دۆخەدا، گەڕانەوە بۆ ڕاستی بە ناچار پێویستی بە خەباتێکی درێژ -بگرە تا ئاستی مەرگ- هەیە، لێرەدا لۆفۆر بۆچوونەکانی "ف. فووریە" پەسەند دەکات و لەسەر ئەوە جەخت دەکات کە لە نێوان سەپاندنی دەسەلاّت لە لایەکەوە

و بەکارهێنانی وتار لە ستراتیژیی ئایدیۆلۆژیای شۆڕشگێڕدا، پەیوەندییەك هەیە. بەم پێیە، تەواوی توێژینەوەکانی لۆفۆر سەبارەت بە گوتاری تروّر، بریتییە لە دەرخستنی دوو لایەنی ئەم گوتارە لە شێوەی نزیکایەتییەکی فراوان لە نێوان ئیرادەی چێکردنی گەلێکی ئازاد و لەناوبردنیدا. لەگەڵ ئەوەشدا کە لۆفۆر تاکو ئەم ئاستە "ئەندێشەی تۆکڤیل سەبارەت بە ئاوەژوکردنی ئازادیی دیموکراتیك و گۆڕینی بۆ کۆیلایەتی" پەسەند دەکات، بەڵام هەوڵ ئەدا خۆی لە ڕەخنەگرانی ئەمڕۆی دیموکراسی دوور بخاتەوە، چونکە بە ڕای ئەو "دیموکراسی سەرەڕای هەموو کەموکورییەکانی، بۆ ئەو کەسانەی کە لەژێر چەوساندنەوەی سیستەمە توتالیتەرەکاندان، تاکە شێوازی کۆمەڵگای دڵخواز و ئایدیالە، چونکە چەمکی دوو لایەنەی ئازادیی ڕامیاری و ئازادیی تاکی دەگرێتەخۆ". کەوابوو هەم دامەزراندن و هەم مانەوە و بەردەوامبوونی کۆمەڵگای دیموکراتیك لە چوارچێوەی کۆمەڵگایەکی فرەدا دێتە دی. هەڵبژاردنی ئەم فرەییە لە دیموکراسیدا پێویستی بە قبووڵکردنی هەمەلایەنە و تەواوی ئەم خاڵە هەیە کە دیموکراسی لە ناوەرۆك و نەفسی خۆیدا، دۆخێکە کە دەبێ پێك بێت. بەم شێوەیە دیموکراسی ناخوازێت "ئاماژە بە دەرەوە بکات و خۆی بە دەسەڵاتێکی فەرزیی دیکەوە گرێ بدات، چونکە ئەگەر وەها بێت؛ دین، پێچی و ئاڵۆزیی خۆی لەدەست دەدات".

کەوابوو کۆمەڵگەی دیموکراتیك لە شێوەی ڕێکخراوێکی تایبەتدا سەرهەڵئەدات کە لەوێدا هەر چەشنە وەهمێکی وەك ئەوەی کە جەوهەری سیاسەت دەکەوێتە دەرەوەی کۆمەڵگەوە، بۆ هەتاهەتایە لەناو دەچێ. لەم ڕەوتەدا، دیموکراسی "دەسپێکی مێژوویەکە کە مرۆڤەکان لەوێدا دەربارەی بنەماکانی دەسەڵات، یاسا و مەعریفە و هەروەها بنەماکانی پەیوەندی کەسێك لە تەك ئەوی تردا لە هەموو بوارەکانی ژیانی کۆمەڵایەتیدا، تا دوا سنوور گومانکارن". بەڵام لە کۆمەڵگایەکی مێژوویی وەك دیموکراسیدا، کە نەزمی سیاسی هەموو بنەما پیرۆزەکانی ناوەتە لاوە، ئایا مەترسی ئەوە نییە کە جەوهەر و ناوەڕۆکی جەستە و پەیکەری دەسەڵات گۆڕانی بەسەردا بێت؟ بە واتایەکی دی، ئایا کۆمەڵگەی دیموکراتیك ئەتوانێت بەسەر تەنگەژە ئابووری و کۆمەڵایەتییە جۆراوجۆرەکاندا، یان بەسەر "درم و خراپییەکانی جەنگ"دا زاڵ ببێت؟ بەبێ ئەوەی کە بکەوێتە ناو "وەهمی نەتەوەی یەکگرتوو"ەوە؟ بێگومان ئەم پرسیارانە -بە ڕای لۆفۆر- بەشێکی جیانەکراوەی چارەنووس و قەدەری بوونناسانەی دیموکراسین. لۆفۆر هەوڵ ئەدات ڕووبەڕووبوونەوەی لەبیرچوونەوەی سیاسەت، ئەم چارەنووسە بە یارمەتی خودی سیاسەت بکاتە بابەتێك کە مرۆڤەکان لێی تێبگەن.

### سەرچاوە


کتێبی (مدرنیتە دموکراسی و روشنفکران/ رامین جهانبگلو/ نشر مرکز/ تهران *1278* صفحەی *72* تا *75*.


### فەرهەنگۆك

خاسما: بە تایبەت: بە خصوص

ئاوەژۆکردن: واژگون نمودن

تەنگەژە: قەیران/ بحران

گشتیەت: کلیت

ڕێکخراوە: نهاد

درم: آسیب

پاکژێتی: فضیلت

مەعریفە: معرفت/ شناخت

# وتاری چوارهەم

# کاتێك ئەوی تر دێتە قسە*

ئومبێرتۆ ئیکۆ

لە ئیتالییەوە: یاسین فەقێ سەعید

ئازیزم کارلۆ ماریە مارتینی[1]..

نامەکەتان لە ناڕەحەتییەك ڕزگاری کردم و تووشی ناڕەحەتییەکی سەختتری کردم. هەتا ئێستا هەر من دەستپێشکەر بووم و (بە پێی پێویست) دەرگای گفتوگۆم کردۆتەوە، دیارە ئەوەی یەکەمجار دێتە قسە زۆر بە توندی و بێڕەحمانە ئەوی تر دەخاتە ژێر پرسیار و ئیدی چاوەڕوانی وەڵامدانەوە دەکات. سەرەتا بەوە ناڕەحەت بووم کە وام هەست دەکرد وەك دادگاییکردنێك پرسیارەکانم کردبن. بەڵام وەڵامدانەوەی بەڕێزتان بەو سنگفراوانییە، بۆ سێ جار، لەو ناڕەحەتییە ڕزگاری کردم و منیش ئەو هەڵوێستەتانم زۆر بەرز نرخاند، چونکە توانیتان ئەو ئەفسانەیە پوچەڵ بکەنەوە کە گوایە پیاوانی ئاینی[2] هەمیشە بە پرسیارێك وەڵامی پرسیارەکان دەدەنەوە.

ئێستاش کە دەبێت من وەڵامتان بدەمەوە ناڕەحەت ترم، چونکە وەڵامەکەم وشك و ڕەق دەبێ ئەگەر وەك ئێوە وتووتانە من هەر لە منداڵییەوە پەروەردەیەکی "لایکی- *Laico*- عەلمانی"م هەبووبێ؛ بەڵام بە پێچەوانەوە، من هەتا تەمەنی بیست و دوو ساڵی (تا بزانن لە چ تەمەنێکدا درز کەوتۆتە تێڕوانین و بیرکردنەوەی ئاینیمەوە) کاریگەرییەکی زۆر بەهێزی کاتۆلیکیم لەسەر بووە، تێڕوانینی "لایکی-عەلمانی"م هەرگیز بۆماوە و میراتێك نەبووە ڕاستەوخۆ وەرم گرتبێت، بەڵکو بەری ڕەنج و خۆماندووکردنێکی زۆر ئازاراوی پرۆسەیەکی گۆڕانکاری دوور و درێژ و لەسەرخۆ بووە، لەگەڵ ئەمەشا من بەردەوام لە هەندێ بۆچوون و ڕەفتاری ئەخلاقیم بەگومانم کە هێشتا هەر لەژێر کاریگەریی ئەو پەروەردە ئاینییەدا بن کە لە ڕەگوڕیشەوە کاریان تێکردووم. بۆیە لە تەمەنێکی کامڵدا، کاتێك هەندێ هاوڕێم بینی کە مامۆستای زانکۆن، (لە هەندێ زانکۆی کاتۆلیکی بیانیدا، هەندێ مامۆستا و پسپۆڕی ڕشتەی "لایکی-

عەلمانی" دەرس دەڵێنەوە، ئەوپەڕی داوایان لێدەکرێت لە مەراسیم و سرووتە ئاینییە – ئەکادیمییەکاندا، گەرچی هەر بە ڕووکەشیش بێت، ڕێز و پێزانین پیشان بدەن) بەشداری دەکەن لە سرووتە ئاینییەکاندا بەبێ ئەوەی هیچ بڕوایەکیان بە تاکخوایی و پەیامە ئاسمانییەکان هەبێ، تەنانەت بێئەوەی هەرگیز ڕۆژێ لە ڕۆژان تۆبەیان کردبێت. منیش لە بەرامبەردا، بە دەنگێکی بەرز، سەرنجم بۆ مەترسییەکانی سوکایەتی کردن بە موقەدەسات و بەها ئاینییەکان ڕاکێشان.

ئێستاکە لەو بڕوایەدام بتوانم پێتان بڵێم ئەم "دینداری لایکی"[3] یەم لەسەر چ بناغەیەك داڕشتووە –چونکە من لەو بڕوایەدام چەندین شێوەی دینداری هەبن، ئەمەش لە مانا و تێگەیشتنەکاندا بۆ چەمکی پیرۆزی و سنوور و لێپرسینەوە و چاوەڕوانی و گەیشتن و کۆبوونەوە لەگەڵ شتێکدا کە لە ئێمە باڵاترە، تەنانەت لە حاڵەتی نەبوونی باوەڕێکی تەواویشدا بە یەزدانێك چ تاکەکەسی بێت و چ ئاسمانی بێت. کۆی ئەم شتانەش، گەر باش لە نامەکەتان گەیشتبم، ئێوەش دەیزانن. هێندە هەیە ئێوە داوا دەکەن: لەم شێوانەی "ئاکار– *Etica*"[4]دا چ شتێك هەیە بە خۆیەوە گرێمان دەدات، ڕامان دەکێشێ و ناتوانین دەستبەرداری بین؟

بۆ وەڵامدانەوە دەخوازم بگەڕێمەوە بۆ زەمەنە دوورەکان. هەندێ کێشەی "ئەخلاق–مۆراڵ"ی بە هۆی دیراسەکردنی هەندێ کێشەی "سیمانتیکی– *Semantico*"[5] یەوە باشتر حاڵی بووم و چاکتر بۆم ڕوون بوونەوە– بەڕێزتان گوێ مەدەنە ئەو کەسانەی ئێمەومانان بەوە تاوانبار ئەکەن کە قورس و گران قسە دەکەین: لەوانەیە ئەوانە لە ڕێگەی "داهێنان"ەکانی ماسی مێدیا[6]وە هاندرابێتن کە زۆر بە ئاسانی بیربکەنەوە، ئەمەش هێندە ئاشکرایە پێناسەکردنی ناوێت. وازبێنە با ئاوانەش فێربن قورس و گران بیربکەنەوە، چونکە نە "نهێنی– نادیار" و نە "ئاشکرا–دیار" هیچیان سووك و ئاسان نین.

کێشەکەی من لەوەدا بوو کە ئایا "سیمانتیکای گەردوونی" یان تێگەیشتنێکی سەرەتاییانەی هاوبەش هەیە بۆ سەرجەم مرۆڤایەتی، کە بتوانرێ بە هەموو زمانەکان تەعبیری لێ بکرێت. ئەم کێشەیەش هێند ئاشکرا و ئاسان نییە، بە تایبەتی پاش ئەوەی دڵنیابووین کە بەشێکی زۆری کەلتوورەکان ئەو چەمك و تێگەیشتنانە هەر ناناسن کە لەلای ئێمە ناسراو و ئاشکران: بۆ نموونە، تێگەیشتنمان بۆ خەسڵەتی خاوەندارێتی مادە (وەك ئەوەی دەڵێین "سێوەکە سوورە")، یان بۆ خەسڵەتی چۆنایەتی مادە (س=س). بەڵام لەگەڵ ئەمەشدا تەواو دڵنیا بووم سەرجەمی کەلتوورەکان لەو تێگەیشتنەدا هاوبەشن کە پەیوەندی بە هەلومەرجی جەستەمانەوە هەیە لەم فەزایەدا.

ئێمە گیانلەبەری دووپێی ڕێك ڕاوەستاوین، بۆیە هەر زوو بێزار دەبین گەر بۆ ماوەیەك لنگەوقوچ کرێین، هەروەها تێگەیشتنی هاوبەشمان هەیە بۆ بەرزیی و نزمی، بەرزیشمان لە نزمی پێ باشترە.. هەمووومان وەکو یەك لە مانای ڕاست و چەپ، وەستان و ڕۆشتن، بە پێوە وەستان و پاڵکەوتن، خۆخشاندن و بازدان، بە ئاگابوون و خەوتن تێدەگەین. لەبەرئەوەی لە چەندین جۆری هونەردا شارەزاییمان هەیە، هەمووومان دەزانین مانای چەکوشکاری مادەیەکی ڕەق چییە، جیاوازی لە نێوان مادەیەکی خەست و مادەیەکی شلدا دەکەین، هەمووومان وەکو یەك لە ماناکانی شێلان، پلیشانەوە، هاڕین، کوتان، شەق وەشاندن، لەوانەشە لە "سەماکردن"یش تێبگەین. ئەم لیستەیە زۆر دوور و

درێژە و هەموو بوارەکانی بینین و بیستن و خواردن و خواردنەوە و تەنانەت هەرسکردن و "ڕشانەوە"ش دەگرێتەوە. هەموو مرۆڤێك زۆر باش دەزانێ حاڵی بوون و تێگەیشتن، یادکردنەوە و هیواخوازی مانای چییە، هەموومان لە ماناکانی ترس، خەمباری، دڵخۆشی، ئارەزوو، ئازار تێدەگەین و تەنانەت لە دانانی ئاوازدا بۆ گوزارشتکردن لەو حاڵەتانە هەموومان وەك یەکین. لەمانەش زیاتر (گەر بچینە بواری مافەکانەوە) هەر هەموومان کەم تا زۆر تێگەیشتنێکی گەردوونیمان هەیە بۆ مانای "زۆرلێکردن-ناچارکردن": کەسمان ناخوازێت یەکێکی لێ پەیدا ببێ کە ڕێگەی نەدات قسە بکات، بئاخفێت، بڕوانێت، گوێ بگرێت، بخەوێت، بخوات، وە یان ڕێگای سەفەرمان لێ بگرێت، زۆر ناڕەحەت دەبین ئەگەر یەکێك کوت و بەندمان کات، یان گۆشەگیر و دوورەپەرێزمان کات، یان پەلامارمان بدات و بریندارمان بکات و بمانکوژێت، یان ئەشکەنجەی جەستەیی و دەروونیمان بدات کە ببێتە مایەی لاوازکردن یان لەناوبردنی توانای بیرکردنەوە و ڕاڤەکردنمان.

ئەگەر سەرنج بفەرموون، من هەتا ئێستا باسم لە "ئادەم"ێك کردووە وەك گیانلەبەرێکی تاك و تەنیا، گیانلەبەرێك کە هێشتا مانای "مومارەسەی سێکسی" نازانێ، هێشتاکە تامی "دایەلۆگ"ی نەچەشتووە، نازانێ خۆشەویستی باوك بۆ منداڵەکانی چییە، هێشتا لە ئازاری "مەرگی ئازیزان" تێناگات، کەچی هەر لەم قۆناغەدا، ئەم سێمانتیکایە، بۆ ئێمەومانان (گەر بۆ ئەم و ئەویش وا نەبێ) بۆتە بناغە و بنچینەی "ئاکار"ێك: واتە ڕێزگرتن لە مافە جەستەییەکانی "ئەوانی تر"، بەر لە هەمووشیان مافی "ئاخافتن و بیرکردنەوە" کە گرێدراوی بوونی جەستەیی مرۆڤەکانن. خۆ ئەگەر

باوباپیرانمان بە تەنها ڕێزیان لە "مافە جەستەییەکان" بگرتایە، ئەوا زۆربەی تراژیدیا گەورەکان ڕوویان نەدەدا، وەك قەتڵوعامی بێتاوانەکان، ڕەشەکوژی مەسیحیەکان لە شەوی "سان بارتۆلۆمێ"[7]، بە زیندوویی سوتاندنی نامەسیحییەکان[8]، کەمپەکانی جینۆساید، زیندانیکردن هەتا مردن، مەرگی بە کۆمەڵی مێردمناڵان لە کانە کانزاییەکاندا، ئەتك کردن و لاقەکردنی ژنان لە "بۆسنە" هەرگیزاوهەرگیز ڕوویان نەدەدا.

بەڵام باپرسین ئەم گیانلەبەرە نێرە (یان مێیە)، گەرچی زۆر زوو توانی گەشەبدات بە تێگەیشتن و بۆچوونە گەردوونیەکانی لەنێو تاقیگە و گەنجینەی غەریزە و نەستیدا، بەو هەموو دڕندەیی و سنووربەزاندنەوە کە پێشتر خستمانە ڕوو، چۆن توانی بگاتە ئەو ئاستە لە تێگەیشتن کە نەك تەنها هوشیار بێت بەرامبەر ئەو شتانەی ئارەزووی دەکات و ئەوانەی ئارەزووی ناکات، بەڵکو توانی بەرامبەر ئەوەش هوشیار بێت، کە ئەو شتانەی ئارەزوو ناکات لە دژی بکرێن، نایەوێ لە دژی "ئەوانی تر"یش بکرێت؟ ئەمەش لەبەرئەوە بوو، بۆ خۆشبەختیمان، ئەم مێرگوزاری "عەدن"[9] هەر زوو پڕ بوو لە دانیشتوان. ڕاستی و دروستی ئاکارێك ئەو کاتە دەستپێدەکات کە ئەوی تر دێتە قسە، کە ئەوانی تر پەیدادەبن. هەموو یاسایەك، چ مۆراڵی یان دادوەری بێت، هەمیشە پەیوەندیی نێوان تاکە کەسەکان ڕێکدەخات، بە پەیوەندی ئەوانەشەوە کە خودی خۆیان ئەو یاسایانە دادەڕێژن بۆ "ئەوانی تر".

هەروەها بەڕێزتان لەو بۆچوونەدا لەگەڵ ئەو کەسە لایکییە هۆشیارەدا یەك دەگرنەوە کە پێی وایە "ئەوی تر" لەناو خودی خۆماندایە. ئەم بۆچوونەش

بە تەنها دەربڕینێکی سۆزداری بێبناغە نییە، بەڵکو ڕەنگدانەوەی بیروبۆچوونێکی تەواو "چەسپاو و بنچینەییە". هەروەکو چۆن لایکی ترین زانست لە زانستە مرۆییەکاندا فێرمان دەکەن، کە ئەوە "ئەوی تر"ە، ئەوە "نیگا و تەماشای ئەوی تر"ە کە ئێمە پێناسە و فۆرمەلە دەکات. ئێمە (چۆن بەبێ نانخواردن و خەوتن ناژین) بە هەمان شێوە بەبێ نیگا و تەماشا و وەڵامەکانی "ئەوی تر" ناتوانین لە خۆمان تێبگەین چین و کێین. تەنانەت ئەو کەسەی دەکوژێ، دەستدرێژی دەکا، دەدزێ، سەرپێچی دەکا، ئەم شتانە لە ساتەوەختی زۆر تایبەتیدا ئەنجام دەدا، ئیتر بۆ سەرتاپای ساتەکانی دیکەی ژیان لە هاوشێوەکانی خۆی دەکەوێتە سوالی سۆز و خۆشەویستی و ڕێز و پێزانین. تەنانەت داوا لە دژەکانی دەکات دان بنێن بە خراپی و مەترسییەکانی تۆقاندن و زوڵم و زۆردا. لە نەبوونی ئەم دان پیانانەدا، وە یان لە حاڵەتی هەست نەکردن بە پێویستی ئەم دانپیانانەدا، ئەوا ئەو کۆرپە ساوایەی لە جەنگەڵەکەدا جێدەمێنێ هەرگیز نابێتە مرۆڤ (یان وەکو "تارزان" بەهەر نرخێ بێت هەوڵ دەدات بە ئەوی تر بگات لە سیمای مەیموونێکدا)، دەکرێت بمرین یان شێت بین ئەگەر لە کۆمەڵگایەکدا بژین کە بە شێوەیەکی بەرنامەڕێژیی، کۆی دانیشتوانەکەی بڕیاریان دابێت، هەرگیز سەیرمان نەکەن، نیگا و تەماشامان نەکەن، وا ڕەفتار بکەن وەك ئێمە هەر بوونمان نەبێت، ئەمە بە ڕاستی دەبێتە مایەی شێتبوون. ئەگەر نەبێتە هۆی مردنمان.

کەواتە چۆن هەندێ کەلتوور هەن "یان هەبوون" کە قەتڵوعام، یان مرۆڤخواردن، یان ڕق و دژایەتیکردنی جەستەیی "ئەوی تر" یان بە هۆی جیاوازی ڕەنگ و ڕەگەزەوە ئەنجام داوە؟ بە ئەوپەڕی سادەییەوە لەبەرئەوە بووە کە ئەو کەلتورانە (یان ئەو کۆمەڵگایانە) بە ئەوپەڕی بیرتەسکییەوە چەمك و تێگەیشتنی "ئەوی تر" یان لە کۆمەڵگای "فیوداڵیعەشایری" (یان- ئێتنی)[10] یەوە وەرگرتووە و لەبەرئەوە پێناسەی "بەربەرییەکان" دەکەن وەکو بوونەوەری نامرۆڤ؛ بەڵام خۆ خاچپەرستەکانیش پێناسەی "بێبڕوا"کانیان نەدەکرد بە خەڵکانێك کە بێسنوور شایستەی خۆشەویستی بن. دانپیانان بڕواهێنان بە دەور و ڕۆڵی ئەوانی تردا، ڕێزگرتن لە پێویستی و داواکارییەکانیان، بە هەمان ئاستی پێداویستی و داواکارییەکانی خۆمان کە هەرگیز دەستبەرداریان نابین، ئاکام و بەرهەم و دەرئەنجامی گەشەکردنێکی هەزارساڵەیە. هەروەها فەرموودە و ئامۆژگاری پەیامە ئاسمانییەکان لە بارەی خۆشەویستییەوە، گەرچی لە ئاسمانەوە دابەزیون، کەچی زۆر بە زەحمەت قبوڵ کران، ئەویش تەنها کاتێك کە زەمەن لە بارو گونجاو بوو.

بەڕێزتان داوام لێدەکات: ئایا ئەم هوشیارییە بەرامبەر بایەخ و گرنگی ئەوی تر بەسە بۆ داڕشتن و مسۆگەرکردنی بنچینەیەکی ڕەها، بناغەیەکی نەگۆڕ بۆ ڕەفتارێکی ئاکاریی؟ لە وەڵامدا هێندە بەسە کە بڵێم: هەروەها ئەوانەش کە بەڕێزتان وەك "بنچینە و بناغەی ڕەها" پێناسەی دەکەن، ناتوانن ڕێگە لە زۆربەی بڕواداران بگرن کە خراپە، یان گوناه نەکەن، گفتوگۆکەشمان لێرەدا تەواو دەبێت: مەیل و نیازی خراپە و گوناهکردن لە ناخی ئەو کەسانەشدا هەیە کە تێگەیشتنێکی قووڵ و ئاینییان هەیە بۆ چاکە و چاکەکاریی. لێرەدا دەمەوێ دوو مەسەلەی تایبەتیتان بۆ بگێڕمەوە کە بوونەتە مایەی بیرکردنەوە و تێڕامانم.

یەکەم مەسەلە پەیوەندی بە نووسەرێکەوە هەیە، کە بانگهێشتی کاتۆلیکی بۆ خۆی کردووە "واتە بڕوادارە بە ئاینی مەسیحییەت"، با وای دانێین لە ڕاستیشدا هەروایە، ناوی ناهێنم، چونکە کاتێ ئەو قسانەی بۆ کردم لە دانیشتنێکی تایبەتیدا بووین، منیش لەوانە نیم بە دەمی خۆم سەرئێشە بۆ خۆم دروست بکەم. لە ڕۆژانی سەردەمی "پاپا جۆڤانتی بیست و سێهەمدا" بوو ئەو هاوڕێ پیرەم، لە یەکێك لە بۆنەکاندا، بۆ تەعبیرکردن لە توانا و گەورەیی پاپا، بە کەمێك هەڵچوونەوە وتی (دیارە مەبەستم لە مانای پارادۆکسەکەیە)[11]: "ئەم پاپا جۆڤانتییە دەبێ زۆر بێباوەڕ و کافر بێت، چونکە تەنها ئەوەی بڕوای بە خودا نییە دەتوانێ ئەوەندە زۆر و بێسنوور هاوشێوەکانی خۆی خۆش بوێت"، وەك هەموو پارادۆکسێك، ئەمەش کاکڵەیەکی ڕاستی و حەقیقەتی تێدایە: بەبێ بیرکردنەوە لە وشەی بێباوەڕ "کافر" (ئەم شێوە گوتنانە بێ مەبەست لە دەمم دەردەچن، وەك مەسەلەیەکی نەفسی وان، چونکە بە پێی بۆچوونەکانی "کانت" نازانم چۆن دەکرێت بڕوا بە بوونی خودا نەکرێت، بەو بیانووەی کە ناتوانرێت "بوون"ی بسەلمێنرێ، پاشان زۆر بە دڵنیایی بڕوا بە "نەبوون"ی خودا بکرێت، بۆچی ئەمەیان دەتوانرێ بسەلمێنرێ)، من بە تەواوی لێم ڕوون و ئاشکرایە، ئەو کەسەی کە هەرگیز بڕوای بە پەیامێکی ئاسمانی، یان بوونی یەزدانێك لە سەروو واقیعەوە نەکردبێت، یان بڕوای کردبێت و پاشان ونی کردبێت، دەتوانێ زۆر بە چاکی مانایەك ببەخشێ بە ژیان و مردنی خۆی، دەتوانێ هەست بە هێز و ئیرادە بکات بە تەنها لە خۆشەویستییەوە بۆ "ئەوانی تر"، ئەمەش لە هەوڵدانیدا بۆ مسۆگەرکردنی ژیانێکی شایستە بۆ "ئەو"ێکی تر، تەنانەت پاش ئەوەی کە خۆی دەمرێ و ون دەبێت.

بێگومان لەو جۆرە کەسەش هەن کە بڕوایان نییە و لەگەڵ ئەوەشا هیچ هەوڵ نادەن مانایەك ببەخشنە خودی ژیان و مردنیان، بەڵام هەروەها خەڵکانێکی دیکەش هەن کە دەڵێن ئێمە بڕوادارین کەچی لەگەڵ ئەمەشا ئامادەن تەنها لە پێناوی ژیانی خۆیاندا، دڵی منداڵێك بە زیندوویی دەربێنن. ئەوەشتان بیرنەچێت هێز و توانای "ئاکار"ێك لەسەر ڕەفتار و هەڵسوکەوتی پیاوانی ئاینی و پیاوانی زانا و دانا دەپێورێ و پێناسە دەکرێ، نەك لەسەر ڕەفتار و هەڵسوکەوتی نەزان و ساویلکەکان[*].

دێمە سەر باسی دووەم، هێشتاکە لاوێکی دینداری تەمەن شانزە ساڵان بووم، وا ڕێکەوت کەوتمە گفتوگۆیەکی دووقۆڵییەوە لەگەڵ خزمێکی بە تەمەنماندا کە بە "کۆمۆنیست" ناسرابوو، بێگومان "کۆمۆنیست" بەو مانایەی لە ساڵە سەخت و دژوارەکانی پەنجاکاندا هەیبوو. جا لەبەرئەوەی ئەو پیاوە زۆر سەری دەکردە سەرم، منیش پرسیارێکی ڕەقم دا بە تەنگەیدا: لێم پرسی، یەکێکی وەك ئەو "بێباوەڕ" چۆن دەتوانێ مانایەك ببەخشێتە ئەو شتە بێمانا و هیچە کە ئەویش "مردن"ی خودی خۆیەتی؟ ئەویش لە وەڵامدا وتی: "بەر لە مردن داوادەکەم کە تەعزێیەکی مەدەنیم بۆ دانێن. بەم شێوەیە من تەواو دەڕۆم و دەمرم، بەڵام بۆ "ئەوانی تر" نموونەیەك و نوێکارییەکم بەجێهێشت". من لەو بڕوایەدام کە ئێوەش ڕێز و پێزانینتان هەبێت بۆ ئەو بڕوا قووڵەی ئەو پیاوە هەیبوو بە "بەردەوامی ژیان"، ئەو بڕوایەی بە شێوەیەکی ڕەها بۆتە جەوهەری وەڵامەکەی. هەر ئەو بڕوا قووڵە بووە، هەزاران کەسی "بێبڕوا"ی هانداوە بۆ مردن لەژێر زەبری ئازار و ئەشکەنجەدا، بەو مەرجەی خیانەت لە هاوڕێکانیان نەکەن، هەر ئەو بڕوایە هاندەری ئەو کەسانە بووە ئامادە بن تووشی

دەردە کوشندەکان ببن، بەو مەرجەی بتوانن چارەسەری نەخۆشەکان بکەن. دیارە مەبەست و هۆی سەرەکی فەیلەسووف بۆ فەلسەفە و نووسەر بۆ نووسین، هەر ئەوەیە کە نامەیەک، پەیامێک بۆ "ئەوانی تر" بەجێبێڵن، نامەیەک لە هەستکردنی ئەمانەوە بە جوانی، لە بڕوای قوڵیانەوە بە بابەتەکە نووسراوە، بەو هیوایەی ببێتە جێی باوەڕی نەوەکانی داهاتوو، یان هەر نەبێ لای ئەوانیش جوان بێت.

ئەرێ بە ڕاست ئەم هەست و سۆزە هێندە بەهێزە بتوانێ پاساوی "ئاکار"ێک بداتەوە بەو دیاریکراویی و کۆکییە، بەو چەسپاوی و قووڵییە، هێندەی هەمان هەست و سۆز کە لە ناخی ئەوانەدایە وا بڕوایان بە "ئاکار"ێکی یەزدانی، زیندووبوونەوەی ڕۆح، ڕۆژی پاداشت و سزا هەیە؟ هەوڵم داوە پرینسیپەکان "ئاکارێکی لایکی" لەسەر کردەیەکی سروشتی دابڕێژم (بە هەمان شێوەی، کە بۆ ئێوەش هەر ئەم کردە سروشتییەیە سەرئەنجامی پرۆسەیەکی یەزدانی) ئەویش ئەوەیە کە بوونی جەستەیی خۆمان و بیرۆکەی زانینمان بە شێوەیەکی "غەریزیی، لاشعوری" کە ڕۆحێکمان هەیە (یان شتێک کە ئێمە دەخاتە گەڕ) تەنها کاتێک ئەم دوو شتە دەگەنە ئەنجام، ئەو کاتەی کە "ئەوی تر" لە بەرامبەردا بوونی هەبێت، بوونێکی حەقیقی. لێرەشدا بۆم ڕوون دەبێتەوە ئەوەی کە ناوم نا بە "ئاکارێکی لایکی" لە ڕاستیدا "ئاکارێکی سروشتی"یە، ئاکارێکە کە تەنانەت پیاوانی "بڕوادار"یش ڕەتی ناکەنەوە. "غەریزە-لاشعور"ی سروشتی، پاش ئەوەی تەواو پێدەگات و خۆی هوشیار دەکاتەوە، ئایا نابێتە بنچینەیەک کە گەرانتی تەواومان بداتێ؟ بێگومان دەبێ بزانین کە نابێتە بزوێنەر و جڵەوی حەقیقەت، "چونکە" ئەوەی کە "بڕوادار" نییە دەتوانێ بڵێت، "کەس بەو خراپە و گوناهە نازانێت کە من خەریکم بە نهێنی ئەنجامی دەدەم". بەڵام لێرەدا بە چاکی سەرنج بدەن، ئەوەی کە "بێبڕوا"یە "واتە بڕوای بە ئاین نییە" وا هەست دەکات هیچ کەسێک نییە لە سەرەوە چاودێری بکات، کەواتە ئەوەش دەزانێ -بە تەواوی بە هۆی ئەمەوە- کە هیچ کەسێکیش نییە کە بتوانێ لێی ببوورێت. لەبەرئەمە زۆرباش دەزانێ ئەگەر خراپەیەکی کرد، ئەوا تەنیایی و دوورەپەرێزییەکی بێسنوور چاوەڕوانی دەکات و مردنیشی بێحەد نائومێد و بەدبەختی دەبێت. لەبەر ئەمانە بە ئەوپەڕی توانایەوە هەوڵ دەدات، زیاتر لە کەسێکی "بڕوادار"، بە داننان بە هەڵەکانیدا لە بەردەمی خەڵکدا خۆی پاکبکاتەوە، لە دڵەوە داوای لێبوردن لە "ئەوانی تر" بکات. ئەم حەقیقەتەش لە وردیلە دەمارەکانیەوە دەزانێ، کەواتە پێشوەخت دەزانێ کە دەبێ ئەم بەرامبەر بە "ئەوانی تر" لێبوردوو بێت. ئەگەر وا نەبێ چۆن دەتوانین شەرحی ئەوە بکەین کە "پەشیمانی" شعورێکی هوشیارکەرەوەیە تەنانەت لە لای کەسانی "بێباوەڕ"یش؟

بێگومان من مەبەستم نییە هەڵوێست وەرگرتنێکی توند و ڕەق لە نێوان ئەوانەدا دروست بکەم کە بڕوایان بە تاکخوایی و پەیامە ئاسمانییەکان هەیە، لەگەڵ ئەوانەدا کە بڕوایان بە هیچ پرینسیپێکی سەروو تاکەکەسی نییە. لێرەدا دەخوازم ئەوە بخەمەوە یاد کە گەورەترین کتێبی "سپینۆزا"[12] بە ناونیشانی "ئاکار" بوو، کە سەرەتاکەی بە پێناسەیەک بۆ "خودا" دەستی پێکردبوو، وەک هۆ و هۆکاری خودی خۆی لە قەڵەمی دابوو. دەبێ ئەوەش بڵێم ئەم "خودا سپینۆزییە"، نە ئەوەیە کە لە ئاسمانەوە پەیامەکان دەنێرێ و نە ئەوەشە کە تاکەکەسەکان بۆ خۆیان

دروست کردووە: هەروەها لە تێڕوانینی ئەو دیدەوە کە تەنیا "مادەیەکی گەردوونی" هەیە کە ڕۆژێ لە ڕۆژان هەر هەمووومان هەڵدەمژێتەوە، دەکرێ تێڕواونێن و دیدێك بۆ لێبووردن و پێکەوە هەڵکردن و چاکەخوازیی سەرهەڵبدات، بە تایبەتی لەبەرئەوەی لە بەرامبەری تەوازن و هارمۆنیای ئەو تاکە مادە گەردوونییەدا هەر هەموومان هەمان بەرژەوەندی و ئینتەرێسمان[13] هەیە. هەمان ئینتەرێسمان هەیە لەبەرئەوەی، بە شێوەیەك لە شێوەکان، وای بۆ دەچین کە مەحاڵە ئەم مادە گەردوونییەش بە شێوەیەك لە شێوەکان گەشەی نەکردبێت یان تێك نەچووبێت، بە هەمان شێوەی کە بە درێژایی هەزاران ساڵ بەسەر ئێمەدا هاتووە. بەم شێوەیە دەمەوێ بڵێم (ئەمەش بۆچوونێکی میتافیزیکی نییە، تەنها ڕێگە بەخۆدانێکی شەرمنە بەو هیوایەی کە ئەو هەرگیز بەجێمان نەهێڵێ) کە تەنانەت لەو حاڵەتەشدا، دەکرێ سەرلەنوێ کێشە و مەسەلەی ژیانێك بێنینەوەپێش پاش مردن. ئەمڕۆ گەردوونی ئەلەترۆنیك پێشنیازی ئەوەمان بۆ دەکات کە بروسکەکان لە تۆمارگەیەکی فیزیاییەوە بۆ تۆمارگەیەکی تر دەگوێزرێنەوە بە بێ ئەوەی هیچ خەسڵەتێکی خۆ دووبارەکردنەوە ون بکەن، ئەمەش دەکرێ هەنگاوی گەورەتری بەدوادا بێت، تەنانەت وای بۆ دەچن لەو لەحزەیەدا کە تۆمارگەیەك جێدێڵن و هێشتا نەگەشتوونەتە تۆمارگەکەی تر، ئا لەوێدا وەك بوونێکی نامادەیی لۆگاریتمی پوخت بژین. کەواتە کێ دەزانێ گەر "مردن"، لە بری ئەوەی پوکانەوە بێت، تەقینەوە و چوونە نێو قاڵبێکی ترەوە نییە، لە گۆشەیەك لە گۆشەکانی ئەم گەردوونەدا، بەو "*Software*"[14]ەوە (کە خەڵکی تر پێی دەڵێن "ڕۆح") کە ئێمە لە ژیانماندا گەشەمان پێداوە، بێگومان پێکهاتووە لە یادەوەری و پەشیمانی تاکەکەسیشمان، کەواتە خەم و نیگەرانی چارەسەرنەکراو، یان ئاسوودەیی تەواو بۆ ئەو ئەرکەی کە بەجێمان هێناوە، یان خۆشەویستی، هەموویان وەکو خۆیان دەمێنن.

بەڕێزتان دەڵێن، هەموو "ئاکارێکی لایکی–ئەخلاقێکی عەلمانی" بە بێ نموونە و گوتەکانی "مەسیح"، لە بنچینەوە بێبەشە لەو ڕاستیانەی کە بتوانێ مایەی بڕواپێکردنێکی دڵنیا بێت. باشە لەبەرچی مافی سوودوەرگرتن لە نموونەی "مەسیح"ێکی بەخشندە و لێبوردوو، لەو کەسە "لایکی"یە زەوت کرێت؟ "کارلۆ ماریە مارتینی"، هەوڵ بدە، لە پێناوی ئەم گفتوگۆیەمان و ئەوەی کە خۆتان بڕواتان بە بەراوردکردنی هەیە، ئەو گریمانەیە لەبەرچاو بگرن، گەرچی تەنها بۆ یەك لەحزە بێت، کە خودا بەو شێوەیە نەبێت کە بڕواتان پێیەتی: مرۆڤیش بە هۆی هەڵەیەکی گەورەوە، لەسەر ئەم زەوییە دۆزرابێتەوە و زاوزێی کردبێ، لە لایەك تەسلیم بە چارەنووسی "مردن" کرابێت و لە لایەکی ترەوە حوکمدار بێت بەوەی بیردەکاتەوە و هوشیارە "ڕێم بدەن لێرەدا تۆنێکی "لیۆپاردی[15]"" بەکاربێنم)، کە بە هۆی ئەو هوشیارییەوە بووبێتە ناتەواترین بوونەوەر. ئەم مرۆڤە، بۆ دۆزینەوەی ورەی چاوەڕوانکردنی مردن، بە پێی پێویست بووە بە گیانلەبەرێکی خواپەرست، بیر و خەیاڵی خستۆتە کار بۆ دروستکردنی چیرۆك و بەسەرهاتێك کە لە توانایدا هەبێ بیگەیەنێتە تەفسیرێك، مۆدیلێك، شێوە و ڕوخسارێکی نموونەیی. پاشان لەنێو هەموو ئەوانەدا کە بیر و خەیاڵی مرۆڤ پێی گەیشتووە – هەندێکی جوان و هەندێکی ناشیرین و هەندێکی چیرۆکی زۆر هەستبزوێن و دڵنەواکار بوون– لە یەك ساتەوەختی دیاریکراودا، لە پانتایی ئەو زەمەنە دوور و درێژەدا، هێزێکی خواپەرستی و ئەخلاقی و

شاعیری ئەوتۆ دروست دەبێ کە بتوانێ مۆدێلی "مەسیح" بهێنێتە دنیاوە، "مەسیح" بە خۆی و بانگەوازی خۆشەویستی گەردوونییەوە، بە خۆی و بانگەوازی لێبوردن لە دوژمن، بە خۆی و بانگەوازی بەخشینی ژیان لە "هۆلۆکۆست"[16]دا بۆ ڕزگارکردنی ژیانی "ئەوانی تر". ئەگەر من گەشتیارێکی ئەستێرە دوورەکانی "گەلاسییەکی"تر بم و خۆم لە بەرامبەری بوونەوەرێکدا ببینمەوە کە زانیویەتی مۆدێلێکی لەم چەشنە پێشنیاز بکات، شانازی دەکەم بەوەوە کە توانیویەتی ئەو هەموو وزە و توانا تیۆلۆژییە بخاتە ژێر ڕکێف و دەسەڵاتی خۆیەوە، وە لە لایەکی ترەوە ئەم بوونەوەرە بەدبەخت و نەناسراوە، کە چەندین کارەساتی مەترسیداری ئەنجام داوە، بە شایستەی ئازادبوونی دەزانم، ئەمەش بە تەنها لەبەرئەوەی توانیویەتی سەرکەوتوو بێ لە هیوا و بڕوایدا بەوەی کە ئەم شتانە هەموویان "حەقیقەتن".

ئێستا واز لە گریمانەکە بێنە بۆ خەڵکی تر: بەڵام دان بەوەدا بنێ کە ئەگەر "مەسیح" بە تەنها پاڵەوان و کەسایەتی چیرۆکێکی گەورەش بووبێت، ئەم چیرۆکەش زادەی بیر و خەیاڵی ئەو گیانلەبەرە دووپێ و پێست ناسکە بێ کە بە تەنها هەر ئەوە دەزانێ کە هیچ نازانێ، ئەمە بۆ خۆی موعجیزەیەکە (نهێنییە موعجیزە ئامێزەکەش) ئەوەیە کە ئەم کوڕە تاقانەیەی "خوای گەورە"[17] لە قاڵبی مرۆڤ و لە گۆشت و ئێسقان دروست دەبێ. ئەم نهێنییە سروشتی و زەمینییە دەستەوەستان نەبووە لە نائارامکردن و گومان دروستکردن لە دڵی ئەوانەدا کە بێباوەڕ بوون.

لەبەرئەمە، من لەو بڕوایەدام، ئاکارێکی سروشتی- کە لە قووڵایی خواپەرستیدا ڕێزی لێگیراوە و بۆتە جەوهەری ئاینەکان- لە خاڵە بنچینەییەکاندا، بتوانرێ لەگەڵ پرنسیپەکانی ئەو ئاکارەدا یەکبگرێتەوە کە لەسەر بناغەی بڕواهێنان بە تاکخوایی دامەزراوە. ئەو ئاکارەی ناتوانێ دان بەو ڕاستییەدا نەنێ کە پرینسیپە سروشتییەکان لەناو دڵماندا و لەسەر بنەمای پڕۆگرامێک بۆ خۆڕزگارکردن نەخشێنراون. خۆ ئەگەر وا نەبێ و هەر لە پەراوێزە نەبینراوەکاندا بمێننەوە، کە بە دڵنیا هەر لەوێ دەمێننەوە، ئەوا لە ڕووبەڕووبوونەوەی ئاینە جیاوازەکاندا، لەوە جیاوازتر ڕووداوات کە ڕوویان داوە. لە کۆتاییدا، لە بەیەکدادانەکانی "باوەڕ"دا پێویستە نرخ بۆ "بەزەیی" و "دڵفراوانی" دابنرێ.

## پەراوێزەکانی وەرگێڕ

*ناونیشانی وتارەکە بە ئیتالی: *Quando Entra in Scena L'altro*

هەموو ئەو وشە و ڕستانەی بەلای نووسەرەوە مەبەست بوون لە نێوان (دوو کەوانەدا) یان دوو خەتی - کورتدا-یان دوو جووت "فاریزەدا" دانراون، هەموو "دوو جووت کەوانەکانیش" بە پێی پێویست و بۆ زیاتر ڕوونکردنەوە خۆم دامناون. ئەو وشانەی نووسەر بە (لاریی) نووسیونی، من بە فۆنتێکی تۆخ نووسیومەتەوە.

*1*-کارلۆ ماریە مارتینی *-Carlo Maria Martini-* پیاوی ئاینی و ڕووناکبیری ناسراوی ئیتالییە، پلەی کاردینالی هەیە و شارەزاترین کاردینالی ڤاتیکانە بۆ کێشە مۆڕاڵی و تیۆلۆژییەکان.

*2*-نووسەر بە تەنها مەبەستی لە پیاوانی ئاینی مەسیحییە.

*3*-ئەم گوزارشتەی نووسەر مەبەستی لە دیدی ئاینده بین و پێشکەوتووخوازە لە خواناسیدا بە مانا فراوانەکەی.

*4-Etico* – ئێتیك: زانستی ئەخلاق، من وشەی (ئاکار)م لە بەرامبەردا بەکارهێناوە.

*5-Semantica*– سیمانتیك.. لە زمانەوانیدا: ئەو زانستەیە کە دیراسەی (دال)ەکان و (لفظ)ەکان و بەرەوپێشەوەچوونیان دەکات. لە فەلسەفەدا: بەشێکە لە زانستی (منطق – لۆژیك) کە سنوورەکانی زمانێکی ڕاست و ڕەوان دیاری دەکات، ڕەمزە زمانەوانییەکان هەڵدەسەنگێنێ، دیراسەی پەیوەندی نێوان گوزارشتە زمانەوانییەکان و ئەو جیهانەی ئەو گوزارشتانەی بۆ دەکرێ، دەکات.

*6-massmedia* – ماس مێدیا– هۆیەکانی ڕاگەیاندن.

*7-San Bartolomeo*– سان بارتۆلۆمێ، زیاتر بە (شەوی سان بارتۆلۆمێ) ناسراوە لە مێژوودا، یەکێکە لە کارەسات و ڕووداوە هەرە خوێناوییەکانی ژیانی مەسیحییەت لە سەدە تاریکییەکاندا، لە فەرەنسا و لە نێوان ڕێبازە جیاوازەکانی ئەو ئاینەدا ڕوویداوە و قەتڵوعامێکی گەورەی تیا ئەنجام دراوە.

*8*-مەبەست لەو کەسانەیە کە بڕوایان بە ڕاستییەکانی ئاینی مەسیحی نامێنێ یان گومان لە نوسراوە پیرۆزەکانی دەکەن. بە کوردییەکەی لە دین لائەدەن.

*9-L'Eden*– مەبەست لەو زەویەیە کە خودا ئادەم و حەوای بۆ دەنێرێ پاش سەرپێچی لە بەهەشتدا -خبات عدن-.

*10-Etnia*–ئێتنی: کۆمەڵ بوونی مرۆڤ و دروستکردنی کۆمەڵگا لەسەر بناغەی خەسڵەتە نەژادیی و کەلتوری و زمانەوانییە هاوبەشەکان.

*11-Paradossale*– پارادۆکس: دژبوونی ڕووکەش، هەر شتێ خەسڵەت یان شێوەی "دژبوون– متناقض"ی ڕووکەشی هەبێت.

*12-Spinoza*– سپینۆزا: فەیلەسووفی هەرە ناوداری هۆڵەندییە (*1632–1677*).

*13*–ئینتەرێس– *interssi*– بەرژەوەندی.. لە هەندێ شوێندا بە مانای (بایەخ) بەکاردێ.

*14-Software*– لە دوو بەش پێکهاتووە (*Soft*–نەرم) و (*Ware*–مێتاڵ) لە زانستی ئینفۆرماتیکەدا پێچەوانەی (*Hardware*)ە. ئەو بەشە پڕۆگرامەیە کە چارەسەری کێشە زۆر تایبەتی و تایبەتمەندییەکان دەکا.

*15-G. Leopardi*– جاکۆمۆ لیۆپاردی.. شاعیری گەورەی ئیتالی (*1798–1837*).

*16-Olocausto*– ئۆلۆکاوستۆ یان هۆلۆکۆست.. لە ئاینە کۆنەکانی یۆنانی و یەهودیدا بە مانای خۆبەختکردن بۆ یەزدان هاتووە، کە کەسی خۆبەختکار دەبوو خۆی بسووتێنێ هەتا دەبێتە خۆڵەمێش. لە سەردەمی نوێدا، یەهودییەکان بۆ گوزارشتکردن لە چارەنووسی یەهودییەکانی ئەوروپا بەکاریان هێناوە کە دووچاری جینۆساید بوون لە لایەن نازییەکانەوە. وشەکە لە دوو بەش پێکهاتووە (سەرتاپا + سووتان).

*17*–مەبەست لە (عیسا) پێغەمبەرە، کە خۆی بە کوڕی خوای گەورە ناساندووە و ئەمەش بنچینەی ئاینی مەسیحییەتە.

*بە لاتینییەکەی نووسەر ئەمەی نووسیووە: (*Cujus deus Venter est*)

## تێبینی

بۆ ئەم زانیارییانە کەڵکم وەرگرتووە لە:

*1-il Vocabolario GARZANTI della lingua italiana.*

*2-il Petit Robert.*

*3-Enciclopedia Britanica.*

بۆ سەرچاوەی وتارەکان بگەڕێرەوە بۆ هەمان سەرچاوەی وتاری یەکەم و دووەم و سێهەم.

ژمارەکانی *17* و *18*ی گۆڤاری سەردەم

# سەردێڕی جوانی ناسیی فاشیزم

## لە قەفەزی ئاژەڵە کێوییەکانەوە تا پێشانگای هونەری داڕماو

**ناسر فەکووهی**

لە فارسییەوە: ئەنوەر هوژەبری

**"فاشیزم و نیگارکێشی"**

تایبەتمەندیی جوانی ناسانەی فاشیستی لە نیگارکێشی و پەیکەرتاشیدا جیاوازی و دژایەتیی لە بڕان نەهاتوویەتی لەگەڵ مۆدێرنیتەی هونەریدا، بەو هۆیەوە دەرکپێکردن بەو دیاردەیە نالوێت بە مەرجێ مۆدێرنیتە ڕاڤە نەکرێت و شی نەکرێتەوە. سەدەی بیستەم بە سێ بزاڤی گەورەی هونەری دەستی پێکرد کە هەرکامەیان چارەنووسیان لەگەڵ فاشیزمدا جیاواز بوو و لە پێوەندیشیان لەگەڵیدا هەر جیاواز بوون. فۆویزم لە فەڕەنسەدا، فۆتۆریزم لە ئیتالیادا و ئیکسپرسیۆنیزم لە ئەڵمانیادا. ناسینی ئەم سێ بزاڤە یارمەتیدەرە بۆ ناسینی دژە سەرچەشنی[1] هونەری فاشیستی: فاشیزم وەکو پەرچەکردار[2] لە بەرانبەر مۆدێرنیزمدا، تابلۆیەکی ئاوەژۆیە[3] لەو بزاڤە.

**فۆویزم:**

پێشانگای ساڵانەی نیگارکێشی پاریس لە پایزی *1905*دا جەنجاڵی نایەوە. تابلۆکانی یەکێك لە هۆڵەکان بە ڕادەیەك ڕەخنەگرانی هونەری تووڕە کرد کە هۆڵەکەیان بە "قەفەزی ئاژەڵە کێوییەکان *Lacageauxfauves*" ناوبردە کرد. فۆویزم کاتێ هاتە مەیدانەوە کە لە ڕەنگی زیندوو بزوێنەر و هێڵکاریی سادەو بێ پێچ و پەنا کەڵکی وەردەگرت. ماتیس (*Matisse، 1869 – 1954*)، مارکە (*Marquet، 1947– 1875*)، دورێن (*Derain، 1954 – 1880*)، ڤولامینك (*Vaminek، 1876–1958*)، کاموان (*Camoin، 1969– 1879*)، ڤان دۆنگێن (*Vandongen، 1876–1968*) و براك (*Bracques، 1882–1963*) لەو کەسانە بوون کە تا ڕادەیەك نەناسراو بوون و بە تایبەتمەندییە شاردراوەکانیانەوە پێکەوە گرێ ئەدران.

سادەیی چوارچێوە و هێڵەکان، ناڕاستیگەریی ڕەنگ و هێڵکاری، سڕینەوەی پرێسپێکتیڤ و

بەکاربردنی توندوتیژی لە ڕەنگدا لە نیگارەکانی ماتیسدا، هێڵکاری بە هێڵی کورت و نارێك و لابردنی وردەکارییەکان لە نیگارەکانی مارکەدا، پێداگری لەسەر ڕەنگەکان و هەوڵدان بۆ گوێزانەوەی هەست لە دووتوێی ئەوانەوە لە نیگارەکانی دورێندا، دوورکەوتنەوە لە ڕاستەقینە لە ڕەنگەکاندا لە نیگارەکانی ڤۆلامینگدا، کەڵك وەرگرتنی پارێزکارانە لە ڕەنگ و پرێسپێکتیڤ لە نیگارەکانی کاموواندا، ئاڕاستەبوونی ئیکسپرسیۆنیستی، هێڵکاریی کاریکاتێریانە و ڕەنگگەلی دەستکرد لە نیگارەکانی ڤان دۆنگێندا و، لە ئاکامدا دوورکەوتنەوە لە پرێسپێکتیڤ و پێداگری لەسەر پانتایی ڕەنگە خاوەکان لە نیگارەکانی براکدا، هەموو ئەمانە ڕوونکەرەوەی مەیلێکی پەرەئەستێن بوون بۆ بەرهەڵستکاری لە بەرانبەر کلاسیکگەریدا و دەسەڵاتدارکردن و سەقامگیرکردنی نیگارکێشی مۆدێرن.

فۆویزم لە نیگارکێشیدا درێژەی ژێرانەی بزووتنەوەیەك بوو کە سی ساڵ پێشتر دەستی پێکردبوو. لە ڕاستیدا نیگارکێشی سەدەی بیستەم لە یەکەمین پێشانگای بەرهەمەکانی ئیمپرسیۆنیستەکاندا کە بە شێوەی نارەسمی لە ساڵی *1874*دا بەڕێوە چوو، بانگەشەی بۆ خۆی کرد. سەدەی نۆزدەهەم کە بە یەکەم ساڵەکانی شۆڕشی فەرەنسە و مۆدێرنیتەی سیاسی دەستی پێکردبوو بە ڕووبەڕووبوونەوەی چڕوپڕ لەگەڵ کلاسیکگەری لە لایەکەوە و ئیمپرسیۆنیزم لە لایەکی دیکەوە، ئەهاتە کۆتایی. کلاسیکگەریی سەر چەشنێکی بالای هەبوو: هونەری یۆنانی کۆن و ڕۆم. جوانی لە ڕوانگەی نیگارکێشە کلاسیکییەکانەوە فێرکاریانە و ئاکاریانە[4] بوو و پێویستی بە زمانێك بوو کە ڕێساکانی لە پێشدا ڕێکخرابوو. جوانی لە لای ئەوان مانایەکی جیا لە خانەدانێتی[5] و پێگەیشتوویی نەبوو. کلاسیکەکان ڕوانگەی بیرۆکە (ایدە)ی ئەفلاتۆن و ڕواڵەتی ئەرەستۆیان لە ڕۆژڤە راستییەکان[6] بە بایەختر دادەناو لەو بڕوایەدا بوون کە شێواز (*Style*)، بالاترین ئەرکی هونەرمەند، بۆ چاکسازیکاریی[7] ڕاستەقینە، لە ناوەوەی هونەرەکەی خۆیەوە هەڵدەستێت.

ئاکام ئەوەیە کە کلاسیکگەریی لەگەڵ خۆپاراستن (محافظە کاری) و مانەوەی ئەو دۆخە سیاسیەدا "تەبایی"[8] هەبوو کە شۆڕشی فەرەنسە تێکی شێواندن.

هەڵکەوتووترین نوێنەری کلاسیك لەو سەردەمەدا، ئینگەر (*Ingres*، *1780–1867*) نیگارکێشی فەرەنسی بوو کە لە کارە هونەرییەکانی خۆیدا بایەخی زۆری بە هەڵبژاردنی بابەت لە مێژوو، ئوستوورە، ئایین، فێرکاری و ڕاڤە و ئاکار ئەدا. ئینگەر لە شێوازدا بەرزترین بایەخی هونەری لە شێوەی کێشانی هێڵدا ئەبینی. هێڵگەلی ڕوون و ڕێك لەسەر زەمینەیەکی تێر یان سارد، کە لە بەرانبەر چەقبەستوویی بابەتدا ئەکەوتە پشتی پەردەوە.

ئینگەر پێی لەسەر ئەوە دائەگرت کە هەرگیز لە ڕەنگی گەرم، ئەو ڕەنگانەی کە بە ڕەنگگەلی (دژە مێژوویی) ئەزانێت، کەڵك وەرنەگرێت.

لە بەرانبەر ئینگەردا، دولاکروا (*Delacroix*، *1798–1863*) نموونەیەکی هەڵکەوتوو و سەربزێر[9] بوو. ئەو بابەتانەی کە بۆ بەرهەمەکانی هەڵدەبژاردن ڕۆژڤە ڕاستییەکان و لە مێژوودا ڕووداوەکانی سەردەم بوون. دولاکروا ئەگەرچی پتر هەستی دژەئاکاری دەردەبڕی، خەریکی دەربڕین و بەرجەستەکردنەوەی ڕاستەقینە بوو. تەنانەت لە ئاساییترین ئاستی ڕاستیدا و بە جێگەی هێڵی کلاسیکییەکان، ڕەنگی مۆدێرنی خستە بەردەست.

ڕەنگ هێندە بەرجەستە دەبۆوە کە هێڵەکانی دادەشارد. ئاسۆ و سنوورە جیاکەرەوەکان دیار نەبوون و زەمینە تا ئەو ڕادەیە خۆی ئەکێشایە دەرەوە کە بە بارستای بابەت گرنگی پەیدا ئەکرد.

ئەگەر ویستبێتمان لەگەڵ دلا کروادا نیگارکێشێکی دیکە، بە هەمان شێوە نیگارکێشانەوە لەو سەدەیەدا ناوبەرین، بێگومان ئاماژە بە کۆربە (*Courbet*، *1819–1877*) ئەکەین کە لە دامەزرێنەرانی سەرەکی قوتابخانەی ڕیالیزم بوو. ئەو کارەی کە دۆمیە (*Dumiar*) لە هەڵکەندن[10] و کاریکاتێردا گەیاندیە لووتکە، کۆربە لە نیگارکێشیدا بە ئاڕاستەبوونێکی ئاشکرا بەرەو بابەتی ڕۆژانە و کەسێتییە جەماوەرییەکان دەستی پێکرد و هەر بەو هۆیەوە لە لایەن ئاکادیمییەوە ڕاونرا. وێڕای ئەمانەش کۆربە لە تەکنیکدا پتر لە بابەت بەرەو سوننەت ئەگەڕایەوە لەم ڕوانگەیەوە ئەکەوتە بەستێنی کارەکانی ئینگەرەوە، نەک کارەکانی دولاکروا. ئەمەیش لەوانەیە، یەك لەو هۆیانە بووبێت کە لە کۆتایی تەمەنیدا بەرەو شوێنکەوتوویی کلاسیك گەڕایەوە. بەڵام ڕیالیزمی کۆربە، پاڵی بە مۆنە (*Monet*، *1840–1926*) و مانە (*Manet*، *1932–1883*)ەوە نا کە هەردووکیان پێشەنگی ئیمپرسیۆن بوون. دژایەتی بنەڕەتی ئەم سەدەیە، دژایەتیی نێوان ئینگەر و دولاکروا بوو کە بنەچەی ئەگەڕایەوە بۆ سەدەی حەڤدەیەم و ڕووبەڕووبوونەوەی خۆپارێزەکانی ڕۆبنیست (*Roubinistes*) کە گرنگییان بە ڕەنگ ئەدا و ئەو دژایەتییە بە شێوەیەکی بەردەوام تا سەدەی بیستەمی خایاند و لە ڕاستیدا بوو بە ڕووبەڕووبوونەوەی تەشك[11] و ناوەڕۆك و بەدەر لەمەیش دژایەتی (ناوەکی) و (دەرەکی). نیگارکێشی مۆدێرن ڕواڵەتێکی تازە بوو. تەشکێکی شۆڕشگێڕ و بەرهەمی شۆڕش. لە نیگارکێشی کلاسیکدا بابەت پێوەندییەکی باڵا بوو لە نێوان نیگارکێش و میتافیزیکێکی ئیلاهی یان ئەساتیریدا. بەڵام لە نیگارکێشی مۆدێرندا بابەت پێوەندە لە نێوان نیگارکێش و بینەردا. نیگارکێشی کلاسیك لە شوێنکاری خۆیدا وەکو پەرستگەیەك لە کونجێکەوە گۆشەگیر ئەبوو و لە زەینی خۆیدا لە دووتوێی ئوستوورە و چیرۆکە ئاینییەکانەوە بۆ ئەفرێنەری خۆی دەگەڕا و لای وابوو ئەرستۆ ڕاست بووە لەوەدا کە تایبەتمەندیی مرۆڤ لاسایی کردنەوەیە، ئەفراندنی هونەری لە زەینی ئەودا لاسایی کردنەوەی کردەی خوایە، یان جوڵانەوەیەکە بە مەبەستی نزیکبوونەوە لە زاتی بەرز و باڵا.

نیگارکێشی کلاسیك هونەرەکەی خۆی بە فێڵبازێکی وردکارانە ئەزانی کە ئەبوا بە وەسواسێکی زۆرەوە و بەپێی بەرزترین سەرچەشنەکان بەدی بهاتبا. ڕاستبوونەوەی وەسواسی ئەفرێنەر (خوا) لە کاتی ئەفراندنی مرۆڤدا و سەرچەشن و ڕواڵەتی وەرگیراو لە ئەفرێنەری تاك، وەکو ئەو لە ئەفراندنی مرۆڤدا. بەڵام نیگارکێشی مۆدێرن ئامێر و کەرەستەکانی بە کۆڵەوە ئەگرێت و ئەچێتە دەرەوە بۆ ناو داوێنی سروشت و ئەوەی کە بەرچاوی ئەکەوێت، بەبێ ڕەنج و زەحمەت و بە شێوەیەکی ئازادانە، بە پەرەمووچی[12] ئەسپێرێت، کە بە هەڵپەهەڵپ لە ڕەنگ هەڵدەکشێت و نەستی نیگارکێش لە تابلۆی نیگار دەخشێنێت، بابەت ئەنیشێتە سەر تابلۆ و لەودەمەدا ئازادە بەو جۆرەی کە چوارچێوەی تەنگەبەری تابلۆ بەجێبهێڵێت و بە کەیفی خۆی هەنگاو بنێتە ناو ئەندێشەی بینەرەوە و هەر جارەیش بە ڕواڵەت و تەشکی تازەوە هەستگەلێکی نوێ ببزوێنێت. نیگاری مۆدێرن ئەگوشرێتە ناو (نیگا)وە، ئەو

نیگایەی کە بینەر بەرەو بابەت ئەیهاوێژێ و ناوەرۆکی بابەت دیاری دەکات.

ئیمپرسیۆنیزم بە ماوەی یەك دوو دەیە، بووە هۆی بەدیهاتنی ئیمپرسیۆنیزمی نوێ و پۆست ئیمپرسیۆنیزم و دێوزیۆنیزم (جیاکاری کردن) واتە جیاکردنەوەی ڕەنگ و چوارچێوە و دابەشبوونیان بە کەرتە جیاوازەکان لەسەر تابلۆدا کە تەنیا لە نیگاو زەینی بینەردا ڕواڵەتی ڕاستەقینەی خۆی دەرئەخات، تەکنیکێك بوو کە بە تایبەت لە سورا (*Seura*)وە دەستی پێکرد. سورا خۆی ئەم شێوازەی بە ڕەنگ تیشکگەرایی (*Chrmluminarisme*) ناوبردە کرد. چونکە مەبەست ئەفراندنی ڕووناکی بوو بە کەڵك وەرگرتن لە هاوتەنیشت کردنی پەڵە ڕەنگینەکان، بە جێگای تێکەڵکردنیان، پاشان قوتابخانەی سورا لە لایەن سیناك (*Signac*) و شێوازە خاڵدانانەکەیەوە (پوانتیلیم)، بەهێز کرا و درێژەی پێدرا و ئیمپرسیۆنیزمی نوێی کرد بە یەکێك لە سەرچاوەکانی ئیکسپرسیۆنیزم.

ڤان گۆگ، گوگێن و تولۆزلوتریك نوێنەرانی درێژەپێدەری هونەری ئیمپرسیۆنیزمی بوون کە هەموویان بە بەرهەمەکانیانەوە بەرانبەر بە سوننەتی کلاسیکگەری ئەوەستان. ڤان گۆگ هەرگیز نەدەترسا لەوەی کە ڕەنگەکانی سروشت بە خواست و ئیرادەی خۆی بگۆڕێت تا هەستی دەروونیی خۆی بگوێزێتەوە سەر تابلۆ. گوگێن بە بەوێنەکردنی جوانیی ئافرەتە نیوەڕووتە ڕەش پێستەکان و مرۆڤەکانی بەرایی[13] گاڵتەی بە شارستانیەتی ئەوروپا ئەکرد و لوتریك بابەتەکانی خۆی لە بەدناوترین گەڕەکەکانی پاریسدا بەدی ئەکرد و ژن و پیاوە خراپەکارەکانی ئەکردە وێنەی سەر تابلۆکانی خۆی. کاریگەریی ئەم هونەرمەندانە لە بەدیهاتنی بزووتنەوەی ئیکسپرسیۆنیزمیدا دیاریکەر بوو. ئەو سەرچەشنە هونەرییەی کە ئەوان ئەیانخستە ڕوو، باشترین جیاکەرەوە بوو[14] بۆ هەڵسەنگاندنی (هونەری داڕماو) لە ڕوانگەی فاشیزمەوە، ئیمپرسیۆنیزم لە بەرەو پێشچوونیدا لە فەرەنسە بەرەو دوو قوتابخانەی دیکە: واتە –کووبیزم و سوریالیزم– کێشرا، کە هەردوو ئەوانە کەوتبوونە بەر هێرشی توندوتیژی ئایدیۆلۆژیکیانەی فاشیزم و دژە سەرچەشنە هونەرییەکەی.

کووبیزم لە یەك کاتدا درێژە و لە هەمان کاتدا پچڕانێکە لە ئیمپرسیۆنیزم کە لە دووتوێی هونەری ڕەش پێستەکانەوە لەگەڵیدا گرێ ئەدرێتەوە. سێزان (*Cezanne*) باشترین و بەناوبانگترین ئاشکراکەری ئەو درێژەپێدان و لێك پچڕانە بوو.

پێوەندیی کووبیزم لەگەڵ ڕاستەقینە (واقیع)دا پێوەندییەکی مەعنەوی بوو نەك پێوەندییەکی بەرسڤی (بازتابی)، بەڵام کووبیزم لە ئیمپرسیۆنیزم پچڕا. نیگارکێشی ئیمپرسیۆنیست بە وتەی کان وایلەر، وێنەیەکی شەپۆلاوی، کاتی و تێپەڕ بوو لە واقیع، بەو شێوەیە کە ئەوەی کە لە پرتەیەکدا (لحظة) هەستی پێئەکرد لەسەر تابلۆدا ئەیکێشایەوە. ئەگەر لە دوورەوە بۆ خانوویەکی بڕوانیبا، سەرمیچی ئەو خانووەی تەنیا بە پەڵەیەکی ڕەنگین نیشان ئەدا و وێڕای ئەوەیش ڕەنگەکان مۆرکی کەش و سێبەر و هەوایان تێدابوو و لە تابلۆکەدا لە ئەسڵی خۆیان دوورئەکەوتنەوە، بەڵام نیگارکێشی کووبیست لە ڕوانینی هەندەسی و شیکارییانەی خۆیەوە بەو شێوەیە هەستی بە ڕاستی ئەکرد کە هەیە و، سەرمیچی خانووە دوورەکە ئەگەریش نەبینرابا بە هێڵگەلێکی هەندەسی و تێکشکاندنی وردبینانە دەرئەخرێن و ڕەنگەکان بەبێ لەبەرچاوگرتنی شوێن و کەش بە تایبەتمەندیی ڕاست و پرشنگدانەوەی

واقیعییانـەیان دیسـان دەرئەخرانــەوە. بـەڵام ئـەبێ ئاگـاداری ئـەوە بـین کـە هەندەسـەی کووبیسـتی هەندەسـەیەکە کـە لـە هەسـتی هونەرمـەندەوە هەڵئەقوڵێت و دژایەتییەکی ڕوون و ئاشکرای لەگەڵ هەندەسـەی سروشـتی و لـە ئەسـڵچووی هونـەری کلاسیکدا هەیە. هەندەسەی کووبیستی ئاشکرایانە و بـە شـێوەیەکی هەسـت بزوێـن لەگـەڵ جوانـی ئەرەسـتوویدا بـە شـەڕ دێـت. (خاتوونـەکانی ئاڤینیۆن)ی پیکاسۆ لەوانەیە باشترین نموونەی ئەو واتایـە بێـت. هاوکـات لەگـەڵ کووبـیزم و لەوانەیـە هـەندێ پێشتر، بزووتنەوەیەکی دیکە لە ئـەوروپای سەرەتای سەدەدا دەستی پێکردبوو: سـووریالیزم، کە بە بنەچە بزووتنەوەیـەکی ئەدەبی بوو. ئـاندرێ برۆتـۆن و فیلیـپ سـۆیۆ کـە لـەژێر کاریگـەریی فرۆیدیزمدا بوون چەمکی نووسراوەی ئۆتۆماتیکیان هێنایـە دی. مەبەسـت ئـەوە بـوو کـە نووسـەر بـە خێراییەك کە بـە پرۆسـەی ئـەفراندنی هونـەری کـە دەیبەخشـێتە پرۆسـەی ئـەفراندنی هونـەری، ئـەبێ هـەموو بەربەسـتەکانی (مـن- *Moi*)ی خۆوریـا (خودآگاه) لە زەینی خۆی دابماڵێت، بۆئەوەی (منی باڵا *Sumoi*) لـە دەرەوەی بەندوبەسـتەکانی لۆژیـك، ئاکـار، دابونـەریت و یاسـاوە خـۆی دەربڕێـت. سووریالیزم لە نیگارکێشیدا لە لوژیك، واقیعگەری و ئیمپرسیۆنیسـتی دوورکەوتـەوە، بـەڵام نـاکۆکی و دژایـەتیی خـۆی لەگـەڵ کلاسـیکگەریدا گـەیاندە ڕادەیـەکی زۆر بـەرز، لـێرەدا ئیـدی نـە بابـەت و نـە شـێواز (*Style*) بـە هیـچ جۆرێـك لەگـەڵ سەرچەشـنە ئوسـتوورەیی و ئاینییـەکاندا نزیکایـەتییان نـەبوو تەنانەت بە خێرایی شەپۆلێکی دژە ئوستوورە و دژە نـەریتیان خسـتەڕێ. ئاراسـتەبوونی دژە کڵێسـایی برۆتۆن کە لە ژمارەی سێهەمی گاڤنامەی (شۆڕشی سووریالیستی)یەوە و لـە ئـاوریلی *1925*دا شـەڕ بـە دژی کڵێسای لە نامەیەکی ئاوەڵادا بە پاپا ڕاگەیاند، لـە شـیعرەکانی پییـەری (*Peret*، *1959–1899*) لـە وێنـەکانی (مـەن ڕای) لـە سـینەمای بۆنویـل و لـە نیگارەکانی مەکس ئێنترنێت و سالڤەدۆر دالیدا، کە زۆر جـار ئـاژاوە و جـەنجاڵیان نایـەوە گەیشـتە ئاستێکی بەرز. ئەم ئاڕاستەبوونەی سووریالیزم، لە پێشـینە دادایسـتییەکەیەوە سـەرچاوەی ئـەگرت. داداییزم لە ڕاستیدا بزووتنەوەیەکی بێهودەیی و دژە بایــەخ و پەرچــەکردارێکی توندوتیــژ بــوو کــە هونەرمەندەکان لە بەرانبەر هەموو نەریت و بایەخە کۆنەکانی کۆمەڵدا، ئەو بایەخـەی کـە لـە کوشـت و کوشتاری شەڕی یەکەمی جیهانیدا خۆی نواندبوو، لـە خۆیـان پیشـانیان دا. خـاڵی دوایـی ئەوەیـە کـە سووریالیزم لەوانەیە بەو هۆیەوە کە سەرەتا لە ژێر کاریگـەریی ڕۆمـانتیزمی ئـەڵمانیدا بـوو، بـەردەوام ڕەنگێکـی دژە فاشـیزمی هـەبووە و لـە ڕاسـتیدا ئاڕاستەیەکی شۆڕشگێڕانەی لە خـۆی گرتبـوو، لـە پێشـانگای (هونـەری داڕمـاو)ی مۆنیخـی *1937*دا بەشـێکی زۆر بـۆ بەرهـەمی سـووریالەکان تـەرخان کرابـوو. هـەر بـەو هۆیـەوە لەگـەڵ هاتنـە سـەرکاری نازیـەکاندا، نیگارکێشـگەلی وەکـو ئێرنیسـت و بـە تایبـەت هـانس بێلمـەر (*H. Belmer*، *1975–1902*) کە لە ئۆرتیسمی توندوتیـژی ئامێزدا بەرهەمـەکانی بـە تـەواوی خـاڵی بەرانبـەری ڕیاکارییـە ئاکارییـەکانی فاشیزم بوو، ناچار بوون هەڵبێن.

### فۆتۆریزم:

لـە یەکـەمین سـاڵەکانی سـەدەی بیسـتەمدا، فۆتۆریزم سەرەتا لە فەڕەنسەدا دەرکەوت. مارینێتی (*marinetti*، *1944–1876*) نووسـەری ئیتـاڵی و بناخەدانـەری بزووتنـەوەی نـوێ، لـەو کاتـەدا لـە پـاریس ئـەژیا و تـارە فۆتۆریسـتییەکەی خـۆی کـە

کارتێکراوی هاماجی سەمبۆلیستی جەماوەرە ڕۆشنبیرەکانی فەڕەنسە بوو لە ساڵی *1909*دا بڵاوی کردەوە. فۆتۆریزم وەکو بزووتنەوەیەکی ئەدەبی هاتە بوون، ئەو بزووتنەوەیەی کە سەرەتا و بە تایبەت لە مەنگیو قەتیس مان و نەگۆڕیی کلاسیکگەری و ڕواڵتگەریی (پارناسینەکان)دا باڵای نواند. بەڵام لەگەڵ گەڕانەوەی مارینێتیدا فۆتۆریزم بە خێرایی خۆی کێشایە ناو هونەرەکانی دیکەوە، بە تایبەت ناو هونەرە شێوەکارییەکانەوە. ئەو بزووتنەوە نوێیە سەرکەوتنی خۆی لە ئیتالیای سەرەتای سەدەوە و بە تایبەت لە تێکەڵکردنی سەیردا ئەبینی کە لە نێوان نیهیلیزمە وێرانکەرەکەی لە لایەکەوە و گەشبینییە گێلانەکەی سەبارەت بە شارستانییەتی خاوەن تەکنۆلۆژی لە لایەکی دیکەوە هێنابوویە ئاراوە. ئاڕاستەبوونی شادومانانەو لەزەتخوازانەی (دیۆنیزۆسی) لە فۆتۆریزمدا، دانەویەك بوو لە تەشەنەکردنی نیچە لە ڕووبەڕووبوونەوەی لەگەڵ ئاوەزخواریدا کە مەیدانی بۆ خواست و غەریزەی ئینسانی والا کردبوو. بەڵام لێرەدا خێرایی (سرعت) جێگای خواستی گرتبۆوە. بەرجەستە بوونەوە و ئاشکرابوونی دینامیزمی پیشەسازی لە زەینی فۆتۆریستەکاندا، پرۆسەیەکی ڕووخێنەر بوو کە مەبەست لەوە وێرانکردنی هەموو بایەخە کۆنەکان و نەریتەکان و بە تایبەت بایەخە کۆنە هونەرییەکان بوو. مارینێتی ئەو درووشمەی ئەدا کە (کتێبخانەکان بسووتێنن، مۆزەخانەکان لە ئاو هەڵکێشن، تابلۆ پڕ شانازییەکان بخەنە ڕووبارەکانەوە، پاچ و بێڵ هەڵبگرن و شارە کەونارییەکان بڕووخێنن). دژایەتی فۆتۆریستەکان لەگەڵ ئاکادیمی و مۆزەخانەکاندا بە تەواوی بەو هۆیەوە بوو کە مۆزەخانە و ئاکادیمییەکان مەیلیان بە لای هونەری گشتی و جەماوەرییەوە هەبوو. حەز بە لە ناوبردنی هەموو سنوورەکانی (ئەفراندن) و (کردەوە) و بێگومان ئەم ئاڕاستە بوونە ئەیتوانی بچێتە سەر ڕێچکەی پۆپۆلیزمەوە و مەیدان بۆ گوتاری سۆسیالیزمەی ئامادە بکات. خانەدانێتی وەکو دیارترین نموونەی دەرکەوتنی نەریتەکان ئەبووە ئامانجی بەردەم هێرشی فۆتۆریزم. ئەم گوتارە لەگەڵ بەڵگەسازییە جوانی ناسییەکانی مارینێتی پێداهەڵدانی بە تەکنۆلۆژیا و ژیانی نوێدا نیگارکێشانی وەکو (بۆ کچیۆنی، کارێراوباللا)ی لە ساڵی *1910*وە لە دەوری تەوەرەی ڕاگەیاندنی نیگارکێشی فۆتۆریزم کۆکردەوە.

نیگارکێشی فۆتۆریستی، دینامیزمی ئەدەبی بزووتنەوەکەی بە شێوەی (سینەتیك). وێنەیەکی قەبە دەرهێنا و لە ئاماندا بووە هۆی توانەوەی (بابەت) لە (بزووتن)دا. بابەت بە دووپات بوونەوەی ڕواڵەتی (صوری) خۆی هەرچەندە هەستی، گۆڕان و پێشڤەچوونی ئەکردە زەینی بینەرەوە، بەڵام پتر بەرەو ڕووتبوونەوەو ڕواڵەتگەری پاڵی بە نیگارکێشەوە دەنا، بەڵام کێشەکە لەوەدایە فۆتۆریزم لە نیگارکێشیدا نەیدەتوانی بەرانبەر هونەرگەلی سینەتیکی بەهێزی وەکو وێنەگری و فیلمسازیدا درێژە بە تەمەنی خۆی بدات کە بە تازەیی سەریان هەڵدابوو. فۆتۆریزم لە لایەن کووبیزم و ئیکسپرسیۆنیزمەوە کاری تێکرا. لە ساڵی *1911*دا "بو کچیۆنی" و "کارێرا" پاش سەفەرکردن بۆ پاریس و ئاشنا بوون لەگەڵ کووبیزمدا تا ڕادەیەك ئاڕاستەیەکی کووبیستیان خستە بەردەمی دینامیزمی فۆتۆریستییەوە. مارلی (*Marchi*)یش ئاڕاستەیەکی ئیکسپرسیۆنیستی هەبوو و ئەم لاربوونەوەیە تا ڕادەیەك چووبووە پێشەوە کە جیهانێکی لە شانۆچووی (*Imagotheatri*) وێنا دەکرد. کە نامۆبوونی بارستاکان دینامیزمێکی

دیمەنسازی[15] تێدا بەدی بهێنێت. ئەم ئاڕاستەیە لە شێوە سەرچەشنی فۆتۆریستیدا و، لەوانە لەلای (باللاو- دێپێرۆ) و ئەو جلوبەرگەی تەڕاحییان کردبوو کە شێوە باوەکانی ڕۆژانە بکەنە دیمەنی شانۆ، ئەبینرا. لە پەیکەرتاشیشدا دیسان لە لایەن کەسانێکی وەکو دێپێرۆ و سێڤێرنیەوە (*Severini*) دەست درایە ئەفراندنی پەیکەرگەلێکی بزۆز[16] و دەنگدار کە جاروبار لە جێگایەکی وەکو (یاریگەکان) کۆدەبوونەوە، فۆتۆریستەکان بەم پێیە دەستیان دایە خوڵقاندنەوەی سەرلەنوێی جیهان بە پێی ڕوانگەی ماشینی خۆیان و دیمەنسازییان گەیاندە لووتکە. لێرەیشدا هەر ئیکسپرسیۆنیزم دیمەنسازی و گەورەکردنەوەی ڕواڵەت وەکو پردێک بوو کە ئەیتوانی جوانی ناسیی فۆتۆریستی و فاشیستی پێکەوە ببەستێتەوە. لە بیستەکاندا مارینێتیی پاش هەوڵدانێکی سەرنەکەوتووانە بۆ یەکگرتن لەگەڵ ئارناکۆسەندیکالیستەکان و یەکەمین دەستەکانی فاشیستی، شۆڕشی ئۆکتۆبەر کاری تێکرد و بەلای چەپدا کشا. لە کۆنگرەی دووەمی ئینتەرناسیۆناڵی کۆمۆنیستیدا کە لە ژولایی *1920* لە مۆسکۆدا بەڕێوە چوو، لۆناچارێسکی، مارینێتی بە شۆڕشگێڕ ناوبرد و ئەنتۆنیۆ گرامێشی نڤارکاریی[17] فۆتۆریستەکانی پەسەند کرد. ئەم قۆناغەی فۆتۆریزم کە بە قۆناغی میکانیکی ناودارە هەڵگری بایەخگەلی هەندەسی- میکانیکی بوو کە ئیلهامی لە ماشینیزم و پیشەسازی ئەگرت و لەگەڵ فاشیزم و ئایدیۆلۆژییە لادێیی گەرییەکەیدا ڕێک نەدەکەوت. کشانی هەندێ لە مۆسیقیزانە فۆتۆریستەکانی وەکو کازاڤۆلا (*Casavola*) و میکس (*Mix*) بەرەو مۆسیقی جازی ئەمریکی، کە پتر لە ئایدیۆلۆژیای فاشیست دووری دەخستنەوە ئەبێ هەر لەو چوارچێوەیەدا سەیریان بکرێت. لە ساڵەکانی *30*دا نیگارکێشی فۆتۆریست چووە ناو قۆناغێکی نوێوە. لەم کاتەدا مارینێتی بە خواستی دەسەڵاتی فاشیستی بە شێوەی ڕەسمی بووە ئەندامی ئاکادیمی. دەوڵەت بەو هۆیەوە کە دامودەزگایەکی بەربڵاوی بۆ پەرەپێدانی پیشەسازی ئاسمانی خستبووە ڕێ، فۆتۆریزمی هێنایە ژێر خزمەت کە بیرۆکەیەکی نوێ بباتە ناو جەماوەرەوە. مارینێتی بۆ یەکەمین جار بەیانێکی بە ناوی نیگارکێشی ئاسمانی (*Aeropeinture*) فۆتۆریستی بڵاوکردەوە کە بە هۆیەوە هونەرمەندەکان هەڵبنێت بە بەرهەمەکانی خۆیان دەست بدەنە گوێزانەوەی فەرهەنگی -ئوستوورەیی بۆ بە جەماوەری کردنی کاروباری دەوڵەتی. ئوستوورەگەلی (کاری پیشەسازی) و (کارگە) کە تایبەت بە فۆتۆریزمی میکانیکی دەیەی بیست بوو، جێگای خۆی بۆ (فڕین)، (هەواگەڕی) و (هێزی ئاسمانی) چۆڵ کرد. لە بواری شێوازەوە وەرگەڕان بۆ یەکەمین قۆناغی فۆتۆریستی و سینەتیکی هونەرییەکەی لێرەدا زۆر بەرچاو بوو. دینامیزمی ناوەکیی هونەر هەنووکە لەو ڕوانگەیەوە هەڵدەقوڵێ کە نیگارکێش لە گەردوونەوە بەرەو زەوی ئەڕوانێت. سینەتیکی هونەرمەند، سروشتی بە کەرەستەی یاری ئەزانی کە بەردەوام لە ڕواڵەت و ناوەڕۆکدا گۆڕانی بەسەردا دێت، لە شانۆیی چوویی جیهان، هاماج سازی ڕاستەقینە بەردەوام زیاد ئەبوو. سەربازیگەریی فاشیستی ڕێگایەکی دڵخوازی خۆی دۆزیبووەوە کە هونەرمەندەکان بکێشێتە ژێر خزمەت و پڕوپاگەندەی خۆیەوە. ئازاری (*Azari*)، پرامپۆلینی، فیلیا و ئۆریانا سەرکەوتووترین نوێنەرانی ئەم شێوازە بوون. تەمەنی فۆتۆریزم لە کۆتایی سەدەی *30*دا بە شەڕی دووەمی جیهانی کۆتایی هات. هەرچەندە مارینێتی لە بەرانبەری کاروباری خەبات بە دژی (هونەری داڕماو) کە لە لایەن ڕاستترین قۆڵی

فاشیستەوە دەستی پێکردبوو و هەموو هونەرمەندە پێشڕەوەکانی ئیتالیا، بە تایبەت فۆتۆریستەکانی ئەخستە بەر هێرش، هەڵوێستی نواند، بەڵام لە کاتی شەڕ و لە پڕوپاگەندەی ناسیۆنالیستی فاشیزمدا دەورێکی ئەوتۆی بینی. فۆتۆریزم، هەڵگری ئاراستەیەکی نیهیلیستی بوو کە ئیمکانی پێوەندییەکی شاردراوەی لەگەڵ فاشیزمدا هێنایە دی، بەڵام لە هەمان کاتدا، مۆدێرنیزمە ناوەکییەکەی ئەو پێوەندییە لەق و لەرزۆك کرد. هەروەها کە ئەبینین بیناسازی گرنگترین زەمینەیەك بوو کە پێوەندییەکی بەو جۆرەی بەدی دەهێنا.

**ئیکسپرسیۆنیزم:**

سەرهەڵدان و دڵەڕاوکێ دوو وشەی سەرەکین لە شێوازی ئیکسپرسیۆنیزمدا، سەرهەڵدان لە ئیکسپرسیۆنیزمدا پەرچدانەوەیەك بوو بەرانبەر پرۆسەی دێرڕەس و بە پەلەی بە پیشەسازییبوونی ئاڵمانیا پەرچدانەوەیەکی لە بنەچەدا بێهودەیی بوو، ڕوانگە و جێگرەوەیەکی نەدەخستەڕوو و پتر بە دڵەڕاوکێ و ملکەچییەك دەهاتە کۆتایی کە لە ڕەشبینی و بێ ئومێدییەوە سەرچاوەی ئەگرت.

گرووپی "پرد *Diebrucke*" لە ساڵەکانی *1905* تا *1913* سەرەتا لە دێرسەد و پاشان لە بەرلیندا هونەرمەندە شۆڕشگێڕەکانیان بە دەوری بلاڤۆکی (*Dersturm*) تۆفاندا کۆکردەوە. ئەم هونەرمەندانە کەسانێکی وەکو ئیمیل نۆڵدە (*E. Nolde*، *1956–1867*)، ماکس پێشتاین (*M. Pechstein*، *1881–1955*) و ئێرنێست لۆدویك کیرنشنۆر (*E.L. Kirchnor*، *1938–1880*) و چەند کەسێکی دیکە بوون کە هەموویان لە فوویزم، هونەری ئەفریقایی و هونەری بەردتاشیی ئەڵمانیای چاخی ناوین کاریگەرییان وەرگرتبوو و هەموویان دواتر کەوتنە چوارچێوەی لیستەی ڕەشی ئەو نیگارکێشانەوە کە لە دەیەی سیدا، بەرهەمەکانیان لەژێر ناوی (هونەری داڕماو)دا زەوت و قەدەغە کران. ئیکسپرسیۆنیزمی ئەڵمانی هێندە بەهێز بوو کە توانی لە سنوورەکانی ئەو وڵاتە تێپەڕێت و بە تایبەت لە هونەری نیگارکێشی دیواری مەکزیکدا و لە نیگارکێشی شۆڕشگێڕانەی هونەرمەندانی وەکو ئۆرۆزکۆ وریۆرادا خۆی بنوێنێ، بەڵام لە ئەڵمانیادا، لەگەڵ شەڕی جیهانی یەکەمدا، ئیکسپرسیۆنیزم کپ بوو و شەپۆلی نوێی نیگارکێشی ئیکسپرسیۆنیستی پاش شەڕ لە لایەن هونەرمەندگەلی وەکو ماکس بێکمەن، ژێرژ گرۆز، ئۆسکار کۆکۆشکا، نۆڵدەوئۆتۆ دیکسەوە دەستی پێکرد کە هەرکامەیان بە شێوەیەکی تایبەت لە سوننەتی کلاسیك و پێوەرەکانی جوانی ناسی سوننەتی دوورکەوتنەوە. بێکمەن لە ژێر کاریگەریی ئیکسپرسیۆنیزمدا پتر ڕووی کردە ڕەنگگەلی تێر و توندوتیژ، تەشکی هەندەسی و گۆشەگەلی تەنگ و پچڕپچڕ وەکو شێوەی کووبیستی. بێکمەن ساڵی *1938* ئەو کاتەی نازیەکان کاروبارییان بە دەستەوە گرت ناچار بوو بە هەڵهاتن. گرۆز لەو ئیکسپرسیۆنیستە شۆڕشگێڕانە بوو کە لە بزووتنەوەی ئیسپارتاکیستەکاندا چالاکانە ئامادە بوو. خواستی دژە سەربازیگەریبوون و دژە سەرمایەدارییبوونی گرۆز لە نیگارەکانیدا، کە لە خۆیاندا ناشیرینترین وێنەیان لە ڕووتترین ڕواڵەتەکاندا ئەگرتەخۆ، بە جوانی دیاربوو.

سەرەڕای ئەوەی ئیکسپرسیۆنیزم کارتێکراوی ئیمپرسیۆنیزم بوو بەڵام لە بەرانبەر گەشبینی ئیکسپرسیۆنیزمدا ڕەشبین بوو. نیگارکێشە ئیکسپرسیۆنیستەکان حەزیان لە نواندنی سروشت و مرۆڤ بوو وەکو بەشێك لە سروشت بە شێوەگەلی ئامانجی و دڵخواز، لە حاڵێکدا

ئیکسپرسیۆنیستەکان مرۆڤیان لە خراپترین حاڵەتەکانیدا لەبەرچاو ئەگرت. لەم بارەیەوە لەوانەیە ئیکسپرسیۆنیستەکان باشترین دیاریکەری بیردۆزی (وێرانگەری– بووژانەوە) بن. لە ئیمپرسیۆنیزمدا نیگارکێش بەرەو تیشک و ڕووناکی و ڕەنگی گەرم ئەچێت، بەڵام لە ئیکسپرسیۆنیزمدا بەرەو تاریکی، ڕەنگگەلی مات و توند و نابەدڵ هەر بەو هۆیەوە بوو کە لە بواری مێژووییشەوە بۆ تێپەڕین لە ئیمپرسیۆن قۆناغی فۆویستی پێویست بوو کە لەوەدا ڕوانگەیەکی توندوتیژانە بێتە ناو نیگارکێشییەوە. هەرچەندە لەم قۆناغەدا هێشتا لەگەڵ ڕیالیزمی سروشتگەرادا ڕووبەڕوو بووین تاوەکو ڕیالیزمی کۆمەڵایەتی. ئیکسپرسیۆنیزم ئەتوانرێ لەگەڵ سوریالیزمدا هەڵسەنگێندرێت. ئەگەر ئەمەیان کەڵك لە تەنز و نامۆیی وەردەگرێت کە لە دەستی چارەنووسی بڕیاردراو دەردەچێت و ئیمکان بۆ دەربازبوون بڕەخسێت ئەوی دی لە بەرانبەر چیرۆکی دڵتەزێنی چارەنووسدا جگە لە سەردانەواندن بۆ دڵەڕاوکێکانی وجوود چارەیەك نادۆزێتەوە. لەوانەیە بتوانرێ ئیکسپرسیۆنیزم بە جۆرێ لە شێتی ڕەنگ دابنرێت. گرنگیدانی لە ڕادەبەدەر بە ڕەنگ بە ئاگایی تەواوەوە، هێندە کە هێڵەکان و تەنانەت بابەتیش بکەوێتە بەر هێرشەوە. بابەت لەژێر گوشاری ڕەنگەکاندا بێ ڕواڵەت دەبوو، ئەسڕایەوە و تەنانەت لە بەین دەچوو. لە ئیکسپرسیۆنیزمدا دژایەتی لە نێوان (ناوەوە) و (دەرەوە)دا پتر بە قازانجی باری دەرەکی بوو. واقیعی دەرەکی تەشك و وێنەی دەرەوەیە و واقیعی ناوەکی ئەو هەستەیە کە هونەرمەند ئەخوازێ دەربڕی بکات، هونەرمەندی ئیکسپرسیۆن بە مافی خۆی ئەزانێت کە واقیعی ناوەکی لە چوارچێوەی ڕەنگەکاندا لە بابەت بکێشێتە دەرەوە و بە سەریدا بیسەپێنێت.

### نیگارکێشی و پەیکەرتاشیی فاشیستی:

هەرچەندە فۆویزم، فۆتۆریزم و ئیکسپرسیۆنیزم تەمەنیان لە نیگارکێشیدا کورت بوو بەڵام هێندە دەوڵەمەند و بە بەهرە بوون کە نەریتگەلێکی بەهێزیان لە مێژووی نیگارکێشیدا هێنایەدی. ناوازەیی[18] هەنووکەی نیگارکێشانی ئەم قوتابخانە کە ئەتوانرێت لەگەڵ بێناوی و ونبوونی نیگارکێشە فاشیستەکاندا هەڵبسەنگێندرێت خۆی پیشاندەری ڕەسەنایەتیی هونەر و هەتوان و شایستەی جوانی ناسانەی ئەو قوتابخانانەیە. لە ئاکامدا تەوسیفی ئەو قوتابخانەیە بەو هۆیەوە ساناکەری کێشەکانە، کە دروست دژە سەرچەشنی هونەری فاشیستی ئەنوێنێت. لە ڕاستیدا هونەری نیگارکێشی مۆدێرن ئەو شتەیە کە هونەری فاشیستی وەکو دژە کردەوەیەك لە بەرانبەریدا دێتە بوون و هەوڵ ئەدات لە ڕێگای توندوتیژی، قەدەغەکردن، کوشتن، بەندیخانە و ترساندن و ڕاونانی هونەرمەندە مۆدێرنەکان ئەندێشە و تەنانەت مۆدێرنیتەی بۆ تاهەتایە لە زەینەکاندا بسڕێتەوە. لە بەرامبەر ئەمانەدا نیگارکێشی و پەیکەرتاشیی فاشیستی هیچ دیار نییە. لەگەڵ مەرگی فاشیزمدا، هونەری فاشیستی ئەچێتە ژێر خاك. بە درێژایی دوو دەیە ئایدیۆلۆگەکانی فاشیست هەوڵیان دا بنەمای هونەرەکەیان دابمەزرێنن و لە بەرامبەر (داڕمانی) نیگارکێشی و پەیکەرتاشیی مۆدێرندا، سەرچەشنی هونەری ڕەسەن، پاك و شۆڕشی و ئاریایی بخەنە بەردەست. لە ڕوانینێکی گشتیدا، لە نێوان پەیکەرتاشی و نیگارکێشیدا، فاشیزم بە شێوەیەکی دیار مەیلی بە لای هونەری سەرەتاوە بوو. ئامانج لە بەرجەستەکردنەوەی هونەری لێرەدا ئەوەیە کە ئایدیۆلۆژیا یان زەینییەتی وا دیار و زەبەلاحی فاشیستەکان بکاتە واقیع، بە شێوەیەکی

بەرهەست[19] و وشك و نەگۆڕ. وەك بڵێی ویستبێتیان ئایدیۆلۆژیا لە دەروونی لەشی سرووشتەوە بتاشن و بیهێننە دەرەوە، وەکو ویستبێتیان ئایدیۆلۆژیای ناڕێکوپێکی ئازاد و بێ پێچوپەنای سرووشت بکاتە ناو ئایدیۆلۆژیای وشك و بەردینەوە.

پەیکەرتاشیی فاشیستی سێ تایبەتمەندیی سەیر و وەسواسهێنەری هەبوو: یەکەم ژمارەی پەیکەرەکان. ژمارەی پەیکەری بیرەوەرییەکانیان لە ساڵی *1937*دا گەیشتە *200* دانە و لە ساڵی *1938*دا *380* و لە ساڵی *1939*دا *680* دانە کە ئەم پەیکەرانە لە لایەن *265* پەیکەرتاشەوە تاشرابوون. هەموو سازمانە ڕەسمییەکان و مەیدانەکانی شار پەیکەری بیرەوەرییان بۆ درووست کرابوو.

جوانیناسیی فاشیستی و پاشتر ئەزموونی ئێستالینی جوانی ناسیی تروتالیتەر، هێزێکی سەیری دا بە نیشانە و چوارچێوە و ڕواڵەتە هونەرییەکان، ئەو هێزەی کە شتەکانی ئەگۆڕی و ئەیتوانی ناوەڕۆکی ئایدیۆلۆژیا بگوێزێتەوە ناویان. لە ڕەنگ و شێوەی دەروونی جلوبەرگەوە بگرە تا شێوەی خۆڕازاندنەوە و ناوماڵ و دەفتەری کار و دیکۆراسیۆنی شوێنە گشتییەکان، هەموو ئەمانە ئەبوا هەڵگری ئایدیۆلۆژیای دەسەڵاتدار بوونایە و ملکەچی و بەڕێوەبردنی فەرمانی ئەوانیان دەربڕیبا.

یەك لە تایبەتمەندییەکانی هونەری فاشیست ئەوە بوو کە هونەرمەند لە بەرانبەر هونەرەکەی خۆیدا ون دەبوو. (ئەفراندنی) هونەری لێرەدا تا ئاستی (فرەیی بەرهەم) دابەزی و ئاکامەکەی بە وتەی فاشیستەکان ئەبووە بێ نرخی و دوورکەوتنەوە لە کەسێتی و کێیەتی و بوونە هونەری خەڵکی یان بە جەماوەری (*Volkische*) بوونی بەرهەم. نیگارکێش و پەیکەرتاشی فاشیست وەکو هونەرمەندی مۆدێرن بە شوێن ئەوەوە نەبوو کە بابەت لە دەروونی خۆیەوە، لە دووتوێی هەست و تەنانەت لە ئەساتیر و بیر و بڕوای ڕابردووی سەرچاوەگرتوو لە ئایندا بدۆزێتەوە و پاش تێپەڕاندن لە ڕۆحیەوە هەوڵ بدات بۆ بەجسمکردنیان. ناوەڕۆك و بابەتی هونەری فاشیستی لە پێشدا دیاری کرابوو. ئەرکی هونەرمەند ئەوە بوو لە ئاکامدا بابەتگەلی ئایدیۆلۆژیکی لە پێشدا ئامادەکراو لەگەڵ سەلیقەی عەوام پەسەند و باوی سەردەم و لەگەڵ زەوق و خواستی لادێییانەی نازییەکاندا تێکەڵاو بکات، بەمپێیە ناوەڕۆك و ڕواڵەت بە خۆوەگرتنی ئەوانە لە یەك کاتدا هەم ڕواڵەتێکی ئارمانی، ناواقیعی، خەیاڵی و لە ئاکامدا پاشکەوتووانە و گەڕاوەییانە بوو لە توێژە ئازاردراوەکان کە زیانیان لە گەشەدێرڕەس و بە پەلە و هەڵپەی پرۆسەی بە پیشەسازی و بە شارنشینکردن بینیبوو هەم بەرجەستە بوونەوەی ئەندێشەی نەخۆش و توندوتیژی فاشیستەکان، شەیتانێك بە ڕواڵەتی جوان و بێگەردی فریشتەکان.

ناوەڕۆکی نیگارکێشی و پەیکەرتاشیی فاشیزم ئەتوانرێ بە دوو بەش دابەش بکرێت، مرۆڤەکان و سروشت. مرۆڤەکان لە سێ بەشی جیاوازدا، جیاکراوەی پیاوان، ئافرەتان و منداڵان دەرئەکەوتن و بە دەگمەن ئەم سێیە تێکەڵ ئەبوون. جیاوازی ڕەها لە نێوان پیاوەتی، ژنێتی و منداڵێتیدا لەسەر بنەمای بە ئارمانی کردنی کەڵك و کارکردی ئەم سێ وێنەیە بوو: شەڕ (مردن و خوێن) و زاووزێ (ژیان، نەژاد) گەشەکردن (داهاتووی پاك و ڕەسەن).

یەکەم بەش پیاوانن کە بە گرنگترین بابەتی نیگارکێشی دێنە ئەژمار و خۆیان لە چەند کەسێتی ئارمانیدا ئەنوێندرێن: سەرەتا پاڵەوانی وەرزشی یان

سەربازی: ئەمانە ئەندامی لەشیان پتەو، ڕێکوپێك، جوان و دەماراویی و گەورەیە، دەموچاویان پان و زبر، پڕ لە چرچ و هێڵ بە حاڵەتێکی بێڕەحم و سارده و کە زۆربەی جار سەمبولێکی وەکو شمشێر و چەکیان پێیە. وەرزشکار و جەنگاوەر هەردووکیان دووپاتبوونەوەی بێزاری و خەمۆکی هونەری ڕۆمی کۆنن. هەردووکیان ئایدیۆلۆژیای شەڕیان وەکو شێوەی گەیشتن بە خۆشبەختی و سەربەستی لەگەڵ خۆیان هەڵگرتووە. گەورەبوونی لە ڕادەبەدەری پەیکەرەکان پتر چڕبوونەوەی ئەو چەمکەی دەردەخست. وەرزش و شەڕ لە چەمکی دۆستایەتی پیاوانەیشدا پێکەوە گرێ ئەدران. سەربازی نیوەڕووت کە دەستیان لە دەستی یەکتریدایە و یان بە نیشانەی خۆشەویستی یەکتریان لە ئامێز گرتووە، هەموو پیشاندەری ئەو چەمکەن.

لەلای کەسێتی پاڵەوانێکدا کە پتر نیشانەی پرۆسیگەری و باکووری ئەڵمانیا بوو، ڕواڵەتی لادێیی ڕوونکەرەوەی زەوقی عەوام پەسەندی باکووری ئەڵمانیا بوو. نیگارکێشی ڕیالیستی ئەڵمانیای هیتلەری دووپاتکردنەوەی دوایی نەهاتووە لە ئیشوکاری لادێ.

کاری دەستی و سوننەتی بە کەڵك وەرگرتن لە ئامێر و کەرەستەگەلێك کە ساڵەهای ساڵ بوو دونیای پیشەسازی فرێی دابوون و لە چوارچێوەیەکی سروشتیدا کە شوێن و جێگایەکی بۆ شار و پیشەسازی تێدا نەبوو، وەك بڵێی نیگارکێشە هیتلەرییەکان سەد ساڵ گەڕاونەتەوە کە جیهانی کۆنی پاش پیشەسازی بخوڵقێننەوە. نیگارکێشی فاشیستی بەو ئەندازەیە لە دونیای شارستانییەت و پیشەسازی دوور بوو کە نیگارکێشی ڕیالیستی کۆمەڵایەتی ئیستالینی لە لادێ و کشتوکاڵ دوور بوو. نیگارکێشی پڕوپاگەندەکاری هیتلەریش لەو قاڵبەدا جێگای ئەبێتەوە. خۆپیشاندانی لە بڕان نەهاتووی سەربازی لە بەردەم پێشەوادا، وێنەی سەنگەرەکان و ڕیزی سەربازگەلێك کە بۆ شەڕ ئامادە بوون و پۆرترێتە لە ئەژمار نەهاتووەکانی هیتلەر لەوانەن.

دووهەمین قاڵب و سەرچەشنی نیگارکێشی و پەیکەرتاشی فاشیستی ئافرەتان بوون کە کەڵك و کارکردی ئارمانی ئەوان زاوزێ بوو، ژنان پەیوەندییەکی ئوستوورەییان لەگەڵ زەوی، تازەیی، جوانی، سەوزی، بەرهەمداری، و وەبەرهێنان و پەروەردەی میوەو بەرهەمگەلی پاك و بێگەرددا بوو. ئافرەتان لە نیگارکێشیی فاشیستیدا زیاتر لە دووتوێی سێ ئوستوورەوە ئەنوێندران: ڤینووس– خواژنی لاتینی شیناوەرد و هاوتای ئەفرۆدیتی یۆنانی، خواژنی عەشق و زاوزێ– پسیکە (*Psyche*)، سەرچاوەی پاکیی ڕۆحی ژنانە و عەشقی ڕزگاریبەخش – لێدا (*Leda*) هاوسەری تینداروزیۆس سەرچاوەی جوانیی ژنانە لە چیرۆکی گۆڕانیدا بۆ قوویەکی سپی. هەڵبژاردنی ئەم ئوستوورانە بە جوانی ڕوانگەی ئایدیۆلۆژیکی فاشیستی دەردەخەن. ئافرەتانی نیگارە فاشیستەکان جوان و ناسکن، جوانییەکەیان هەڵگری بارێکی شەهوەتی و جینسییە. سەرنجڕاکێش بوونی جسمی کە بەرهەمهێنی و ژنێتی لە خۆیدا کۆدەکاتەوە و میهرەبانی ڕواڵەتەکان و بارستای لە ڕادەبەدەری ئەندامی ژنانە هەموو دەربڕی کاکردی ئارمانی ئافرەت، واتە زاوزێن.

سێیەمین قاڵب لە نیگارکێشیی فاشیستدا منداڵانن کە سەرچاوەی گەشبینی فاشیزمن بەرەو داهاتووی پاك، بێگەرد و بەدوور لە هەموو تێکەڵاویی نەژاد و بیروڕا.

جوانــــی و تەندروســــتیی دیــــار لــــە وێنــــەی منداڵەکاندا دەربڕی ئارمانی پێگەیشتووی فاشیزمە. ئەگـەر چاوپۆشـــی بکـــەین لـــەم کەســـێتییە بـــێزار و دووپاتبووانــــە لــــە نیگارکێشــــی و پەیکەرســــازیی فاشیســـتیدا، نـــاوەڕۆك تـــا ئاســـتی ســـووکترین و گەنیوترین (فرەبەرهەمی) دادەبەزێت.

ئەوپەڕی جوانی ناسی لەناو زەوقی لادێییانەی باشـووردا، سروشـت بـوو. سروشـت لـە پاکـترین و بێگـەردترین حاڵـەتیدا و لـە هـەموو وەرزەکـانیدا، سروشـت سـەمبۆلی کـاتی مێـژووە لـەو کاتـەدا کـە هێشتا مۆدێرنیتە دەستی پێنەکردووە، پیشەسازی دەستی بۆ سەر جیهانی پاك و دەسـتکاری نـەکراو درێـژ نەکردۆتـەوە و شارەکان هەناسـەی لادێکانیـان تـەنگ نەکردۆتـەوە. ئەگـــەر لـــە هـــەزار تـــابلۆی فاشیســـتیدا بـــۆ بچووکـــترین شـــوێن پێـــی مۆدێـــرن بگەڕێین کـارێکی بێهوودەمان کردووە. ڕۆمـانتیزمی بێ نرخـی باشـوور لـێرەدا لـە بـەرزترین ئاسـتدایە. نیگارکێشان و پەیکەرتاشانی فاشیست لە ڕاستیدا تەنیا (بەرهەمهێن) بوون. کاسبکارگەلێك بوون کە لە کارگەکانیاندا هەزاران جـار ئارمانـە ئـایدیۆلۆژیك و بـێ ڕۆحـەکانی حـاکم ئەکێشـنە سـەر تابلۆکـان و چوارچێوەی بەرد و کانزاکانەوە.

تۆماری ناوی هونەرمەندانی فاشیست لە بڕان نـــەهاتووە، بـــەڵام دەمێکـــە ناویـــان لێ نـــابرێت و سروشـــتی فاشـــیزم ئەوەیـــە کـــە بـــە مردنـــی خـــۆی هونەرەکەیشی بە خاك سپارد.

### فەرهەنگۆك

*1*–سەرچەشن= الگو

*2*–پەرچەکردار= عکس العمل

*3*–ئاوەژۆ= واژگون

*4*–ئاکاریانە= اخلاقی

*5*–خانەدانێتی= اشرافیت

*6*–ڕۆژەڤەڕاستییەکان= واقعیات روزمرە

*7*–چاکسازیکاری= اصلاحگری

*8*–تەبایی= هماهنگی، باهم ساختن

*9*–سەربژێر= نخبە

*10*–هەڵکەندن= حکاکی

*11*–تەشك= شك، ظاهر

*12*–پەرەمووچ= قلم مو

*13*–بەرایی= ابتدایی، آغازین

*14*–جیاکەرەوە= شاخص

*15*–دیمەنسازی= صحنەپردازی

*16*–بزۆز= متحرك

*17*–نڤارکاری= ابداع، تازەگری

*18*–ناوازەیی= شهرت

*19*–بەرهەست= محسوس

### سەرچاوە

گۆڤاری (فرهنگ و توسعە– شمارەی *24* ساڵی *1375*.

# سەردەمی سوریالیزم

لە فەرەنسییەوە: جەلال حەمید

**دەنگدانەوەی سوریالیزم:**

كاتێ گێوم ئەپۆلینێر لە ساڵی *1918*دا كۆچی دوایی كرد، ناوەندە ئەدەبی و هونەرییەكان بە كۆمەڵە بیرۆكەیەكی جیاواز تەنران و شاعیری – ئەلكهول، *alcools*– ئاوێنەی ڕوون و دیاری ئەو بیرۆكانە بوو. لە بواری وێنەكێشان، كیوبیزم برەوی سەند و ئەپۆلینێر یەكەم كەس بوو كە لەم بارەیەوە بابەتێكی بە ناونیشانی -بەرگری و وێنەكێشان– نووسی. بواری موزیك لەگەڵ ئیریك ساتی (*1866– 1925*) دەستی پێكرد كە دەیگوت من موزیك لەلای وێنەكێشەكان زیاتر فێربووم وەك لای موزیكارەكان. (ساتی) بەشداری لە هەمان ئەو لێكۆڵینەوانەدا دەكرد كە سەبارەت بە تەكنیكی نوێ و بەرزڕاگرتنی ڕۆحی ئەنجام دەدران. ساڵی *1912* بە هاوكاری جان كۆكتۆ و دەرهێنانی مامۆستای بالێی ڕوسی دیاگیلیف بالیەی *Parade* نمایش دەكات كە بیكاسۆ دیكۆرەكەی ئەنجام دەدات. پاشان سینەما كە پێشوەخت لە سەرەتای هەنگاونان بوو ڕوو لەم بزووتنەوەیە دەنێت لە ڕێگەی مارسیل لێربێ كە فیلمی *L'inhumaine*– بە هاوكاری فێرناند لیـژێ و فیلمی -بالێی میكانیكی، *1924*– دەردەهێنێ و غێنێ كلێغ فیلمی *Entre'acte*– فاصل موسیقی، *1924* كە ئیریك ساتی موزیكی بۆ دادەنێ، دەردەهێنێ. دوای ماوەیەكی كورت فیلمە سوریالییەكانی لویس بۆنیل -سەگی ئەندەلووس، *1928*– و سەردەمی زێڕین، *1930*– دەردەكەون. هاوكات ئەزموونی سوریالی وێنەكێشان لە ڕێگەی ماكس ئارنست و فرانسیس پیكابیا دەسپێدەكات.

**دابڕان و یاخی بوون:**

پێشبینی سوریالیزم ئەوە بوو كە شیعر دەتوانێ ڕۆڵی ڕابەر بگرێتە ئەستۆ و هەر بۆ ئەو مەبەستە ئەپۆلینێر پێشتر دەستنیشان كرابوو. بەڵام زۆربەی قوتابخانە شیعرییە ناوخۆییەكان ئەم پێشەنگییەی شیعر و مەسەلەی ڕابەرایەتی بزووتنەوەكە بۆ هۆكاری ئەزموونەكەی دەگێڕنەوە كە ئەندرێ بریتۆن (لە گفتوگۆیەكی ڕادیۆیی، *1952*) نازناوی -ژیانی ڕاستەقینە–ی پێدەبەخشێ: كەواتە

شیعر دەسپێك و پێشەکییەکی ئەزموونوابیە کە بە شێوەیەکی کاریگەر تەشەنە دەکات و سەرجەم ڕووەکانی ژیان لە پێناو چەسپاندنی بوونیا لە خۆ دەگرێت.

پێشبینی لۆتغیامۆن و ڕامبۆ هەمان شت بوو بۆ شیعر. گیۆم ئەپۆلینێر پێویست بوو بەم جۆرە وشەکە دابهێنێ و دەس بە ڕاگەیاندنی هونەری شیعری سوریالی بکات:

قوولاییەکانی هۆش
سبەی دەرکتان پێدەبرێ
کێ ئەزانێ چی بوونەوەرانێك
شانبەشان تێکرای گەردوون
لەم ناخە قوولانە هەڵدەکێشرێن
(کالیگرام. گردۆڵکەکان)
سەرکەوتن بەر لە هەموو شتێك
لە دوورەوە چاك دەبینرێ
لە بینینی هەموو شتێك
لە نزیکەوە دەبینرێ
ئەوکاتەی کە هەموو شتێك
ناوێکی تازەی لێدەنرێ
(کالیگرام، سەرکەوتن)

ناوێکی نوێ.. ناچار بۆدلێر بە دێرە شیعری (لە قوولایی نادیار بۆ نوێ دەگەڕێین) و ڕامبۆ و مالارمێ دەهێنێتە یاد. سوریالیزم، بزاڤی یاخیبوون و ڕەتکردنەوەی نەریتێك دەبووژێنێتەوە کە هەتا ڕادەی ڕۆمانتیکییەت گەشە دەسێنێ، بەرزترین خاڵی ڕۆمانتیکی نوێیە کە هەر لە سەردەمی بۆدلێرەوە توێژینەوەی بووەتە مایەی تەفرەدانی شیعری فەرەنسی.

سوریالییەکان خۆیان بە ڕابەرە نزیکەکانی سوریالیزم وەك ڕامبۆ و لۆتغیامۆن و ڕابەرە هەرە دوورەکانیشی وەك ولیەم بلێك (*1757–1827*) و ژێغاغ دونێغڤال دەناسێنن، سوریالیزم بە تەنها بزاڤێکی ئەدەبی نەبوو بەڵکو ڕەنگدانەوەی پێشکەوتنی گشتی هزری هاوچەرخ و کەلەپوور و ئەو ئەزموونە ستاتیکییە بوو کە دوابەدوای ڕۆمانتیکییەت سەریهەڵدا و بە شێوەیەکی قوول و بەرفراوان بارودۆخی کۆمەڵایەتی و سایکۆلۆژی و ئاکاری جەنگی گەورە بەرجەستە دەکات و بایەخ بە هەموو فۆرمەکانی دەربڕینی هونەر دەدات لە کاتێکدا لێکۆڵینەوە لەمەڕ ناوەڕۆك و زمان و ماناکانی هونەر ئەنجام دەدات. مێژووی بووژانەوەی سەردەمی سوریالیزم دەدرێتە پاڵ نووسەری ئۆغێلیا و *La-Nadja*ی ئەندرێ بریتۆن و نێڤال کە توانیان فۆرمیولا سەرەڕۆکەی جان کۆکتۆ: (دان بەوە دەنێم کە من سوودم لە ڕووداوی پەنهان و هەڵە ژمێریاری و ئاسمانییەکان بینیوە) دووپات بکەنەوەو هاوکات، فیلیپ سۆپۆ کە بزوێنەرێکی دی گروپی سوریالییە، بە شێوەیەکی بەرفراوان بەشداری لە گواستنەوەی کاریگەری ولیەم بلەیك بۆ فەرەنسا دەکات.

**برەودان بە نامەئلووف:**

ئەوەی جەخت لە بەهای شیعری و مرۆڤخوازی سوریالیزم و درەوشانەوەی دەکات پەیرەوکردنی هونەر وەك تەکنیکێکی پەردەهەڵماڵەر لە ڕووی نادیار *-l'inconnu-* و سەرجەم پێکهاتەکانە بە گوێرەی پەیوەندییە تەمومژاوییەکان و گەردوون و هۆشی مرۆیی. بەم جۆرە دەڕوانین گشت ئەمانە لە سوریالیزم چارەسەر دەکرێن، بەڵام بابەتی *Voyage–*، گەشت– لای ناغڤال و بۆدلێر بە ڕادەیەکی زۆر زیادەڕۆیی تیا ئەنجام دەدرێ. سێندرارس کە هاوکاری ئەپۆلینێر دەکات لە بارەی ئاشکراکردنی سوریالیزم، ئایا سەرکێشی دەکاتە دروشمی خۆی؟

لە ساڵی *1913* پەخشانێك بە ناونیشانی -دوابەدوای سیبەریا- دەنووسێ کە بە یەکێك لە بەراییترین کارە ڕاگەیەنەرەکانی سوریالیزم دەدرێتە قەڵەم، تیادا نامۆیی سوریالیزم لە سەرچاوەی فۆلکلۆری ڕەش پێستەکان وەردەگرێ -بڕوانە ئەنتۆلۆژیای ڕەش پێستەکان، *1921*- و لە ساڵی *1917* گرنگی بەو دەسەڵاتە گەورەیە دەدات کە دەتوانێ شاعیر و دۆزەرەوە بەو زمانە نوێیەی سینەما گۆش بکات. بە پێچەوانەوە کاریگەری سینەما دەبوو لەسەر خودی سیندراس-سیناریۆی: ڤینۆسی ڕەش، *1923*- و زۆر لایەنی زمانەوانی سوریالیزم پەیڕەو بکرێت. تەواوکردنی ئەم پەیوەندییە ئۆرگانییەی نێوان شیعر و سینەما لە کارەکانی جان کۆکتۆ دەستەبەر ئەکرێ. سینەما لە ڕاستیدا وەك تەکنیکی گەشت بۆ وڵاتی نامەئلووف دەکەوێتە ڕوو و جۆرەکانی دی ئەم تەکنیکە بۆ نموونە بریتییە لە: خەونی هەڕەمەکی و ورووژێنەر و هەروەها شێتگیری ڕاستەقینە و دروستکراو و نەستی مرۆڤ و وشەکان و هەموو ئەو تاوتوێ کردنانەی کە تاکە ڕووی پەیڕەوکردنی نووسینی ئۆتۆماتیکی پێکدەهێنێ، لە بەرهەمەکانی ئانتۆنین ئارتۆ بەدی دەکرێ.

## یاخیبوون و هەستی هاوبەشی مرۆڤخواز

بەم جۆرە سوریالیزم تا دواترین ئاکام بانگەشە بۆ ئەزموونی ئازادی و ئازادکردن دەکات. ناتوانێت لە سنووری هونەری شیعریدا لە بۆتەی مانا تەقلیدییەکەیدا بمێنێ. سوریالیزم وێڕای ئامادەگی مانیفێستەکان، بە تەنها قوتابخانەیەك نەبوو کە ئامانجی خۆی لە گۆڕینی هونەریدا ببینێ لە ڕێگەی پەیڕەوی تاك بۆ -دەرهاویشتنی چەپێنراوەکان، تصریف: المکبوتات[1]-ەکەی فرۆید.

نموودە سەرەکییەکانی بێگومان لە پێناو هاوبەشی کاری یاخیبوون و ئاوێتەی ئەزموونە تەکنیکییەکاندا بوو گەرچی ناوبەناو هەریەکە جەخت لە تایبەتمەندێتی خۆی دەکات و زۆرجاریش وەك گەواهییەك بۆ گەشەکردن لە کایەیەکی جیاواز سەقام دەگرێت. سوریالیستەکان لەبەرئەوەی کەسانی ئەو بوارەیان کەم بوو، سەرەتا خۆیان لە قەرەی کاری سەرکێش و توندوتیژ دەدەن و گەڵێ جار هێرشیان دەکردە سەر ئەو پرەنسیپانەی کە لە کاتی خۆیدا وەك گەوهەر و ناوەڕۆکی زمانی مرۆڤ پەیدا دەبوون. هەروەها سوریالیزم وەك پەیڕەوکارێکی توندوتیژی تەواو دەنگ دەداتەوە و هاوکات بایەخ بە ئارەزووی هێزی لەناوبردن دەدات چونکە لەو ڕوانگەیەوە دەتوانێ چێژی یاخیبوون بەدی بهێنێ! بەڵام سوریالیستە گەورەکان و شاعیرە ڕاستەقینەکان، لەوەتەی جەخت لەسەر ئازاری تاکەکەس و بەشداری لە هەست و سۆزێکی هاوبەش دەکەن هۆیەکی تری بوون بۆ شیعر دەگێڕنەوە کە خۆی لە یاخیبوونی پوختدا دەدۆزێتەوە. بەم جۆرە بە هەستێکی مرۆڤخواز پەنا بۆ بابەتی سروشت و شێوازی دەربڕینی هەرە باوی چڕوپڕ دەبات.

## کاریگەری سوریالیزم:

سوریالیزم لە هەمان کات کەش و هەوایەکی ئەدەبی نوێ دەئەفرێنێ لە ساڵەکانی *1920-1930* دەبێتە سیمایەکی بەربڵاو لە بواری شیعر. پاش بڵاوبوونی چەند کارێکی هەمەڕەنگ، بەردەوام دەبێ. ژمارەیەك شاعیری چاك بێ ئەوەی سەر بە گروپی سوریالیزم بن بە شێوەیەکی دابڕاو کەوتنە بەرهەمهێنانی ئەزموونی هاوچەشن و لە دەوروبەری سوریالیزم ناوچەیەکی سەربەخۆیان دامەزراند کە کارەکانیان بە بەرهەمی پلە یەك دەتەنرێ. شیعری

هاوچەرخ بە یەکجار هەم وەك تەواوکەر و هەمیش وێنەی میراتگر خۆ دەنوێنێ و شاعیرە سەربەخۆکان دێنە گۆڕەپان بێئەوەی کاریگەری نەوەی پێشووی وەك: پێگیو و ڤالیغی و کلۆدێل ڕەت بکەن.

**-بزووتنەوەی سوریالی-**

**دادایزم و سوریالیزم:**

لە ساڵی *1918*، دادا لە شێوەی بزووتنەوەیەك ڕادەگەیەنرێ کە ئامانجی خۆی لە بۆتەی یاخیبوونی تەواو و سەراپاگیر دەردەبڕێ تا دەگاتە ڕادەی هەڵوەشاندنی بونیادی زمان و چالاکی هزر.ئەم بزووتنەوەیە نازناوی دادا هەڵدەبژێرێ و هەوڵ دەدات بۆئەوەی شێوە و ناوەڕۆکی شیعر بخاتە ژێر ڕکێفی دەسبەسەراگرتنی توندوتیژی دەستەمۆنەکراو. بۆ چاکتر دووپاتکردنی ڕاستگۆیی ئەزموونەکەی، دادائیزم دەخوازێ هیچ شتێك نەتوانێ لێی دەرباز بێت و تەنانەت سەرچاوەکانی بیر و زمانی پێ دەسەمۆ نەکرێت: "من هەرەس بە هزر و دەزگا کۆمەڵایەتییەکان دەهێنم: ئاکاری هەموو شوێنێك تێکدەدەم و دەستی ئاسمان بۆ نێو دۆزەخ فڕێ دەدەم و چاوەکانی دۆزەخ بەرەو ئاسمان تووڕ دەدەم، عارەبانەی پیت و فەڕی سێرکی گەردوون لە ناوەندی دەسەڵاتە ڕاستەقینەکان و فانتازیای هەموو کەسێك چاك دەکەم" (تریستان تزارا، مانفێستی دادا، *1918*).

هەرچەند ئەم پرۆژەیە جارێك پاڵەوان و کەرەتێك نائومێد دەردەکەوێ و بانگەشەی ئیجابی هەڵدەدات لە ڕێگەی ئەو سروش و بینینانەی دەیوروژێنێ، کارەکانی تریستان تزارا باشترین گەواهیدەری ئەوەن: "ئازادی: دادا، دادا، دادا، بانگەوازی ڕەنگە ئاوێتەکراو و بەیەکاچوونی سەرجەم هاودژ و گاڵتەجاڕی و کردەوە و وتە نالۆژیکییەکانە: ژیان" (مانیفێست، *1918*). ئەمەش وێنەی هۆنراوەیەکیەتی.

**پاساری ڕووەکی**

دوو خەندەی تێکەڵاو ئاراستەی مناڵەکە دەکەن
پێچکەیەك لە کەفوکوڵی من
جانتای خوێنی ئافەریدانی بەرجەستەکراوی
نێو ئەفسانە جەستەییەکان-
دەبینێ برژانگە سووکەڵەکانی ڕەشەبا دەشڵەژێن
باران دەبارێتە ژێر مەقەستی سەرتاشە پەنهانەکان-
هەنگاوە گەورەکان مەلە لە سایەی ڕەزمە خێراو
ناوازەکان دەکەن
لەنێو وزە و چالاکی ئامێرەکانی گژوگیا لە
دەورووبەری
چاوە تیژەکاندا دەڕوێ
لێرەدا ڕامووسانی عیشق شانبەشان شەپۆلەکان
دابەش دەکرێ
خۆی دەخاتە ژێر حوکمی کاژێرە دابڕاوەکان
بە هۆی درزی نێوەندی قژەکان
زەنگی نیوەڕۆ لێرەدا بیبەری شادمانی مرۆڤ لە
مشتماندایە
لە باڵندەکانمانەوە (*1914-1922*).

**گروپی سوریالی**

لە ماوەی جەنگی گەورە لە ساڵی *1915* پزیشك و سەربازی تەمەن نۆزدە ساڵ ئەندرێ بریتۆن لە چەند مەڵبەندێکی دەماری و دەروون شیکاری دادەمەزرێ و دەس بە کارەکانی سیگمۆند فرۆید ئەکات. لە لایەکی ترەوە بە هۆی کاریگەر بوون بە بۆدلێر و مالارمێ پەی بە سیستەمی نەست - لاشعور- دەبات کە سەرچاوەی بەخشینی توانا هونەرییەکانە. گروپی ئایندەی سوریالی دەس بە

خۆبونیادنـان دەکـات، بریتـۆن شانبەشـانی لویـس ئـاراگۆن (کــە پزیشــك بــوو) و فیلیــپ ســـوپۆ گۆڤاری ئەدەبی دەردەهێنن و یەکەم دەقی سوریالی پوخت بە ناونیشانی کێڵگە موگناتیسییەکان (کە بە هاوکـــاری بریتـــۆن و ســـوپۆ) دەنووســـرێ، بلاودەکاتەوە.

### مانفێستی سوریالی

بۆ تێپەڕاندن و ڕەتکردنەوەی دادایزم، گروپی ســوریالی کــە کۆمــەڵێ شــاعیر و هونەرمــەندی نیگارکێشی وەك بریتۆن، سۆپۆ، کغوڤێل، دیسنۆس، ئێلـواغ، ئـەراگۆن، پێغـێ، ئێرنسـت و پیکابیـا لـە دەوروبەری خۆی کۆدەکاتـەوە، بواری ئۆتۆمـاتیزمی جەسـتەیی دەدۆزێتـەوە و لـە مانیفێسـتی سـوریالی *1924* ئاراستەیەکی یەکگرتوو بۆ خۆی دەستنیشان دەکـات کـە بـۆ نموونـە ئـەم پێناسـەیەی تیـا دەخوێنینــەوە: "مانفێسـتی سـوریالی بریتییـە لـە ئۆتۆمـاتیزمی جەسـتەیی پوخـت کـە لـە ڕێگـەی ئاشکراکردنی کاری ڕاستەقینەی بیر چ بە زارەکی چ بە نووسین یاخود بە هەر شـێوازێکی تـر پێشـنیار دەکرێ. خوێندنەوەی بیرە بەبێ ئامـادەبوونی هیـچ جـــۆرە دەســـەڵاتێکی پیـــادەکراوی هـــزر و فەرامۆشــکردنی گشــت خــەمێکی جوانناســی و ئاکارییانــە". ئــەم دێڕانــەی ســەرەوە پرۆســەی نووسینی ئۆتۆماتیکی دەردەخات کە شیکردنەوەی خــەون بــە ئۆرگــانی ســەرەکی ئــەزموونی ســوریالی دەژمــێرێ. گرووپەکــە بۆئــەوەی ئامــانجی خــۆی بپێکــێ -نووســینگەی پشـکنینی سـوریالی- لـە شـەقامی گرونێـل لـە پــاریس دەکاتــەوە و گۆڤــاری بزووتنەوەکــە ناونیشـــانی -شۆڕشـــی ســـوریالی- هەڵدەگرێت.

### سوریالیزم و شۆڕش:

لـە سـاڵی *1930* دووەم مانفێسـتی سـوریالیزم دەردەچـێ و ناونیشـانی گۆڤارەکـە دەگـۆڕدرێ بـۆ: سوریالیزم لە پێناو خزمەتی شۆڕش. پاشان ئەندرێ بریتۆن کێشـەی سیاسـەتێکی سـوریالی دەخاتـەڕوو. ئەم گرفتـە دەبێتـە هـۆی هەڵوەشـاندنەوەی گروپەکـە هـەروەها بزاوتـی هـاودژی کەسـایەتییە ئەدەبییـەکان بەرامبەر یەکدی دەبێتە هاندەری ئەم هەڵوەشاندنە: لویـس ئـەراگۆن و پـۆل ئیلـوار ڕوو لـە ئیلتـیزام و کۆمۆنیستی دەکەن؛ ئەندرێ بریتـۆن بە پێچەوانـەوە خۆی بۆ بەهێزکردن و پاراستنی سوریالیزم دەکات. گروپەکە، وێڕای ئەوە ژیـان دەگرێتـە بـەر سـاتێکی مــەزن لــە مێــژووی ئــەدەبیدا. ئــەو پێشــانگا سوریالیانەی کە لە پاریس ڕێکدەخران و هەشتەمین پێشانگای ساڵی *1959* باشترین گەواهیدەرن. ئەندرێ بریتۆن گەورەترین تیۆریستی بزووتنەوەکە بوو کە بە شـێوەیەکی سـەرەکی لـە لایـەن بنیـامین پـێرێ و فیلیپ سۆپۆ و هەروەها وێنەکێشان ماکس ئارنست و فرانسـیس پیکابیـا پشـتگیری دەکـرا. گروپەکـە ژمارەیــەك هونەرمــەند و شــاعیری بــۆ لای خــۆی ڕاکێشا کە کارەکانیان گەلێ جیاواز بوو بەڵام مۆرك و سیمای کارە ئەدەبییەکانی ئەندرێ بریتۆن و ڕۆبەرت دیسـنۆس و لویس ئاراگۆن و پـۆل ئیلواریـان پێـوە بوو.

### ئەندرێ بریتۆن

### کامڵبوونی سوریالیزم:

ئـەندرێ بریتــۆن (*1896-1966*) لـە تینشـبرەی سـەر بـە -ئـۆرن- لـەدایك بـووە. دوای خوێندنـی کۆلێژی پزیشکی و ئەزموونەکانی جەنگ لە ساڵی *1917-1918* بەشـداری لـە یانـە ئەدەبییەکـەی گیـۆم

ئەپۆلینێر دەکات. لەساڵی *1919–1924* دەبێتە سەرۆکی گروپی سوریالی و لە ساڵی *1926* لەژێر دروشمی -بەرگری ڕەوا- جەخت لەسەر سەربەخۆیی تەواوی دەکات. لە سایەی تەواوی - کۆنترۆڵی دەرەوە و کۆنترۆڵی خودی مارکسیزم- و نووسینی هەردوو مانیفێست لە ساڵی *1924–1930* دەبێتە تیۆری دانەر. کارە ئەدەبییەکانی بریتۆن لەگەڵ بڵاوبوونەوەی -*Nadja*، *1928* -و- قاپە بنکە پێکنووساوەکان، *1932*- و خۆشەویستی شێت، *Lamour fou*، *1937*- دەگاتە چڵەپۆپە. لە ماوەی جەنگی جیهانی دووەم بریتۆن لە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا نیشتەجێ دەبێ و -ئارکان *17*، لە ساڵی *1945*- دەنووسێ. لە ماوەی کۆتایی جەنگ بەردەوام بەرگری لە کامڵبوونی سوریالیزم دەکات. شەڕە قسەیەکی توند لە گۆڤاری هونەر، *1952*- سەبارەت بە -مرۆڤی یاخی- کامۆ بڵاودەکاتەوە. لە *1947–1959* چەند پێشانگایەکی سوریالی سازدەکات و لە ساڵی *1956* گۆڤاری سوریالیزم دادەمەزرێنێ.

### هونەری شیعری

ئەندرێ بریتۆن لە هەردوو مانیفێستی سوریالی پوختەی ئەنجامێك کۆدەکاتەوە کە لە ڕوانگەیەوە تەنها ڕێگەی بنەڕەتی و نوێ بە ئاراستەی گۆڕانکاری تەواوی مرۆڤ و جیهان پێکدەهێنێ و هاوکات پرانسیپی شیعری ڕاستەقینەی تیادەبینێ کە بریتییە لە ئازادکردنی بێ مەرجی -ئاکامەکانی ژیانی فیزیکی- لە ڕێگەی خاسیەتی هەڕەمەکییانەی ئەفرێنەری -ئۆتۆماتیزمی زارەکی و بینین- (بڕوانە بەرەبەیان، پەیامی ئۆتۆماتیکی، *1934*). ئەمەش وێنەی دەقێکی ئەندرێ بریتۆنە کە تیایدا وەسفی پرۆسەی سوریالی بۆ ئەفراندنی شیعر دەکات: ئێمە تا ڕادەیەك دەزانین سروش چییە. نابێ گومان لەوە بکرێ کە سروش پێویستییە باڵاکانی دەربڕین لە هەموو کات و شوێنێك دابین دەکات. بە شێوەیەکی گشتی سروش دەڵێن بوونی هەیە و بوونی نییە، گەر بوونی نەبێ هیچ شتێك لەوانەی کە لە سۆنگەیەوە ئیحای کارامەیی مرۆڤ دەستەبەر ئەکەن و بەرژەوەندی و عەقڵی لۆجیك و ئەو بەهرەمەندییەی کە بەکارکردن دابین ئەکرێ ڕەت ئەکەنەوە ناتوانێ لە کاتی نەبوونیدا چارەسەرمان بۆ بدۆزێتەوە. ئێمە سروش بە هۆی دەستەبەرکردنی تەواوی هزری خۆمان بە سانایی دەناسین کە ماوەیەکی دوور و درێژ ڕێگر بوو لە بەردەم وروژانی هەر مەسەلەیەك کە تیا دەبینە گەمەی چارەسەرکردنێکی عەقڵانی پتر لە چارەسەرکردنێکی عەقڵانی دی، لەم جۆرە بازنە کورتانەی کە لە نێوان بیرۆکەیەکی دیاریکراو و بەرپرسیاریەتییەکەیدا دەوروژێنرێ. هەموو شتێك لە جیهانی فیزیکی وەك بازنەی کورت کاتێ بەرهەم دەهێنرێ کە دوو جەمسەری ئامێرێك بە گەیەنەرێکی بێ بەرگر یان گەیەنەرێکی بەرگریکاری زۆر کز دەبەسترێتەوە. سوریالیزم لە شیعر و وێنەدا هەموو توانای بۆ زیادکردنی ئەم بازنە کورتانە دەخاتەگەڕ. پابەندی هیچ شتێك نابێت مادام لە هەوڵی بەرهەمهێنانەوەی دەستکردی ئەم ساتە نموودەیە -*ideal*- کە مرۆڤ تیا دەبێتە نێچیری سۆزێکی تایبەت و کتوپڕ بە -لە خۆی بەهێزتر- دەهەژێ و هەواڵەی نەمری دەکرێت. لیوسید ورییایە و بە ترسەوە لەم گیروگرفتە گەورەیە دەردەچێت. گرنگیش ئەوەیە کە ناتوانێ لێی دەرباز بێت و هەموو کاتێك بەردەوام باس لە زەنگی ئاگادارکردنەوەی پەنهان دەکات. ڕاستیەکەی لەوەدایە کە ئەو لەوێ پابەند نابێ بەوەی کە ئێمە پێوەی پابەندین. ئەم دەرئەنجامی چالاکی فیزیکییە

ئاماژە بە هەمان بێئاگایی ویست ئەکات، هەمان هێورکەرەوەی ئەو بیرۆکە بەرپرسیارانەن، هەمیشە ئامادەن وەك چەپێنەرەکان مامەڵە بکەن و بە پێی توانا سەربەخۆبن دەرهەق هەموو ئەوانەی کە ژیانێکی ناجۆر بۆ عەقڵ دابین دەکەن. ئەم بەرهەمانەی کە نووسینی ئۆتۆماتیکی و وەسفی خەونەکان بە یەکجار دەیانخاتە ڕوو ئەوەیە ژمارەیەك سیفاتی بەنرخ و شێوازێکی گەورە بە ڕەخنەیەك دەدەن کە بواری هونەری بە شێوەی ناچیزە خۆی نائومێد دەردەخات لە ڕێگەدان بە ڕێکخستنەوەی گشتی بەها لیریکییەکان و پێشنیارکردنی کلیلێك کە توانای کردنەوەی ئەم قوتووە پڕ لە پەنهانییەی هەبێت کە پێی دەوترێ مرۆڤ. ئەو مرۆڤەی بۆ سووکە خۆپاراستنێك توانای نیمچە ئاوڕدانەوەیەکی نییە کاتێ کە لە تاریکیدا خۆی بە دەرگا دەرەکییە داخراوەکانی جیهانی دووەم، واقیع، عەقڵ، پیتۆڵی و خۆشەویستی دەکێشێت. ڕۆژێك دێ کە چیدی ڕێگە بە خۆمان نادەین بە چاوێکی سووك سەیری مرۆڤ بکەین شانبەشان ئەم گەواهییە سەرسامکەرانەی بوون و ئەو بوونەی کە خۆمان بیری پەیڕەوکردنی دەکەین. سەرمان سوڕدەمێنێ لە ڕابردوو کە ئامێزمان بۆ ڕاستییەکان دەکردەوە و بە وریاییەوە بیانووە ئەدەبییەکانمان ڕێکدەخست و یان بێئەوەی مەلە بزانین خۆمان دەخستە ئاوەوە یاخود بۆئەوەی پەی بە ڕاستی بەرین بێئەوەی باوەڕ بە -*Phenix*، عنقاء- بهێنین دەچووینە نێو ئاگرەوە.

## نادجە - Nadja-

-نادجە ، *1928*- بڵاوکراوەیەکی ئەندرێ بریتۆنە کە کەسایەتی سەرەکی دەکاتە ناونیشان. نادجە کەسایەتییەکی بەرجەستەی بیر و ئەندێشەی بریتۆنە کە وەك ئاوێنەیەك بۆ ڕەنگدانەوەی - سەرووی واقیع، *Surrealite*- تەرخانی دەکات. ئەزموونێکی هەستپێکراوە لە ڕێگەی بوونەوەرێکی زیندوو، ئافرەتێك کە دەکەوێتە دوای سنوورە دیاریکراوەکانی نێوان عەقڵ و شێتی و خەون و سەلیقەی پاك. بریتۆن لێرەدا هەوڵدەدا تاکو دوا هەناسە لەو ئەزموونی سایکۆلۆجی و ئەدەبییەی کە نێغڤال بە -*Aurelia*- دەستیپێکرد بەردەوام بێت. ئەمەو و لەوکاتەی کە دەزانێ -نادجە شێت بوو- بریتۆن لە ڕوونکردنەوەی مانای ئەم -شێتییە- دەکۆڵێتەوە.

نادجە بەهێزبوو، ئاکام زۆر لاواز وەك دەتوانرێ هەمان بیری ئێمە و بیری خۆیشی هەمیشە بۆئەوە بچێ گەرچی من لەو بارەیەوە گەلێ داکۆکیم لێدەکرد و یارمەتیم دەدا کە بیری ئەوانی دی پێشێل بکات و ئەوە بزانێ کە ئازادی سەرزەوی بە هەزار حاڵ و سەردانەواندن دەستەبەری ئەکرێ و خواستی گەیشت بە خۆشییەکانی بێ سنوورە تا ئەو کاتەی پێمان دەگات بێ هیچ هەند زانینێکی پراگماتیکی ئەمەش لەبەرئەوەی ڕزگاربوونی مرۆڤ ئاکام لە سادەترین شێوەی شۆڕشگێڕیدا سەیر دەکرێ کە ڕزگارکردنی مرۆڤ لە هەموو ڕوویەکەوە کەموکوڕی لەو بارەیەوە هەیە، با بە چاکی تێبگەین، بە پێی ئەو هۆکارانەی کە هەریەك لە ئێمە دایدەڕێژێ تەنها مەسەلەیەکە کە شایەنی خزمەتکردن بێت. نادجە تەنها لە پێناو خزمەتکردنی ئەو خولقێنراوە تەنها بۆ دەستنیشانکردنی ئەوەی پێویستە پیلانێکی زۆر تایبەتی لە دەوروبەری هەموو کەسێك دابڕژێت کە تەنها لە خەیاڵی نەبووە بەڵکو لەگەڵ بۆچوونی سادەی زانیاری و توانای نرخاندن ڕێك دەکەوێ، بەڵام ترسناکییەکەی لەوەدایە کە سەر و پاشان دەست بنێتە سەر ئاسنەکان و لە لۆژیك

دووربکەوێتەوە واتا لە ئاڵۆزترین بەندیخانەی بنێت. ئەشێ لەبەر ئەم گەڕپێکردنەی دوایی دەبوو بیگرمە خۆ بەڵام بەر لە هەموو شتێك دەبوو بە ئاگابم لەو مەترسییەی کە ئەو بەرەو ڕووی دەچێ. بەڵام من هەرگیز بیرم لەوە نەکردبوو ئەو لەدەس بچێ و یان پێشتر وردترین هەستی کردەکی لەدەست دابێ ئەمەش دوای هەموو شتێك وا لە من و هاوڕێکانم دەکات بە توندوتۆڵی یەکتری بگرین[2]. [..] نامەکانی نادجەم بە چاوێك خوێندەوە وەك هەموو جۆرە دەقێکی سوریالی بخوێنمەوە وابوو، نەیانتوانی مایەی دڵەڕاوکێم بن. بۆ داکۆکیکردن لە چەند وشەیەك بەولا چیدیم نەخستە سەر. ئەو نادیارییە ناسراوەی سنووری نێوان -ناشێتی، *non- folie* – و شێتی ئامادەیی پێ نەبەخشیم بۆئەوەی بیرو هەستەکان بە شێوەیەکی جیاواز هەڵسەنگێنم کە بەهەر شێوەیەك دروستی ئەکەن. ئەوانە سەفسەتەی گەڵێ واتادار و قورسن وەك لەو ڕاستییانەی کە کەمتر ئاقاری گفتوگۆ دروست دەکەن. ڕاستییەکان هەم لە گەورەیی و هەم لە بایەخ دووردەخەنەوە. گەر سەفسەتە لە ئارادا بووایە دەبێ دان بەوە بنرێ کە بەلای کەم لە هەموو شتێك پتر بەشداریان دەکرد لەوەی کە وا لە خۆم بکەم خۆم هەڵدەمە خودی خۆم و واش لە دوورترین کەس بکەن کە بێتە نێو خودی من[3] چاوی بەو بکەوێ.

هاوار هەمیشە جێی بەزەییە "کێ ئەژی؟" کێ ئەژی؟ ئایا نادجە تۆ؟ ئایا ڕاستە کە جیهانی دووەم، هەموو جیهانی دووەم دێنە ناو ئەم ژیانە[4]؟ گوێم لێت نییە. کێ ئەژی؟ ئایا من بە تەنیا؟ ئایا خودی من؟

"نادجە، بڵاوکراوەی گالیمار"

**جوانی بێ مەبەست**

سوریالیزم خۆبەخشانە ڕوودەکاتە لێکۆڵینەوەی نامەئلووف کە بە شێوەیەکی بەرفراوان بەشداری لە ئەنجامدانی شاکارەکانی بواری ئەدەب و هونەری نیگارکێشان و سینەمای هاوچەرخ دەکات لە پێناو هەڵماڵینی ئەو نهێنییەی بریتۆن لە سۆنگەیەوە دەڕوانێتە واقیعی ڕۆژانە و دیمەنەکانی سروشت لە ڕێگەی شوێنپێکەوتنی بۆدلێر کە لە هۆنراوە پەخشانەکانیا گۆرانی و هۆنراوەی نامەئلووف بۆ شارە گەورەکان دەچڕێ. بریتۆنیش بەم جۆرە دەڕوانێتە بەئاگابوونەوەی پاریس:

پێویستە بەیانییەکی زۆر زوو لە بەرزایی گردی ساکغێ کۆغ بڕوانیتە پاریس، شارەکە هێدی هێدی لەنێو ڕووپۆشە قەشەنگەکانییەوە دەردەکەوێ پێش ئەوەی پەلوپۆی پەرشوبڵاو بکاتەوە. خەڵکانێکی پەرتەوازە و مۆمیاکراوی چکۆلە بێ شڵەژان وەك کەشتییەك دەس ئەکەن بە بەسەربردنی شەوێکی[5] مەزن کە دەزانێ تەنها گفتوگۆی پڕوپووچ و سەمەر لەخۆ دەگرێ. پەیکەرە لوتبەرزەکان کە خۆر ئامادەیی دەردەبڕێ تاجی مەل و شەپۆلەکانی بنێتە سەر لەنێو تۆز و گەردی پایتەختە هەڵاتووەکان بە ناڵەبارییەوە بەرز دەبنەوە.

بە ئاراستەی خانووەکانی شار کارگەکان پێشوازی لەو جموجووڵە دەکەن کە لە هۆشە ڕۆژ لە دوای ڕۆژ گەورەبووەکانی کرێکاراندا دەدرەوشێتەوە. هەموو شتێك دەنوێت جگە لەو دووپشکانە[6] نەبێ کە بە ڕووخساری مرۆییانەوە شانبەشان زێڕ و خشڵەکانیان خۆیان گەرم دەکەنەوە. جوانی ئافرەت لە بۆتەی سەرجەم بەردە دەگمەنەکان لە جارێك پتر خۆی دادەمەزرێنێ. هەرگیز بەم ڕادەیە کاریگەر و هەستبزوێن و هزرڕفێن نەبووە لەم ساتە نەبێ کە تێکرا دەتوانین وەهای

ڕەچاو بکەین کە بووەتە مایەی سەرنجڕاکێشانی تاك و کۆمەڵ. جوانی بێ مەبەست و ڕاستەوخۆ و ڕاکشاوی نێو جێنووستنێك دەتوانێ بانگەشە بۆ سەرجەم کایەکانی زەوی بکات! جوانی لەم ساتانەدا دەگاتە دوواین لوتکە و ئاوێتەی بەرائەت دەبێ و ئەو ئاوێتە کاملەیە کە هەر شتێك بوونی تیا بووە و هەر شتێك داوای بوونی خۆی دەکات بە نەرمونیانییەوە مەلە لەوەدا دەکات کە بەرەو بوونی هەنگاو دەنێ. توانای ڕەهای خۆییبوونی گەردوون کە خاوەندارێتییەکەی بۆ شەو دەگەڕێتەوە و تاوتوێکردنە بە پەرۆشەکانی لە خۆشنوودییەکی وردا حەشار دەدات.

(قاپە بنکە بەیەکنووساوەکان، گالیمار)

## گەمەی زمان و گەمەی ڕێکەوت

گۆڤاری ئەدەبی کە دەبێتە ئۆرگانی "نووسینگەی لێکۆڵینەوە سوریالییەکان" دەقە ئەزموونکارییەکان بلاودەکاتەوە و ئەندامانی گروپ لە سایەیدا زمان و هونەری شیعری نوێ دادەهێنن کە لەو میانە پەیرەوکردنی دوو تەکنیکی گەورەی سوریالیست ڕەچاو دەکرێ، نووسینی ئۆتۆماتیکی و پیشاندانی خەون. هەردووکیان بریتین لە دوو فۆرمی تۆمارکردنی باری دەروونی دەستبەسەر نەگیراو کۆمەڵێ تێڕوانین و وشە بۆ خستنەڕووی ئەو ڕێکەوتانەی کە دووچاری کەسانی نێو کۆمەڵ دەبن. لە گەڵ ئەوەش ئەم تەکنیکانە پاڵ بە شێوازە ئەدەبییەکان دەنێ گیان بنێنە بەر سیحر و فانتازیای چاوەڕێ نەکراو. بەم جۆرە شێوازێك گەشەدەکات تاکو ڕادەی جۆرێك لە -*Preciosite*، حذلقة- و نموونەی ئەمە لە -گەمەی فیکری- سیناریۆنووس ڕینیە کلێر لە چیرۆکی -ئادامز، *1926*- بە چاکی بەکاردەهێنرێ: "کۆشکەکانی توێڵی لانەی خۆشەویستی و دیوانی بەردین و نەرمی پەڕئاسا و چەند پاسەوانێکن کە زەمەن و سەری فریشتە چوارچێوە زیوین و بازنە سپی و پرتەقاڵی و ئەستێرە بەیەکاچوو و سەمای باڵی ئاسمانییەکان ڕەنگ دەدەنەوە".

## تەماوێتی ئۆتۆماتیزم

ئەندرێ بریتۆن هاوکات لەگەڵ بەرەنگاربوونەوەی لادانە ڕامیارییەکانی سوریالیزم، ڕووبەڕووی ئەگەرەکانی لادانە ستاتیکییەکان ڕادەوەستێ: بەردەوام وەك داکۆکیکەرێکی وریا مامەڵە لەتەك جدییەتی شۆڕشی سوریالی دەکات. ئەم جدێتییە تەنها خۆی لە گەمە و گاڵتەجاڕیدا نابینێ بەڵکو هاوکات هەندێ جار گەشە بە لێکچوونی -گاڵتەئامێزی فریودەر و *mystification*- و تەلیسم دەدات بەڵام گەمە و گیانی گاڵتەجاڕی و گاڵتەی فریودەر پێویستە بە شێوەیەکی ئازاد هاوکاری تەکنیکییەکانی دی بکات بۆ گەیشتن بە لوغزی زمانەوانی. تەماوێتی -ئۆتۆماتیزمی فیزیکی- دەبێتە مایەی بایەخی چەند شاعیرێکی سوریالی. سەربەخۆیەکی وەك جان کۆکتۆ پابەندی ئەم تەرزە نووسینە بوو. لەنێو خودی سورپالییەکاندا ڕۆبەرت دیسنۆس کە لە ساڵی *1900* لەدایك بووە و لە ساڵی *1945* لە ئەڵمانیا لە سەربازگەیەکی زیندانیاندا گیانی لە دەس دەدات، نوێنەری نموونەیی ئەم ڕێبازە بوو.

## ڕۆبەرت دیسنۆس

ڕۆبەرت دیسنۆس (*1900-1945*) خەڵکی کاغنێ دولاباستیلی سەر بە شاری پاریس بوو کە هەلێکی چاکی بۆ ڕەخساند بۆئەوەی ببێتە شاعیر. لە ساڵی *1919* بەشداری لە بزووتنەوەی دادا دەکات و دوای

چاوپێکــەوتنی بنیــامین پێغــێ پــەیوەندی بــە دەسپێشـــخەرییە بەراییــەکانی گروپـــی ســـوریالی دەکـات. لـەوێ کاریگەرییـەکی بێپایـان دەنوێنـێ چونکـە بـە تایبـەتی لـە سـۆنگەی -دانیشـتنەکانی خەواندن، *seances de sommeil*- کە لە لایەن بریتۆن و پێغیـە ڕێکدەخـران دێسـنۆس دەمودەسـت وەك بەهرەمـەندێکی ڕاسـتەقینە و شـارەزایەکی بـواری ئۆتۆمـاتیزمی زارەکـی و ڕاسـتگۆترین گـەواهیدەری سەرهەڵدانی شیعری ئیرتجالی لە سەر بناغەی خەون دەردەکەوێت. ئەم بەشداربوونەی لە میان ڕێکەوت و زمـــانی شـــیعریدا پتـــەوی و چـــڕی بـــەرفراوان دەبەخشێتە کارەکانی.

**ئازادی خەون:**

دیسـنۆس دەرهـەق خەونـە تایبەتییـەکانی وەك کۆکەرەوەیـەك ڕەفتـار دەکـات و تایبەتمـەندی لـە چۆنییـەتی پیشـاندانی خـەون پـەیدا دەکـات. بـە گوێرەی پوختترین پێداویستی سوریالی نووسین مل بۆ خوێندنەوەی -بینراو، ڕۆیا- دەکات و هۆنراوە لە ڕوانگـەی دیسـنۆس و هاوڕێکـانی دەکەوێتـە نێـو بێگـــەردی ئـــەم ڕاســـتخوازییە چونکـــە خـــەون و پیشاندانی خـەون پێویستە وەك کـاری هونـەری لـە سەرچاوەی ڕاستییەکانەوە هەڵقووڵێ. دیسـنۆس بە پێی ڕێکەوتەکانی ئیرتجالیەتی پەیوەندیدار بە خەون سـەرقاڵی هۆنـراوەی ئۆتۆمـاتیکی سەرسـوڕهێنەر دەبێت وەك لەم دەقەی خوارەوەدا کە ئاماژە بۆ خەون دەکات لە بارودۆخێکی سەرەتاییدا: لە ساڵی *1916* من بۆ هێمایەك ڕاگوازرام. کەوتمە ناو بیرێکەوە کە هاوکـات پـەڕی کاغـەز بـوو، لەگـەڵ نـائومێدی دوورکەوتنـەوەی زیـاترم لـە ڕۆشـنایی ڕۆژگـار و دیمـەنی کۆشـکی (فێغیـەغ سـین و مـاغن)ی دیـار لـە هێڵی شەمەندەفەری ڕۆژهەڵات لە هاوکێشەیەکەوە بۆ هاوکێشـەیەکی تـر تێدەپـەڕیم. لـە مـاوەی زسـتانی *1918-1919*. -ڕاکشـابووم و خـۆم وەك بڵێـی لـە واقیعدا دەبینی. کارەباکە هەڵکراوە. دەرگای دۆڵابـە شووشـەییەکەم لـە خـۆڕا دەکرێتـەوە. دەڕوانمـە کتێبەکانی ناوی. لـە تروسـکەی دەسـکی دۆڵابەکـە پارچەیـەك کاغـەزی مـس هەیـە (جـارێکی تـر لـە واقیعدا) لە شێوەی شمشێرێکی تورکی توندوتـۆڵ لەسـەر نـووك ڕادەوەسـتێ، ماوەیـەك بـێ جووڵـە و هاوسـەنگ دەمێنـێ پاشـان هێـدی هێـدی لەسـەر دەسـکی دۆڵابەکـە ڕادەکشـێ. دەرگاکـە دادەخـرێ، کارەباکـە دەکوژێتـەوە. لـە ئـەیلوولی سـاڵی *1922* ڕاکشابووم و خۆم وەك بڵێی لە واقیعدا دەبینی.

ئەندرێ بریتۆن دێتە ژوورەکەم و ڕۆژنامەیـەکی ڕەسمـی بەدەسـتەوەیە. "پێـی وتم، هـاوڕێی ئـازیز، خۆشـحاڵم هـەواڵی بـەرزبوونت بـۆ پلـەی ئەفسـەری پێڕاگەیەنم" پاشان ڕووی وەرچەرخاند و ڕۆیشت.

(ئەدەب، ژمارە (*5*)، *1922*).

**قوڕگە ساردەکان**

لەم بەڵگەنامە سوریالییە زمان خەون دەبینـێ و بریتییـە لـە یـەکگرتنی نامـەئلووفی نێـوان وشـە و خـوازە و ئەندێشـەکان کـە لـە نەسـتی شـاعیر و قسـەکانیدا هـەڵدەقوڵێ لـە پێنـاو فەرامۆشـکردنی یاساکانی پانتایی و کات. دەقەکە بە ئەنقەست وەك مەبەستی فریودانی خوێنـەری سادەبێت دەمـامکی سۆناتا و سەروا دەخاتە ڕوو و خودی ناونیشانەکە (بـۆ گاڵتەجاڕییـەکی ئاشـکرا) هەڵدەگەڕێتـەوە بـۆ قوڕگـە گەرمـەکان و وەسـفێکی سـارد و سـڕی تیـا بەکاردەهێنێ.

لە پۆستەخانەی دوێنێ بروسکەیەك لێ دەدەی[7]
کە ئێمە تەواو لەگەڵ پاسارییەکاندا مردووین
پۆستەچی غەمبار پۆستەچی تابووت لەژێر باڵتە[8]

برۆ نامە گوڵاوییەکانم بۆ ئەو بەرە
قیبلەنووماکە دڵەکەم تۆ پشتی پێ دەبەستی لە ئێسکە
ئێسقانی قاچە گەورەیەك وێنەی جەمسەر و بەردی خەتخەتێن دەکێشێ
بۆ برینی ئەدگاری ترسناکی ئۆپێراکان لە خۆ دەگرێ
بۆ کێلی سەرگۆڕم خواوەندێك بارانی خوڕ دەبارێنێ
ئەمە ئەو شەوەیە من تیادەمرم ئەی تۆمب ئیسواغی[9] ئازیز
جوانترین نیگای تۆ تەنها ئارایشتی کۆمەڵێك ئامێری نامۆی ڕۆژباشێکە:
ماڵئاوا! بێ ئەستۆی پاك و فریو خۆشم ویستی،
ئەی فۆلی– مێغیکوغ ئەی مشەخۆرە بێدەنگەکەم.
قیبلەنوومای نیشان پێچراو گەڕانەوە ڕادەگەیەنێ.
"خۆم وا دەبینم"، *1926*، (گالیمار)

## پەراوێزەکان

*1*–لە ڕووانگەی فرۆید نەست لە ڕێگەی هۆش و لەژێر کاریگەری لەمپەرە ئەخلاقی و کۆمەڵایەتییەکان پێشوازی لە پاڵنەرە چەپێنراوەکان دەکات. کە ئەم چەپاندنە دەبێتە نەخۆشی، چارەسەرکردنی دەروونشیکاری وەك هۆکارێك بۆ ئازادکردنی نەست بەشداری دەکات و خەون وەك جۆرێك چەپێنراوی سروشتی بەکاردەهێنێ.

*2*–نووسەر ئاماژە بەوە دەکات کە نادجە پێویست بوو لە خەڵوەتگەیەکدا بەند بکرێت دوابەدوای خۆبەدەستەوەدان بە کارێکی نابەجێ کە لە ڕێڕەوەکانی ئوتێلەکەیدا ئەنجامی دەدا.

*3*–خودی منی ڕاستی کەسایەتی ناخە.

*4*–بۆ نموونە لە "ئۆرێلیا" نێغڤال (ل *280*، سەدەی نۆزدەیەم). بەڵام جیهانی دووەم لەم ژیانە لە کەسایەتییەکی فیزیکیدایە نەك هێمایی.

*5*–شەو لە لایەن کۆمەڵە کەسێك دەستپێدەکات و وێنەی دەریایەك کە بە بەشی پێشەوەی کەشتییەك –جۆجۆ السفینة– دەستپێدەکات.

*6*–دەوڵەمەندەکان بە گیانەوەری زیانبەخش بەراورد دەکرێن.

*7*–پەیوەندی هاودژ لە نێوان فرمانی داهاتوو و تەواوکەرەکەی لە ڕابردوو هاوسەنگە لەگەڵ ئاوەژوویی و تەنانەت نەهیکردنی کاتێکدا.

*8*–وێناکردنێکی هاوشێوەی فیلمە سوریالییەکانە.

*9*–ئافرەتەکە ناوی شەقامێکی پاریسی لێدەنرێ.

## سەرچاوە

*Xx siecle collection litteraire Lagarde at Michard*

*L'Age du surrealisme*

*Page\ 341- 349*

# ئەو شەوە ماچانەی هۆکاری تووڕەیی پرۆست بوون

مارگۆت دایکخراف

لە هۆڵەندییەوە: سەلاح حەسەن پاڵەوان

**"دایکە ئەوانە نەخۆشی مێشك نەبوون"**

وەك منداڵێك پرۆست گرفتی ئەوەی هەبوو کە خەو بچێتە چاوی. وێنە غەمگینەکانی ئەو شەوە ماچانەی دایکی نەك تەنیا بووە کلیلی نووسەریی پرۆست بەڵکو سەرمایەیەکی گەورەی بۆ شاکارە ئەدەبییەکانی مارسیل پرۆست پێك هێنا. ئەو ماچە شەوانەی لە هەردوو شاکارە ڕۆمانەکەی "*Jean Santeuil*" و "گەڕان بە دووی زەمەنی ونبوودا" هاتووە، لە بەسەرهاتی ژیانیدا بەدی ناکەین. لەبەرئەوەی سەرجەم ئەو کەسانەی لەسەر بەسەرهاتی ژیانی پرۆستیان نووسیووە ئاماژەیەکی ئەوتۆیان بەم ڕووداوە نەکردووە.

جۆرج د. پاینتەر لە بیۆگرافیە بەهێزەکەیدا کە لە بارەی پرۆست (بە ناوی پرۆست ساڵی *1959*) نووسیویەتی ئەڵێ: لەبەرئەوەی ئێوارەیەکیان دایکی پرۆستی حەوت ساڵە لە باخچەی خوار حەوشەکەیاندا خەریکی پێشکەشکردنی نانی شێوان ئەبێت و ناچێتە سەرەوە بۆ لای پرۆست، ئەویش لەسەر جێگاکەی ڕاکشاوە و چاوەڕوانە بەڵام دایکی ناچێتە سەرەوە تا ئەو ماچەی پێ ببەخشێ کە هەمیشە پێی بەخشیوە، ئەو منداڵە خەو ناچێتە چاوی و هەر چاوەڕوان ئەبێ و حاڵەتی تووڕەیی لا دروست دەبێت، بۆیە داوا لە یەکێ لە خزمەتکارەکانی ئەکات تا دایکی بۆ بانگ بکات. کاتێك کە دایکی وەپیر بانگەوازەکەی ناچێت، خێرا پرۆست پەنجەرەی ژوورەکەی ئەکاتەوە و بانگ ئەکات: "کەوا ئەوی بۆ ماوەیەك پێویستە".

دایکیشی لەبەرئەوەی ڕووداوێ نەقەومێ خێرا بەرەو ژوورەکەی سەرئەکەوێ، بەڵام پرۆست لە جیاتی ئەوەی ئارام بێتەوە، گریانێکی بە کوڵ دایئەگرێت. دایکی بە خزمەتکارەکەی ئەڵێ: کەوا پرۆست گرفتی مێشکی هەیە.

*Painter* لە ڕووی شیکردنەوەی دەروونییەوە بە دوو دێڕ ئەم ئەنجامەی دا بە دەستەوە کەوا مارسێل: "خەمێکی مەزنە".

دوای ئـەوەی *Painter* بـە وردی لـەم حاڵەتـەی کۆڵیـەوە و بـۆی دەرکـەوت ئـەم کـارە بـە کردارێکـی ئەنقەسـتانەی گشـتی دائـەنرێت و وا چـاوەڕوان ئـەکرێ دەربـارەی ڕووداوێکـە کـە ئـەو هیـچ دەسەڵاتێکی بە سەرەوە نییە:

*Ghislain de Diesbach* لـە کتێبەکـەیدا کـەوا دەربارەی پرۆستی ساڵی *1991* نووسیویێتی، باسـی هـەمان ڕووداو ئەکات؛ ئـەم ڕووداوە بـە ڕووداوێکـی زۆر دەگمـەن و سـیمبولێکی نـەوازە لـە شـێوەی خۆشەویستی گـەرموگوڕی پرۆست بۆ دایکی بـاس ئەکات.

هـەروەها ئـەو زیـاتر لـە ڕووی شـیکردنەوەی دەروونییـەوە ئـەم کـارە ڕوون ئەکاتـەوە: مارسـیل بەسـەر دەسـەڵاتی دایکیـدا سـەرکەوتووە، بـەڵام لـە هـەمان کاتدا بـەم کارەی دۆڕاندنی دەسەڵاتی خـۆی سەلماندووە، چونکە لەبەر ئەو هۆیانە نـەیتوانیووە گەشتەکانی دڵی خۆی کۆنترۆڵ بکات. سـەرکەوتنە گەورەکانی بەرەو دابەزین ئەچوون و بە هۆی هەست کردنـی بـەو ئـازاری ویژدانییـەی کـە پـاش هـەر سەرکەوتنێك تووشی ئەبوو. لەوێوە تێمای پرۆستی هەر لە خۆیەوە تێمای خۆشەویستێکی دڵشکاوە.

بیۆگرافیەکـەی *Ghislain* هـەوڵێك بـوو لـە هەوڵـەکانی کەسـێکی فەرەنسـی بۆئـەوەی *Brit Painter* لەسـەر کورسـی پادشـایەتی بیۆگرافـی پرۆسـت بهێنێتـە خـوارەوە. بـەڵام ئـەم شـەرەفە لـە پاشان بوو بە نسیبی *Jean- Yves Tade*، ئـەم زاتـە سـاڵی *1996* بیۆگرافییـەکی لـەبارەی پرۆسـتەوە نووسی، تا ئێستاش بە باشترین کاری هونەری لە قەڵەم ئـەدرێ، ئـەم کابرایـە هـەموو ئـەو تیۆریانـەی پرۆستی بەکارهێنا، هەروەها هەموو ئەو کلێشە بێ سوودانەی پشتگوێ خست کـە دەربـارەی پرۆسـت بوون، هەرچەندە زۆربەی زۆری بابەتەکانی پرۆست، بۆ خوێنەر تێمایەکی ماندووکەرن.

ئەوانەی کە پرۆستیان خۆش ئەوێ و ئەیانەوێ کـارە ئەدەبییـەکانی بـە وەرگـێڕاوی بـە زمـانی ئینگلیزی بخوێننەوە ئەوا دووبارە ئەم فرسەتەیان دەسـت کـەوتووە، دەزگایـەکی بڵاوکردنـەوەی ئینگلیزی وەك یادکردنەوەیـەك بـۆ *80* هەشتاهەمین ساڵرۆژی مەرگی پرۆست هەموو کارەکانی "گەڕان بە دووی زەمـەنی ونبـووی" پرۆسـتی دووبـارە بڵاوکردەوە.

*Tade* لە کارە بیۆگرافیەکەی تەنیا سێ لاپەڕەی بۆ ماچە شەوانەی پرۆست تەرخان کردووە، بەڵام لە دواییـدا ئـەوەی جێگـیر کـردووە کـەوا لـە ژیـان و بەڵگەنامـەکانی نووسـەر و ئەوانـەی دەربـارەی نووسەرن هیچ نامەیەك نین کە ئاماژە بـەم ڕووداوە بکەن.

لە پاشاندا *Tade* بەلای ڕۆمانی *Jean Santeuil*ی پرۆسـت ئەیشـکێنێتەوە و ئـەڵێ: "ئـەو ڕۆمانـە بـە تەواوی بەسەرهاتی ژیانێکە بۆ خۆی" هەروەها *Tade* هیچ خـەیاڵێك بـۆ پڕکردنـەوەی درزی نێو بەڵگەنامـە بیۆگرافییەکـەی بـەکارناهێنێ و هـەروەها ئـەو ڕووداوانەی کە بەناوبانگن دووبارەیان ناکاتەوە. زۆر دووبارەبوونـەوە لـە تیماکـاندا، مانـای بوونـی بونیادێکی زەینییە.

*Tade* زۆر وردەکارانـە لـەنێو ڕۆمـانی *Jean Santueil* ئـەو بەشـانە هەڵئـەبژێرێ کـە تیـایدا وشەکانی دایك "کە هۆکاری نەخۆشییەکانی مێشکی پرۆسـتە" بەڵگەیـەکی گومـان نەویسـتن. بـەپێی بۆچوونـی *Tade* کاردانـەوەی تـرس هیـچ پەیوەندییەکی بە مەسەلەی سەرکەوتنی دەسەڵاتەوە

نییە، بەڵام پەیوەندی بە مەسەلەی بیرێکەوە هەیە ئەویش ترسێکە کە ئەو منداڵە ناتوانێ خۆی لێ دەرباز بکات، ئەم ترسە لە لایەن گێڕەرەوە دراوەتە پاڵ حاڵەتێکی تووڕەئامێز لە بێ دەسەڵاتی و ناچاری. یان بە واتای *Tade* ئەو حاڵەتە "نەخۆشییەکە کە لە ناهۆشمەندیدا سەری هەڵداوە"، ئەو منداڵە (واتە پرۆست) هەمیشە بە هۆی بە تەنیایی بەجێهێشتن ئازاردراوە، ئەم حاڵەتەش لە سەرەتادا لە شێوەی "نەخۆشی عەسەبی" و لە پاشان لە حاڵەتەکانی هەناسەتەنگیدا رەنگی دایەوە. کلیلی یەکەمین رووداوی رۆمانی *Jean Santeuil* لەبەر ئەو هۆیانە وەك نموونە باسی ئەو رووداوانە ئەکات کە لە ژیانی رۆژانەی ئەو لاوەدا روویداوە. *Tade* وەك نموونە بەڵگەیەك لە نامەیەکی پرۆست کە بۆ بارس *Barres*ی ناردووە ئەینووسێتەوە، نامەکە هی مانگی کانوونی دووەمی *1906* "پاش مەرگی دایك"، لەو نامەیەدا پرۆست باس لە ژیانی خۆی ئەکات، ژیانی خۆی وەك مەشقکردنێك باس ئەکات، کە خۆی تیادا لەگەڵ مەرگدا رائەهێنێ واتە مەرگی دایکی (واتە پرۆست هەمیشە لەو مەرگە ترساوە کە یەخەی دایکی بگرێت و لە ژیانیدا ترسێکی گەورە بووە، بۆیە بەردەوام مەشقی ئەوەی کردووە کە مەرگی دایك لای خۆی ئاسایی بکات) هەروەك چۆن پرۆست ئەو هەڵسوکەوتەی بەرپەرچ دایەوە کە چەندین جار ئەیویست بگەڕێتەوە بۆئەوەی ماڵئاوایی لە دایکی بکات، هەروەها چۆن پێش ئەوەی سەربنێتەوە و چۆن دایکی ماڵئاوایی لێ ئەکرد دەیەها جار سواری شەمەندەفەر بووە و گوندەکەی بەجێ هێشتووە.

*Tade* بۆئەوەی زیاتر تیۆرەکانی لای خوێنەر جێگای قبووڵ بێت چەند رووداوێکی دیکە لەنێو نامەکانی بە نموونە ئەهێنێتەوە. ئەو رووداوانەی کە ئەو باسی کردوون بریتین لە کۆمەڵە رووداوێك لە هیچ شتێکی تر ناچن، هەروەها لە *Tade 1959*ی مامۆستا لە سۆربۆن چوار کتێبی لە بارەی ئەدەب و رەخنە بڵاوکردەوە، هەروەها کتێبێك لەسەر کارەکانی پرۆست نووسیووە، کتێبی لە بارەی رەخنە و لێکۆڵینەوەیەك دەربارەی هەموو ئەو شتە جۆراوجۆر و ئامادەکردنی دەستنووس و سکێچانەی کە دەربارەی (گەڕان بە دووی زەمەنی ونبوودا)ن. هەروەها چوار بەشی گەورە و مەزنی لە کتێبێکدا بڵاوکردۆتەوە دەربارەی کارەکانی پرۆست.

هیچ کەسێك وەك *Tade* زیاتر باسی پرۆستی نەکردووە و بە راستی دەربارەی نووسین و نامە و کارەکانی پرۆست شتی نەنووسیووە. بۆیەش لەبەر ئەو هەموو هۆیانە *Tade* هەستاوە بە نووسینی بیۆگرافی دەربارەی پرۆست، ئەوەی ئەم کردوویەتی بەنرخترین بیۆگرافییە دەربارەی نووسەرێ واتە دەربارەی هەموو کارەکانی. ئەوەی پرۆست دەربارەی رەخنەی هونەری جۆن رۆسکین وتوویەتی *Tade* دەربارەی پرۆستی وتووە.

هەموو ئەو شتانەی *Tade* لە بیۆگرافییەکەی دەربارەی پرۆستی نووسیووە، لە ژمارەیەکی زۆر ژێرنووسدا نموونەی بەڵگەدار و شیکردنەوە ئەهێنێتەوە.. (ئەو شتانەشی کە لەژێرنووسەکاندا نووسراون بۆ کەسێ کە نایەوێ بیانخوێنێتەوە، ئەتوانێ باز بدا بەسەریاندا).

لە پێشەکی کتێبەکەیدا نارەزایی خۆی بەرامبەر بە *Diesbach* و *Painter* دەرئەبڕێ و ئەڵێ: ئەوان تەنیا ئەیانویست وێنەی ژیانی پڕ رەونەق و ساڵۆن و نەبیلەکان بخەنە روو، هەروەها ونبوون لەنێو ئەو هەموو چیرۆکە کورتانەی ئەو زەمەنە واتە "ئەو چیرۆکانەی لە زۆر گێڕانەوەیاندا کەس

خەندەیەك بۆی نایەتە سەرلێو"، بەڵێ پێشتر ئەوان بیۆگرافییەکانیان بۆ خۆشی ئەخوێندەوە نەك وەك بیۆگرافییەکی زیرەك ئامێز.

لە کاتی نووسینەوەی بیۆگرافییەکەی، ***Painter*** پرسیاری لە هیچ کەسێك نەکردووە دەربارەی ژیانی پرۆست، لە هیچ کەسێ نە لە هاوڕێ و کەسوکارەکانی، لەو کاتەشدا بە ئاسانی ئەیتوانی ئەم کارە ئەنجام بدات.

***Tade***ی لێکۆڵەرەوە خۆی بە ڕاستییەکانەوە سەرقاڵ کردووە هەروەها بوارێکی پڕ ئاسایشی بۆ خۆی داناوە تا لە شیکردنەوەی دەروونی و ئەو بابەتانەی تایبەتن بە سێکس دووربکەوێتەوە. ئەو بە پاڵپشتی ئەو کتێبانەی کە خوێندویەتییەوە و ئەو سکێچانەی کە جینالۆژی بیری پرۆستن درکی بە هەمەلایەنی زیرەکی پرۆست کردووە.

بە داخەوە زۆربەی نامەکانی پرۆست، ئەو نامانەی کە کەسایەتین، بە تایبەت ئەوانەی بۆ ***Reynaldo Hahn, Lucien Dandet*** نووسیوین تا ئێستا بڵاونەکراونەتەوە و ڕەنگە دەیەها ساڵی دیکەی بوێ بۆئەوەی بکەوێتە بەردەستی هەمووان.

### سەرچاوە

ئەم نووسینە لە ڕۆژنامەی ***NRC HANDELSBLAP*** ***Vrydag 4 Oktober 2002*** بڵاوکراوەتەوە.

# خوێندنەوەیەکی ڕەخنەگرانە بۆ کتێبی "بنەمای باوکسالار"

## توێژینەوەیەك لەبارەی کۆمەڵگەی هاوچەرخی عەرەبەوە

خوێندنەوەی: ئەحمەد موسڵی

لە عەرەبییەوە: هەڵکەوت عەبدوڵڵا




ئەم کتێبە بە دوو پێشەکی دەستپێدەکات: یەکێك بە عەرەبی بۆ دەقە وەرگێڕاوەکە، یەکێکی دیکە بە ئینگلیزی بۆ دەقە بنەڕەتیەکە. کتێبەکە لە *10* بەش پێکدێت.

نووسەر لە پێشەکیەکەدا هێما بۆ ئەوە دەکات کە نوشستیەکانی کۆمەڵگەی عەرەب دەگەڕێتەوە بۆ سەپاندنی دەسەڵاتی سەڵتەنەتی نوێ و بەردەوامبوونی پێکهاتەی باوکسالار و چەسپاندنی کەسێتی باوکسالار. لە سەرەتادا نووسەر گریمانەی ئەوە دەخاتەڕوو کە دەسەڵات، جا مادی بێ یان ڕۆحی یاخود دەروونی، ڕەوایەتی خۆی لە توانای دابینکردن‌و بەردەوامی بەهاو پەیوەندییە باوکسارییەکانەوە بەدەستدێنێ‌و سیستەمی باوکسالاریش پشت بە ژن دەبەستێ، کە لەهەمان کاتدا خاڵی لاوازی‌و ئامرازی بەردەوامی خۆیەتی.

کاتێك ژن دەتوانێ ڕەتبکاتەوەو بەرگریبکات. ئەوا بنچینەکانی ئەو سیستەمە دەلەرزێو ڕەوایەتی دەکەوێتە ژێر گومانەوە. کەواتە مەرجی ئازادبوونی کۆمەڵگە، ئازادبوونی ژنە کە بە پلەی یەکەم دێت، چونکە دەبێتە هۆی ژێروژورکردنی پێکهاتەی پیاوی باوکسالار. جا لەبەر ئەوەی پەیوەندیی نێوان پیاو و ژن لە چواردەوری سێکس چەقیبەستوە، ئەوا دەبێ ئەو پەیوەندییە بگۆڕێت بۆ پەیوەندییەکی دامەزراو لەسەر بنچینەی ئەقڵانیەتو بەرژەوەندیی کۆمەڵایەتی. چونکە هیچ ئازادییەکی ڕاستەقینە بێ ڕزگارکردنی ژن، لەکاتی کۆششکردن بۆ ئازادی کۆمەڵگەدا، دەستەبەرناکرێ. کەواتە د.هشام شەرابی دەیەوێ ژن پێش گەیشتن بە ئازادکردنی کۆمەڵگە ئازادبکات، بەوەش هەلومەرجی بابەتی وەلاوەدەنێو ڕاستییە مێژوویيو تیۆرییەکان ڕەتدەکاتەوە.

بۆ نموونە، خۆرئاوا وێڕای ئازادکردنی ژن چەندین سەدە پێش ئازادکردنی بەکردەوە لە دەسەڵاتی باوکسالار و ڕزگارکردنی لە دەستی فەلسەفەکانو بیری سەدەکانی ناوەڕاستو دامەزراوە ئاینيو سیاسيو تەقلیدییەکان، کەچی هەتاکو ئیمڕۆش ژنان بە شێوەیەکی هەمەگیر ئازادنین. ئەمە ئەگەرچی هەنگاوی زۆریان هەڵهێناوەو چوونەتە بواری کارەوەو ململانێی پیاویان کردوە، بەتایبەتی پاش جەنگی جیهانی دووەم، بەهۆی کەمبوونەوەی ژمارەی هێزی کار لەبەر جەنگ. هەروەها ژنان چوونە بازاڕی کارەوەو توانای کڕینیان بەدەستهێنا، سەرەنجامیش کەسایەتیی مەعنەویو یاسایی یەکسانیان لەگەڵ پیاودا بەدەستهێنا. واتە دەسەڵاتی سەرمایەداریی خۆرئاوا وەك بەرهەمهێنەرو بەرخۆر مامەڵەی لەگەڵ ژندا کرد، ئەنجامی ئەوەش گۆڕانکاری زۆر لە ئابووریو کۆمەڵگەدا ڕوویاندا.

نووسەر ئامانجی کتێبەکە دیاریدەکات، بەوەی ڕەخنەگرتنە لە سیستەمی باوکسالار کە سێ ئامانجی مێژوویی لە دەستداوە: "یەکگرتن، بووژانەوەی ئابووریی نەتەوەیی، بنیاتنانی کۆمەڵگەی دیموکراسی سەربەستو دادپەروەر". ئەمەش لەپێناو بەرەنگاربوونەوەو دۆزینەوەی حەقیقەتی ئەوانەو ڕەتکردنیان لە ڕوی بیرو پراکتیکەوە.

لە پێشەکی دەقە ئینگلیزییە وەرگێڕاوەکەدا ئامانجێکی دیکە دەخاتە سەر ئەو ئامانجە، ئەویش دۆزینەوەی چوارچێوەیەکی شیکاريو تێگەیشتنێکی تیۆريو میتۆدێکە کە دەرفەت دەڕەخسێنێ بۆ شیکردنەوەی ڕووداو، دیاردەو دەرهاویشتە جۆراوجۆرەکان، لە ڕوانگەی کۆمەڵایەتی هەمەلایەنەوە. خوێندنەوەکەی هشام شەرابی پشت بە چەمكو نموونەی ڕاستەوخۆ دیاریکراو یاخود ناڕاستەوخۆ دیاریکراو بە فیکری عەرەبی یاخود ئیسلامی نابەستێ، بەڵکو هەڵقوڵاوی ئەو تیۆرو ئەزموونە مێژووییانەیە کە پەیوەندییەکی ڕاستەوخۆیان بە واقیعی نەتەوەکەمانەوە نییە. نووسەر پێیوایە دەبێ سیستەمی باوکسالاری باڵادەست ڕەتبکرێو بنەمای سەربەخۆ (؟) بۆ ڕەخنەلێگرتنی بخرێتەڕوو، چونکە گوتاری باوکسالاری نوێ، جا عەلمانی بێت یاخود ئایینی، بەپێویست گرێدراوی شێوازی باوکسالاری باڵادەستە.

لێرەدا نووسەر میتۆدێکی ئینتیقائيو نازانستی پێڕەودەکاتو هەوڵدەدات چەمکە باوەکانی وەك کۆمەڵگەو مێژوو (وەك ئەوەی مارکس، هیگڵو ئەوانیتر دەریانبڕیوە) بخاتەگەڕ،

لەپێناو زەقکردنەوەی هۆکاری ڕۆشنبیریو سەرخان. ئەمە وێڕای ئەوەی جیهانی ئیسلام (جیهانی سێ) لە بنچینەدا بەدەست گرفتە ئابوورییەکانەوە دەناڵێنێ، واتە خراپی بەرهەمهێنان، دابەشکردن، بێکاریو بێدەرەتانی گوێزانەوەی تەکنۆلۆژیا.

نووسەر لە بەشی یەکەمدا چەمکی کۆمەڵگەی باوکسالاری نوێ لەگەڵ نوێکاریو سیستەمی باوکسالار ئاوێتەی یەك دەکات. ئەم چەمکەش چەمکێکی شیکارییو نموونەیەکی ڕووتو پرنسیپێکی لێکدەرەوەو تیۆریی کامڵە، هێما بۆ بنەمای کۆمەڵایەتی گشتی وەك دەوڵەتو لاوەکی وەك خێزان دەکات.

سیستەمی باوکسالار هێمایە بۆ کۆمەڵگەی تەقلیدی، لەکاتێکدا نوێکاری هێمایە بۆ گەشەکردن لە خۆرئاوا. بەو جۆرە کۆمەڵگەی باوکسالاری نوێ "بەرهەمی بالادەستیی ئەورووپای نوێیە". جا لەبەر ئەوەی بنەمای باوکسالار لە کۆمەڵگەی عەرەبدا ڕەتنەکراوە، ئەوا شێوازگەلی شێواوی موتوربەکراو بەنوێکاری بەدەستهاتوون، چونکە ڕێنسانسی عەرەب نەیتوانی شێوازەکانی سیستەمی باوکسالار و پەیوەندییە لەخۆگرتووەکانی (شاراوەکانی) تێکبشکێنێ. بۆیە کۆمەڵگەی باوکسالاری نوێ نە ناوچەییە، نە نوێیەو نە تەقلیدییە. چونکە ئەم کۆمەڵگەیە لەسەر بناغەی باوکسالاری تەقلیدیو پاشکۆیەتی دادەمەزرێ: کۆمەڵگەیەکی گشتیو کیانێکی مێژووییە بەهۆی هێزی ناوەکیو دەرەکیو سەرهەڵنەدانی چینێکی بۆرژوای گەشەکردو و چینێکی کرێکاری ڕاستەقینە خەمڵیوە: هەموو ئەمانەش بوونە هۆی سەرهەڵدانی چینێکی دووڕەگ لە ناوەڕاستی سەدەی بیستەمدا کە بالادەست بوو بەسەر کۆمەڵگەی باوکسالاری نوێدا. سەرهەڵدانی ئەم کۆمەڵگەیە هاوکاتی دەستپێکردنی کاریگەریی خۆرئاوا بوو لەسەر ژیانی عەرەب، بەلام ئەوەی نووسەر پشگوێیانده‌خات ئەوەیە، ئەو پەیوەندییەی نێوان ئەو دووانە تەنیا پەیوەندیی جووتبوون نییە، چونکە یەکێکیان: کۆلۆنیالیزمو ئیمپریالیزم، بوە هۆی لەدایکبوونی کۆمەڵگەی باوکسالار، جا لەبەر فەرمانڕەواییکردنی ڕاستەوخۆ بووبێ یان پێکهێنانی دەستەبژێری دابڕاو لە ڕابردوو و بێتوانا لەئاست جڵەوکردنی ئێستاو داهاتووی خۆیدا.

نووسەر دان بەوەدا دەنێ کە قۆناغی عوسمانی، لەناوەڕاستی سەدەی نۆزدەهەمەوە، هێڵێکی جیاکەرەوەیە لەنێوان دوو مێژوودا: سەردەمی لێکەوتنو سەردەمی ڕێنسانس، بەلام پێموایە ڕێنسانس دابڕانێکی ڕۆشنبیریی گشتی نییە لەگەڵ ڕابردوو و بنەمای بۆماوە لە بواری فیکرو ڕێکخستنی کۆمەڵایەتیدا. بۆیە کۆمەڵگەی باوکسالاری نوێ هێزی ناوەکیو هوشیاریی خۆیی نەبوو، کە یەکێکە لە نیشانەکانی بنەما کۆمەڵایەتیە نوێکان. لە سیماکانی ئەم کۆمەڵگەیانە کە پەیوەندییەکانی لەسەر بنچینەیەکی پۆپتیژ (هرم) دامەزراوە، گوێڕایەڵیو سەرکوتکردنە. بەڵگەی ئەوەش، بەکارهێنانی دامودەزگای ئاسایشە لەلایەن دەوڵەتی باوکسالارەوە بۆ ملکەچکردنی میللەتەکەی. نووسەر بایەخێکی ئەوتۆ بەم تێبینیە گرنگە نادات، ئەگەرچی هێما بۆ ئەوە دەکات کە کۆمەڵگەی عەرەب هەوڵیداوە بەربەستی دەسەڵاتی باوکسالاری پۆپتیژی بکات، بەلام ئەمجۆرە دەسەلاتخوازییەو شێوازە سیاسیەکانی کێشەی ڕاستەقینەن نەك ڕۆشنبیریی نەتەوە یان ڕابردووەکەی. چونکە بە دانپیانانی نووسەر هاولاتی هەوڵدەدات لە دەسەلات دووربکەوێتەوەو لە خێزانو عەشیرەتو تایەفە نزیکبێتەوە.. بەلام گەڕانەوە بۆ

خێزان یان عەشیرەت، یا توێژی ئایینی و ئیتنیکی سەرەنجامێکی سروشتی بەهەڵە بەکارهێنانی دەسەڵاتی باوکسالار بوو، جا تەقلیدی بێت یاخود نوێ.

سەرەنجراکێشانی نووسەر بۆ ئیزدواجیەت و لەتبوونی کۆمەڵگەی باوکسالار، کە لە وردەبورژوادا بەدەردەکەوێ، دەبێتە هۆی ناکۆکی بەهاکان و پێکدادان و پێکەوە ژیانی پێکهاتەی ناکۆک و هوشیاریی ئاڵۆزو پێك نزێك کە هەست و خرۆشی میللەتی عەرەب کزدەکات، ئەو میللەتەی خەونی بە یەکێتی و یەکگرتنەوەوە دەبینی، واشی لێدەکات لەگەڵ سەرچاوە بچووکەکاندا بکەوێتە دیالۆگەوە.

نووسەر هێما بۆ ئەوە دەکات سەرۆك و ئەفسەرەکانی ئەم چینە وردەبۆرژوایە هەڵسان بە گرتنەدەستی فەرمانڕەوایی لە زۆربەی وڵاتە سەرەکیەکاندا، بەڵام ئەم چینە "چینێکی کۆمەڵایەتی بەواتەی وردی وشەکە پێك نەهێنا"، بۆیە دەستەوەستاوبوو لەئاست پەرەپێدانی ئابووریی سەرمایەدارانە، کە ئەرکی بۆرژوای کلاسیکیەو گۆڕانکاریی شۆڕشگێڕانە، کە ئەرکی پڕۆلیتاریای کلاسیکیە. چونکە پاشکۆیەتی و ئیمپریالیزم ڕێگەیان لە خەمڵینی ئەم چینە گرت. ئەمەش بوە هۆی باڵادەستیی وردەبۆرژواو وەستانی شۆڕش و لێکترازانی دنیای عەرەب بۆ ڕژێمی دژ بەیەك. ئەم شکستخواردنە ئاقارێکی ئایدیۆلۆژی بۆ جەماوەری وردەبۆرژوا هێنایەئاراوە، ئەویش ئاقاری ئوسوڵی ئیسلامی بوو.

عەرەب تەنیا بەدەست توێژی فەرمانڕەواوە نەیاندەناڵاند، بەڵکو تووشی تەنگوچەڵەمەی زۆریش کران کە تایبەتن بە ناسنامە، مێژوو و خۆرئاوا. چونکە ڕابوون و چاوکرانەوەی عەرەب لە فیکری نووسەردا، لە بنچینەدا ململانێی ڕۆشنبیریی و کۆمەڵایەتی نێوان عەلمانیەت و ئیسلامە. لەبەرئەوەی عەلمانیەت خۆرئاوای وەك مۆدیل وەرگرت و بزووتنەوەی ئیسلامیش پشتی بە توخمەکانی ئیسلامی ڕیفۆرمیستانە بەست و هەردووکیان "دوو سیستەمی حەقیقەتی بنچینەیی" یان خستەڕوو، بەڵام نەیانتوانی وتارێکی ڕەخنەیی یان شیکاری بخەنەڕوو، چونکە ئاقاری ئیسلامی لە ڕوانگەیەکی ئایدیۆلۆژییەوە ڕوانیە خۆرئاواو ئاقاری عەلمانیش لەسەر بنچینەی ئایدیۆلۆژیای بنیاتنراو ئەڵتەرناتیڤێکی سمبولی خۆرئاوای پێکهێنا. ئەمەش بوە هۆی ئەوەی بکەوێتە ململانێیەکی ناوەکی سەرسەختانەوە. وێڕای ئەوەی ئوسوڵیەتی ئیسلامی بۆتە بزووتنەوەیەکی جەماوەری، کەچی بە بڕوای نووسەر دەستەوەستاوە لەئاست خستنەڕووی هەر چارەسەرێکی هەمیشەیی بۆ نەنگیە بنەماییەکان و تەنیا دەتوانێ ڕواڵەتەکان چارەسەربکات. هەروەها بزووتنەوەی عەلمانی دابڕاوبوو لە جەماوەر و نەیتوانی، بە شێوەیەکی سنووردار نەبێ، کاریگەری بخاتە سەر سیستەمە سیاسیەکان. کەچی سیستەمە سیاسیەکان، کە ڕەتکردنەوەی کەلەپووری ڕاست و نوێکاری ڕاست بوون، لەژێر کاریگەریی ئوسوڵیەت و بزووتنەوەی ڕەخنەییدا کەوتنە بەردەمی ئەگەری کەوتن.

لەبەشی دوەمدا، نووسەر سیستەمی باوکسالار دیاریدەکات بەوەی، چەمکێکە بەکاردێت بۆ پێناسەکردنی جۆرێکی دیاریکراوی بیرکردنەوەو شێوازێکی جیاکارەی ڕێکخستنی ئابووری و کۆمەڵایەتیۆ بنەمایەکی کۆمەڵایەتی پێش سەرمایەداری کە لە ڕوی مێژووییە بە شێوەی جۆربەجۆر لە ئەوروپاو ئاسیادا هەبوە، بەڵام ئەو توخمانەی ڕەنگێکی عەرەبی پێدەبەخشن "بیابان" و جڵەوکردنی بازرگانی و دەسەڵاتی سیاسیە لەلایەن

شارنشین و بیابانشینەوەو ملکەچی جوتیارانە بۆ هەردووکیان. واتە کۆمەڵگەی باوکسالاری عەرەب، بەپێی پێناسەکەی نووسەر، کیانێکی دەروونییە لەسەر پێکهاتەیەکی بەهاو شێوازی ڕەفتار ڕاوەستاوە کە گرێدراوی سیستەمێکی ئابووری و ڕۆشنبیریی دیاریکراوە. نووسەر لەبەرئەوە دەگاتە ئەم پێناسەیە، چونکە بەمجۆرە پێناسەی نوێکاری دەکات: سیستەمێکی مەعریفییە لەسەر فیکرو ئەقڵ ڕادەوەستێ و بە ڕێگەی زانستی ڕەخنەگرانە دەگاتە ڕاستیەکان و زمانەکەی شیکارانەیەو سیستەمێکی سیاسیی دیموکراسییان سۆسیالیستی و پێکهاتەی کۆمەڵایەتی چینایەتیە. ئەمەش پێچەوانەی پێناسەکەیەتی بۆ سیستەمی باوکسالار (سیستەمێکی مەعریفیە لەسەر ئایین یان ئەفسانە ڕادەوەستێ و بە ڕێگەی ئایینی و فیکری دەگاتە حەقیقەت و زمانەکەی ئاشکراکارە و سیستەمەکەی لەسەر بنچینەی سەڵتەنەت یان بیروکراسی دامەزراوەو پێکهاتە کۆمەڵایەتیەکەی خێزانی، قەبیلەیی یان تایەفەگەرانەیە. لێرەشدا نووسەر پێمان ناڵێ کۆمەڵگە ئیسلامیە سەرەتاییەکان لەژێر فەرمانڕەوایی خەلیفەکان یان ئەمەوی و عەباسییەکان و ئەوانیتردا چۆن گەشەیانکردوەو گەیشتونەتە بەرهەمهێنانی ئەو دەستکەوتە پێشکەوتوانە لە بواری فیکرو زانست و گەشەکردنی ئابووری و مادیداو چۆنیەتی هەڵسەنگاندنی مەسەلەکان لە ڕوانگەی نوێکاریی خۆرئاواییەوە، کە نووسەر بە پێوانەیەکی جیهانی بۆ تاوتوێکردنی نوێکاری دەزانێ. چونکە فیکری ئەفسانەیی یان ئیمانداری و ڕاستی ئایینی و زمانی ئاشکراکار ڕێگەی گەشەکردنی لە موسڵمانەکان و عەرەب نەگرت، بەڵکو لە هەندێ لایەنەوە هاندەری گەشەکردنی گشتی بوو. کەچی نووسەر هەموو ئەوانەی ڕەتکردۆتەوە، بەوەی نوێکاری لەسەر ئاستی فیکر کردۆتە دیالەکتیکیانەو لەسەر ئاستی ئایینی پراکتیکی کردۆتە شۆڕشگێرانە. ئەمەش لە چوارچێوەی ئەزموونی خۆرئاوا لە سەدەی پانزەهەمەوە تاکو ئێستا، کە کیانێکی کامڵ و خاوەن بنەمای نوێی گشتی و سیاقێکی هەمەلایەن بوو بۆ نوێکردنەوەی ئابووری و تەکنۆلۆژی و هوشیارییەکی بە چۆنایەتی جیاوازنەبوو لەوەی ئەوروپا. بەو جۆرە وشەی ئەوروپا یان خۆرئاوا هاوتای هەموو شتێکی نوێ دەبێ و ئەوەی ئەوانەشی نەبێ نوێ نابێ. پرۆسەی نوێکردنەوەش دەبێتە دیالەکتیکی گۆڕان و وەرچەرخان بە شێوازی خۆرئاوایی. کەواتە ئەوروپا لە فیکری نووسەردا تەنیا نابێتە چەقی باڵادەستی سیاسی، بەڵکو چەقی باڵادەستی فیکریش. هیچ یەکێکیش لەمانە لە فیکری خودی نووسەردا نییە، چونکە ئەو مۆدیل و مێژووی خۆرئاوا بەکاردەبات بۆ دیراسەکردنی مۆدێلەکان و مێژووی عەرەب و ئیسلام. لەڕاستیدا ناشێ لە مۆدێلە دامەزراوەکانی دنیای عەرەب لەمڕۆدا بگەین، لەڕێگەی باڵادەستی خۆرئاواو نوێکارییەوە نەبێ. بەڵگەی ئەوەش د.شەرابی لەکاتی باسکردنی وشەی نوێکاردا دیاردەی بەرکەوتنی نوێکاری خۆرئاوا لە سەردەمی ئیمپریالیزمدا بە پێوانەی نوێکردنەوە دادەنێ، چونکە بۆ ئەوەی کۆمەڵگەیەك نوێبێ، دەبێ هۆکارێکی دەرەکی هەبێت لە سیاقێکی ناوەکیدا کاربکات و جۆرێك لە گۆڕانی لەناودا دروستبکات، بەو شێوەیەش چەند جۆرێك نوێکاریی شێواو نیوەناچڵ گەشەدەکەن.

وێڕای هەموو ئەوانە، نووسەر پێیوایە کۆمەڵگە باوکسالارەکان خاوەن بنەمای ناوەکی هاوشێوەن (نەبوونی ڕەسەنایەتی بەهۆی پێکدادانە تەقلیدی و پێکدادانە نوێکارەکانەوە). چونکە مرۆڤێکی

ئوسوڵی بە واتای ڕاستەقینە بوونی نییە، بەڵکو نموونەی تاکی "نوێکار لەئارادایە، ئەمەش دەبێتە هۆی دۆزینەوەی توێژێکی ڕۆشنبیریی نوێکار کە ناکۆکە لەگەڵ سیستەمی باوکسالاری نوێدا. نووسەر هوشیاریی ئەو توێژە بە تەماهیکردن و ملکەچی، بەپشتبەستن بە نموونەیەکی دەرکی باسدەکات. کەواتە ناکرێ لە ناسیۆنالیزمی عەرەبی بگەین، بێ ئەوەی گرێیدەینەوە بە چەمك و ئەزموونی خۆرئاواوە. چونکە نوێکاری باوکسالاری "هوشیارییەکی نموونەئامێزی گرێدراوی دەرەوەیەو پێویستی بە سەربەخۆیی و ڕۆحی ڕەخنەگرتن هەیە".

سیستەمی باوکسالاری نوێ بە سێ قۆناغی مێژوویدا تێپەڕیوە، کە نووسەر بەم شێوەیە دیاریدەکات: *1/* سیستەمی باوکسالاری کۆن، کە بریتیە لە سەردەمی جاهیلی و سەردەمی پێغەمبەرو خەلیفەکانی ڕاشدی، *2/* سیستەمی باوکسالاری تەقلیدی لە خیلافەتی ئەمەوی و عەباسی و سەڵتەنەتە بچووکەکان و سەڵتەنەتی عوسمانیدا، *3/* سیستەمی باوکسالاری هاوچەرخ کە لە دەوڵەتە عەرەبیە هاوچەرخەکاندا هەیە.

سیماکانی سیستەمی باوکسالار بریتیە لە بەرگریکردنی کۆمەڵگەی قەبیلەیی عەشایری لە بەرامبەر هەر گۆڕانکاریەك لە بنەماکەیدا، هەر لە سەردەمی جاهیلیەوە تا کۆتایی سەدەی نۆزدەهەم و سەرهەڵدانی سیستەمێکی ئایدیۆلۆژی یاسانا‌سی لە سەدەی حەوتەوە کە نزیکایەتی بەکارهێنا بۆ چەسپاندنی پەیوەندییە باوکسالارییە ئابووری و کۆمەڵایەتیەکان، بەڵام تۆ بڵێی پێکهاتەی کۆمەڵگەو دەوڵەت و ئابووری لە سەردەمی پێغەمبەرو خەلیفەکانی ڕاشدیدا وەك پێکهاتەی کۆمەڵگە جاهلیەکان بووبێ؟ چونکە ئیسلام تەنیا پەیوەندییەکانی نێوان تاك و خێزان و قەبیلەکانی ڕەتنەکردەوە، بەڵکو بناغەیەکی بۆ فیکر و ئایدیۆلۆژیایەکی جیهانی دانا کە ئەو کۆمەڵگە باوکسالارییەی ڕەتکردو نەتەوە پێکهات، نەك لە قەبیلەکان و شارنشینەکان بە تەنیا، بەڵکو لە توخم و ڕەگەزو میللەتی جیاوازیش. بێگومان ئەمەش جیاوازبوو لەگەڵ پێکهاتەی سەردەمی جاهیلیدا. دکتۆر شەرابی پێیوایە ئەم کیانە باوکسالارە کۆنە (جاهیلی و ئیسلامی) دنیا دابەشدەکەن بۆ (عەشیرەت و دژە عەشیرەت)، (ئیسلام و کافر)، واتە بۆ "پەیوەندییەکانی خوێن کە زاڵە بەسەر هەر جۆرێکی دیکەی پەیوەندیی کۆمەڵایەتیدا"، بەڵام نووسەر پێمان ناڵێ خەوارجەکان یان موعتزیلەکان یاخود شیعەکان چۆن جیابونەوە؟ ئایا بەهۆی پەیوەندییەکانی خوێنەوە بوو بەتەنیا؟ ئەی پێغەمبەر کۆچکردوەکان و ئەنسارەکانی ئاشت نەکردەوەو بەرزینەکردنەوە بۆ ئاستێکی بەرزتری هۆشیاریی خۆیی. ئەگەرچی ڕاستە ئەرك و بەرپرسیارییەکان وردکارانەو بەڕوونی لەناو ڕێکخستنی دیاریکراون و لە دەرەوەی دیارنەکراون و ڕوون نین، بەڵام ئەمە بۆ نەتەوەی ئیسلام ڕاست نییە کە فیقهەکەی ماف و ئەرکەکانی لە دەرەوەو ناوەوەش دیاریکردوە. کورتکردنەوەی ئیسلام بۆ وێنەیەکی هاوجووتی جاهیلیەت و ناونانی نەتەوە بە قەبیلەیەکی گەورە، ملکەچکردنی تێڕوانینی جیهانیانەی ئیسلامە بەرامبەر بەخۆی و بەگەردوون بۆ تێڕوانینێکی قەبیلەیی نادروست. چونکە ئیسلام هەوڵیدا دەسەڵاتی خواوەندە قەبیلەییەکان لەناوبەرێ و یەکتاپەرستی بۆ عەرەب قۆرخ نەکرد. بۆ ناشێ دکتۆر شەرابی "بڕوانێتە دیاردەی مەحەمەدی، بێ ئەوەی ڕەچاوی شێوازە باڵاکانی ڕێکخستنی قەبیلەیی بکات کە نوێنەری بوو". بەپێی

نووسەر، پێغەمبەر توانی بەپیر پێداویستیەکی ئابوورییەوە بچێ، ئەنجامی گەشەکردنی بازرگانی ڕێگادوورەکان. بەم شێوەیە نووسەر محمەدی پێغەمبەر دەکاتە ڕێکخەرێکی ئابووری بۆ بەپیرەچوونی پێداویستیەکانی سیستەمی ئابووری جاهیلی.

لەبارەی خێزانەوە، د.شەرابی پێیوایە کۆمەڵگەی باوکسالار هانی بالادەستیی خێزانی گەورە بەسەر خێزانی بچووکدا دەدات، واتە بالادەستی باوکسالاری بەسەر دیموکراسیداو ئەوە لەبیردەکات کە خێزانی گەورە یاخود قەبیلە لە ڕەوتی عەرەبیدا لەسەر سیستەمی شورا دامەزراوەو خێزانی بچووکیش لەسەر بنچینەی چەوساندنەوەی لەلایەن پیاوەوە دامەزراوە. لەڕاستیدا یەکسانی، پەیوەندیی بنچینەیی قەبیلە پێکدێنێ، نەك خێزانی بچووك، وەك د.شەرابی دەیبینێ، بەلام سەربەخۆیی ئابووری، ناونیشانی ئازادی ژنە (بورجوازیەت)و پێش لەناوبردنی دەسەلاتی باوك بەسەر خێزانو ژندا دەکەوێ، نەك بە پێچەوانەوە. ئەمەش ئەوەیە لە ئەزموونی ئەوروپییەوە فێریبووین، چونکە پیاو بەرپرسی مادیو مەعنەوی خێزانەو پارە سەرفدەکات بۆ پاراستنی خێزان. ڕاستیەکەی ئەوەیە، تێڕوانینی کۆمەڵگەی باوکسالار لایەنگری پیاوە، بەلام بەهۆی بارودۆخی ئابووریی ژنەوە. چونکە لە کۆمەڵگە خۆرئاواییە ناباوکسالارەکاندا ژن تا ماوەیەکی نزیك خاوەن هەمان مافی شارستانی پیاو نەبوو، بەلام بە گۆڕانی شێوازی بەرهەمهێنانو بەرخۆری، شێوازی دەسەلاتداریێتیو دواتریش دۆخی کۆمەلایەتی ژن گۆڕانی بەسەرداهات.

هەروەها ڕاستیەکەی ئەوەیە کە تاك لە کۆمەڵگەی باوکسالاری نوێدا ناتوانێ لەدەست خێزان یان عەشیرەت ڕزگاریبێ، چونکە دەوڵەت هێزێك نییە لەوەوە هەڵقولاوبێو دەیچەوسێنێتەوەو ڕەفتاری تاك ئەخلاقی دەبێت لەگەڵ خێزانو نائەخلاقی دەبێت لەگەڵ کۆمەڵگەدا. د.شەرابی پێیوایە ئەم دوالیزمە (ثنائیة) لەودیو کۆمەڵگەوە، لە ئایدیۆلۆژیادا، دەگۆڕێ بۆ مەنزلگەی جەنگو مەنزلگەی ئیسلام، لۆمەکە لێرەدا دەکەوێتە ئەستۆی دەوڵەت نەك خێزان، چونکە نشوستیهێنانی دەوڵەت وا لە تاك دەکات بگەڕێتەوە بۆ بنەما بنچینەییەکان. دابەشکردنی دنیا بۆ مەنزلگەی جەنگو مەنزلگەی ئیسلامو ئاشتی دابەشکردنێکی سروشتیە، کە ئایدیۆلۆژیا لەهەمان ڕوانگەوە تێیدەڕوانێ. چونکە دەوڵەتە پێشکەوتوە خۆرئاواییەکان یان سەرمایەداری جەنگیان دژی ئەوانیتر ڕاگەیاندو ملکەچیانکردنو کردنیان بە کۆلۆنی خۆیانو ئامرازێك بۆ بەکاربردنی کەرەستەی خاو و بازاڕێك بۆ ساخکردنەوە. لێرەشدا "سیستەمی باوکسالار" هۆکارنییە، بەڵکو سیستەمو فەلسەفەی سەرمایەداری. بۆیە، گوتەی شەرابی سەبارەت بەوەی: ئەم دوالیزمە دەستەوەستاوە لەئاست دەرککردنی ئەوەی گۆڕەپانی جەنگو تێکۆشان "لە دەرەوەی کۆمەڵگە نییە، بەڵکو لە ناخیدایە"، لە کاریگەریی ئەوی دیکە کەمدەکاتەوە، ئەمەش ئەوەیە کە نووسەر دواتر بۆی دەگەڕێتەوە.

لەو هۆکارانەی هوشیاریی نەتەوەیی تێکدەشکێنێ، ناکۆکی نێوان گریمانەی بنچینەیی ناسیۆنالیزمی عەرەب (واتە نەتەوەیەکی عەرەبی یەکگرتوو)و واقیعی کۆمەڵگەی باوکسالاری نوێیە (واتە فرەکیانی عەرەب). هەموو ئەمانە بوونە هۆی هەڵگەڕانەوەی بەها باوکسالارییەکانو بەربلاویی بزووتنەوەی ئیسلامی، کە بوە هۆی "سەرهەڵدانی بزووتنەوەی جەماوەریی ڕاستەقینە لە دنیای عەرەبدا". کۆمەڵگەی باوکسالار کە چینی بۆرژواو

وردەبورژوا تیایدا باڵادەستن، دەرفەتی بەردەوامی بۆ رەخساندوە، وەك د.شەرابی چەغدی لەسەر دەکاتەوە، بەڵام لە هەمان کاتدا هوشیاریی نەتەوە چینایەتیو ئینتەرناسیۆنالیستانە نییە، بەڵکو لە کەلەپوورە ئایینیو بەها تەقلیدییەکانەوە سەرچاوەدەگرێ. لێرەدا دەپرسین: ئایا لە بەها ئایینیو تەقلیدییەکاندا چەمکی یەك نەتەوە بوونی نییە؟ هەروەها بزووتنەوەی ئوسولی، کە بە بڕوای نووسەر دەشێ بتوانێ جەماوەر بە هۆشیارییەکی چینایەتی رەنگبکات کە ئامانجی هوشیاربوونی نەتەوەییە بەرامبەر بە خۆی، وەك نەتەوەیەك، نەك چینێك. ئاشکرایە سەرچاوەی سیستەمی باوکسالاری دامەزراو لە بنچینەدا لەسەر باڵادەستبوونی نییە بەسەر میللەتەکانیترداو لەرێگەی دابونەریتو بنچینە ئایینەکانەوە، بەڵکو پشت بە هێزی دەرەکی دەرەوەی نەتەوە دەبەستێ (وەك ولاتە یەککگرتووەکانی ئەمریکاو یەکێتی سۆڤیەتی پێشوو) کە بەهانە ئایدیۆلۆژییەکانو ئامرازەکانی سەرکوتکردنو باڵادەستیان لێوە بەدەستدێنێ.

نووسەر لەبەشی چوارەمدا هەوڵدەدات، لەرێگەی شیکردنەوەی خێزانی باوکسالارەوە، کە لەسەر پەیوەندییەکانی دەسەڵاتو باڵادەستیو پاشکۆیەتی رادەوەستێ، لە سیستەمی باوکسالار تێبگات. خێزانی باوکسالار هەڵدەستێ بە دابینکردنی یەکێك لە پێداویستیە بنچینەییەکانی کۆمەڵگەی باوکسالار، چونکە سیستەمی چاودێریکردنو ولائی کەسێتی دەچەسپێنێ. ئەمەش بەردەوامیی دەسەڵاتی خاوەن سروشتی باوکسالار مسۆگەردەکات. لێرەشدا د.شەرابی ولاء بۆ قەبیلە رەتدەکاتەوەو ولائی تاك بە بنچینەی خێزانو گروپی ئیتنیکی یان ئایینی دادەنێو داکۆکیدەکات لە سیستەمی چاودێریی دامەزراو لەسەر بنچینەی دابەشکردنی قازانجەکانو سیستەمی واستەکردن دەخوڵقێنێ. لەم روانگەیەوە، چەمکی پەیمانی کۆمەڵایەتی شیاونییە، چونکە کۆمەڵگە ملکەچی ویستی تاکەکەسیەو بەربەرەکانیکردنی یاسایی سەختدەبێو پیلانگێرانو یاخیبوون تاقە دوو شێوەی کاری سیاسی دەبن. د.شەرابی نائەقڵانیبوونی سیستەمی باوکسالاری هاوچەرخ بەهەمان سیماکانی سیستەمی باوکسالاری "نوێکراوە" دەخاتەروو. چونکە سیستەمی باوکسالاری تەقلیدی ناتوانێ لە دنیای نوێدا بەردەوامبێ.

بەشی پێنجەم چارەسەری بنەچە کۆمەڵایەتیو مێژوویییەکانی سیستەمی باوکساری نوێ دەکاتو نووسەر پێیوایە شێوەی دەسەڵاتی قەبیلەیی لەسەردەمی جاهیلیەتدا کۆڵەکەی راگری هەموو جۆرەکانی دیکەیە، چونکە سیستەمی باوکسالار (ئیسلامی وەك خیلافەتو ئینجا سەڵتەنەت) لەسەر بنچینەیەك دامەزراوە کە لە رووی سنووری جوگرافیو ئینتیماو زەوییەوە روون نییە، بەڵکو لەسەر بنچینەی ئایینو رەگەزو بنەمای خێزانو عەشیرەت پێکهاتەی بنچینەیی پەیوەندییە کۆمەڵایەتیەکان پێکدێنێ. لەبەرئەوەی ویستی فەرمانرەوا لە سیستەمی باوکسالاری عەرەبی ئیسلامیدا، لە رازیبوونی دەستپێوەندەوە سەرچاوەناگرێ، بەڵکو لە مافێکی خواوەندەوە. نووسەر درێژەپێدەدات، "ئەو پرنسیپە یاساییەی باسی گوێدێریی فەرمانرەوا دەکات، تەنانەت ئەگەر زۆرداریش بێ، پرنسیپێکی زۆرملێیانەیەو بەهیچ جۆرێك رێگە بە یاخیبوون لەدژی خۆی نادات، بەڵام لە رووی پراکتیکیەوە لادانێکی بەردەوامەو بڕواکە بەردەوامدەبێ لەسەر پێشگوێخستنی ئەوەی لە

واقیعدا ڕوودەدات!! لەواقیعدا ئەم یاسا زۆرملێیە یاسا نەبوو و زۆرملێش نەبوو، بەڵکو تێگەیشتنی واقیعی تیاداژیاوبوو کە لە ڕێگەیەوە فقیهەکانی ئیسلام، ماوردیو غەزالیو ئیبن جماعە و ئیبن تیمیە و ئەوانیتر، هەوڵیاندا جەغت لەسەر یەککگرتوویی نەتەوە بکەن، بۆ بەرەنگاربوونەوەی فیتنەی ناوەکیو دەرەکی. چونکە ئەو فەقیهانەو ئەوانی دیکەی پێش یان پاش ئەوان، ئەم پرنسیپەیان خستە نێو چوارچێوەیەکی تیۆرییەوە کە ئوسوڵیەتی ئیسلامی ڕەتکردەوەو ڕیفۆرمیستی ئیسلامی قبوڵیکردو مشتومڕیك لەنێوانیاندا سەبارەت بە خەبات ڕوویدا. هەروەها دەڵێین، چەمکی پەیمان لەنێوان فەرمانڕەواو فەرمانڕەواییکراو لە مێژووی ئیسلامدا لەلای زۆربەی هەرە زۆری موسڵمانەکان بوو لەڕێگە سەرچاوەی بڕواهێنانو پەیمانەوە. هەروەها ویستی فەرمانڕەوا، بەلای کەمەوە لە ڕوی تیۆرییەوە، لە مافی خواوەندەوە سەرچاوەناگرێ، بەڵکو لە هەڵبژاردنی موسڵمانەکانەوە. بۆیە ناکرێ شێوازەکانی فەرمانڕەوایەتی نوێ بگەڕێنرێتەوە بۆ بنچینە عەرەبیە ئیسلامیەکەی، بەڵکو پێویستە بگەڕێنرێتەوە بۆ چوارچێوەیەکی سەرچاوەیی تر کە بەرژەوەندییەکانی یەکانگیربوو لەگەڵ دۆزینەوەی دەستەبژێری فەرمانڕەوای زۆرداردا، کە مۆدێلەکانی فەرمانڕەوایەتی لە فەلسەفە خۆرئاواییەکانەوە هێناوە. ناچارین دان بەوەدا بنێین، مێژووی دنیای عەرەب لەکاتی هەڵمەتی ناپلیۆنەوە، مێژووی ململانێ بوو بەم یان بەو شێوەیە دژی ئەوروپاو باڵادەستیی سیاسیو ڕۆشنبیریو ئابووری. ئەمەش مانای دیمەنێکی هەڵەیە، کە بریتییە لە سووربوون لەسەر دانانی بنەمای ئایدیۆلۆژی ئیسلامی بە سەرچاوەی باڵادەستیو چەوساندنەوە، بەڵام لەلایەکی دیکەوە پێماندەڵێ شەپۆلی خۆرئاوا ئەوەندە بەهێزبوو کە توانی ڕۆشنبیری تەقلیدی تیخبکاتو ببێتە هۆی سەرهەڵدانی دەستەبژێری نوێ.

ئینجا هەوڵدەدات باسی پەیوەندیی نێوان دەستەبژێری بەخۆرئاوابوو و خۆرئاوا بکات، ئەوەش لە ڕێگەی دەستنیشانکردنی ئەو هەلومەرجی هەرەسهێنانە ئابوورییەی دنیای عەرەب بەخۆوەی دیبوو، کە ببوە ناوچەیەکی پەراوێزی پاشکۆی سیستەمی ئابووریی جیهانی ئەوروپی (سەرمایەداری)، ببوە هۆی چەسپاندنی پەیوەندیی پاشکۆیەتی لەسەر ئاستی ئابووریو ژیواری. لەکاتی سەرهەڵدانی سەربەخۆییدا، پاشکۆیەتی ئابووریو سیاسی لە دنیای عەرەبدا ڕوونتربووەوە، بەو جۆرە بنەمای ناوەکی هەر دەوڵەتێك "ئازادەیەکی زۆر بەربەستێکی ڕێگربوو". هەروەها گفتوگۆی فیکریو سیاسی لە سەردەمی ڕێنسانسەوە، لەنێوان بزووتنەوەی لیبراڵی عەلمانیو بزووتنەوەی ڕیفۆرمیستی ئیسلامیدا ڕوویداوە. یەکەمیان دەربڕی بەرژەوەندییەکانی چینی ناوەڕاستی شارەکان بوو، لە پێش هەموویانەوە ڕۆشنبیرانو پیشەکارە ئازادەکانو بزووتنەوەی ناسیۆنالیزمی عەرەب. ڕیفۆرمیزمیش دەربڕەی نەبوونی ناکۆکی بوو لەنێوان لیبرالیزم یان ناسیۆنالیزمو ئیسلامداو ڕویکردە ژیانەوەی کەلەپووری ئیسلامی، بە جۆرێك کە ئایین بنچینەی یەکگرتن بێ. پاش دووەمین جەنگی جیهانی بزووتنەوەی ناسیۆنالیزمی عەرەبو حزبی بەعسو بزووتنەوەی ناسری دەربڕی خواستە ناسیۆنالیستیەکان بوونو هەوڵیاندا ململانێ حیزبەکان لەناوبەرنو کۆششبکەن بۆ شێوەیەك لە شێوەکانی سۆسیالیزم. نووسەر پێیوایە

بزووتنەوەی ئوسوڵی ئیسلامی، کە ئەو کاتە خۆی لە ئیخوان مسلمیندا دەبینیەوە مەنگبوو. سەرهەڵدانی بزووتنەوەی ئوسوڵی لە ڕوانگەی نووسەرەوە بەری شکستەخواردنی بزووتنەوە ناسیۆنالیستیەکانو سەرهەڵدانی ڕژێمی هاوشێوەی سەڵتەنەتە کۆنەکان بوو.. ئەگەرچی لەڕاستیدا زۆر بە ڕژێمە سۆسیالیستەکان دەچن. چەقبەستنی دەسەڵاتی سیاسی بوە هۆی سەرهەڵدانی زیاتر زۆرداری، بەڵام نووسەر بێ وردبوونەوەو بەڵگە سورە لەسەر ئەوەی بزووتنەوە ئیسلامیەکان بەرەنجامی ڕۆشنبیریی قەبیلەیی باوکسالاریو پەیوەندیی پاشکۆیەتییە، کە کۆلۆنیالیزمی خۆرئاواییو ئیمپریالیزم بەرهەمیانهێناوە. واتە دەیەوێ بەهەمان شێوە مامەڵە لەگەڵ ڕژێمو بزووتنەوەی ئیسلامیەکاندا بکات.

نووسەر لەبەشی شەشەمدا پێیوایە هەموو شێوەکانی نوێکردنەوەی لەنێو پەیوەندیی ملکەچیو پاشکۆیەتیو چوارچێوەی جڵەوکێشی ڕاستەوخۆی ئەوروپیدا بوەو جیاوازیدەکات لەنێوان وڵاتە کۆلۆنیالیکراوەکان (لیبیا، جەزائیرو فەلەستین) و وڵاتە پاشکۆکاندا، واتە وڵاتە عەرەبیەکانی دیکە (جگە لە نجد، حیجاز و یەمەنی باکوور). چونکە لە دەوڵەتەکانی ژێر فەرمانڕەوایەتی ڕاستەوخۆی کۆلۆنیالیزمدا بنەما کۆمەڵایەتیەکان وردوخاشکراونو لە ڕەگەوە دەرکێشراون. لێرەشدا کۆلۆنیالیزم سەرکردەی ناوچەیی نیشتمانی دژبە خۆی بەرهەمهێناوەو سەرکردەی موحافەزەکاریشی هێناوەتەئاراوە کە ئامادەن لەگەڵ دەسەڵاتی کۆلۆنیالیستیدا مامەڵەبکەن. شێوازی جڵەوکێشی لە وڵاتە پاشکۆکاندا تۆزێك جیاوازبوو، ئەگەرچی ئابووری بە تەواوەتی خرابووە ژێر ڕکێفی بەرژەوەندییەکانی وڵاتە کۆلۆنیالیستیەکانەوە. ئەوەی ئەمەی ئاسانکردبوو، سەرکردە قەبیلەییو ئایینیەکان بوون، بە لەبیرکردنی ڕۆڵی سەنوسیەتو مهدیەتو بزووتنەوە "ئایینی"یەکانی دیکە. لێرەدا د.شەرابی جەغد لەسەر گرنگیی ڕۆڵی کۆلۆنیالیزمو ئیمپریالیزم دەکاتەوە لەبواری کۆمەڵایەتیو ڕۆشنبیریو گوێزانەوەی سیستەمی خۆرئاواییدا بەهۆی دەستەبژێری ناوچەییەوە کە ڕەنگوڕووی نوێکاری گرتبوو. ئەمە جگە لەوەی نەوە عەلمانییە ڕۆشنبیرەکەی دەرەوە لە ڕاستیدا شێوازێکی نیمچەنوێی بەرهەمهێنابوو. بەو جۆرە پێدەچێ سیستەمی باوکسالاری نوێ، بە پێچەوانەی هەوڵدانەکەی نووسەرەوە، هیچ پەیوەندییەکی بە سیستەمی باوکسالاری تەقلیدیبووەوە نەبێ. نووسەر وێڕای دانانی بەوەدا کە بزووتنەوە ئیسلامیەکان هەوڵدانن بۆ بەخشینی ناوەڕۆکێکی ئیسلامی ڕاست بە مانای مرۆڤو کۆمەڵگە"، کەچی هێشتا پێیوایە "شێوەیەکی بنەڕەتیو ئوسوڵی پەرچەکردارێکە بەرامبەر بە کۆمەڵگەی باوکسالار" و بەرهەمی باڵادەستیی خۆرئاواو پڕۆسەی نوێکردنەوەیە.

کۆمەڵگەی باوکسالار لە سێ چینی جیاواز پێکدێت: جەماوەری هەژار، وردەبورژواو بۆرژوای فەرمانڕەوا کە سیستەمی باوکسالاری نوێی وەك بەرهەمێکی سەردەمی ئیمپریالیزم دامەزراند. کەچی ئەو هەر سوورە لەسەر ناکۆکیەکەی، بەوەی دەڵێ کۆمەڵگەی باوکسالاری نوێ تەنیا شێوەیەکی نوێی سەڵتەنەتە، وەك ئەوەی سەدەکانی ناوەڕاست. بەو جۆرە، وێڕای ئەوەی بکەری بنچینەیی خۆئاوایە، هەمیشە سەرچاوەی سەرکوتکردن و زۆربۆهێنان بەلای ئەوەوە کەلەپووری ئیسلامە.

سیستەمی باوکسالار، کاتێك دەچێتە ناو کۆمەڵگەی باوکسالارەوە، هەڵدەستێ بە پوچکردنەوەی بەها پۆزتیڤەکانی کۆمەڵگەی

تەقلیدیو داماڵینی پەیوەندییە کۆمەڵایەتیەکان لە رەسەنایەتی خۆیان، بەڵام سیستەمی سەڵتەنەتی نوێ، وەك نووسەر دەڵێ: وێڕای هەموو شتێك بەردەوامبوو، تەنانەت لە کاتی تێکشکانە سەربازییەکانیشدا.

دکتۆر شەرابی هاوڕایە لەگەڵ د.باسم مسلمدا، کە پێش ساڵی *1800* کۆمەڵگەیەکی عەرەبی لە گۆڕێ نەبوەو میللەتی عەرەب بەرەنجامی ئەو رێنسانسەیە کە لە ژێر کاریگەریی ئەوروپا لە سەدەی نۆزدەدا روویدا. هەروەها شەرابی پێیوایە رێنسانس جۆرێکی گەشەکردنە لە ئەنجامی کارلێکردن روویداوە، بەو پێیەو لەم کۆشەنیگایەوە دنیای نوێ دەستکردی ئەوروپایەو کۆمەڵگەیەکی شێواویو لێکدابڕاو پێکدێنێ. ئەمەش سەبارەت بە دامەزراوە سیاسی، ئابووریو کۆمەلایەتیەکان راستن کە هاتونەتەئاراوە، بەڵام نەتەوەی عەرەب لە روی هەستکردن بە ئینتیماو پەیوەندیی بە مێژوو و هەڵکردنی ئالای ئیسلامو دامەزراندنی خیلافەی راشدینو ئەمەویو عەباسیەوە، هەمیشە شانازی بە بەرپرسیارێتی خۆی بەرامبەر میللەتە ئیسلامەکان کردوە، بەڵام واتەی ناسیۆنالیزمی دابڕاو لە ئایین بەوجۆرە سەریهەڵداوە کە نووسەر باسیدەکات.

تیرۆریش داهێنانێکی ئەوروپییەو بەهۆی بڕوای باڵادەستی رۆشنبیریی و رەگەزی ئەورووپاوە دژی میللەتە کۆلۆنیکراوەکان بەکارهێنراوە. بۆ ئەمەش سەرمایەداریو کۆلۆنیالیزم بەهانەیان لە هەندێ تیۆری زانستیو فەلسەفی ئەورووپییەوە بەدەستهێناوە. نووسەر پێیوایە یەکێك لە ئەنجامەکانی ئەم تیرۆرە، هەستکردنە بە کەموکوڕیو دەستەوەستاوی بەرامبەر بە ئەورووپییەکان. وێڕای هەوڵدان بۆ بەرەنگاربوونەوەی کۆلۆنیالیزم، بەڵام کۆمەڵگەی باوکسالار نەیتوانیوە ئاستی بڕوای رۆحی رەتکات، وەك نموونەکانی رێکخستنی کۆمەڵایەتی لە بزووتنەوەکانی عبدالقادر و المهدیو عومەر المختاردا. ئەمەش بەلای نووسەرەوە بوە هۆی چەسپاندنی سیستەمی باوکسالار. هەموو ئەمانە وا لە د. شەرابی دەکەن پەیوەندییەکی دیالەکتیکی لەنێوان بزووتنەوە ئیسلامیە ئوسولیەکانو کۆلۆنیالیزمدا دروستبکات. ئەمەش وادەکات ئوسولیەتی ئیسلامی، وەك دیاردەیەك، بە تەواوبوونی تەنگوچەڵەمەکان کۆتاییدێتو هاوسەنگیی کۆمەڵایەتی دەگەرێتەوە. چونکە بزووتنەوەی ئیسلامی کەوتە ژێر کاریگەریی ئەزموونی نوێکردنەوەوە، نەك تەنیا لەسەر ئاستی تەکنیکی، بەڵکو لەسەر ئاستی رێکخستنو کاری سیاسیش. تەنیا جیاوازییەك لەنێوان ئەوانو ریفۆرمیستە ناسیۆنالیستو چەپڕەوەکاندا مەسەلەی سیاسەتە نەك بڕوا. کەچی بزووتنەوەی رفۆرمیستی ئیسلامی خۆی خستە نێوان ئیسلامی ئوسولیو بزووتنەوە ناسیۆنالیستەکانەوە، بەڵام سەرکەوتونەبوو، چونکە هەوڵیدا سازش لە مەسەلە سەرەکیەکاندا بکات. نووسەر لە هەموو ئەوانەوە دەگاتە ئەوەی ئیمپریالیزم بەشداریکردوە لە پێکهێنانی هوشیاریو پراکتیكو رێکخستنی ژیانی سیاسیو پارچەپارچەکردنی دنیای عەرەبو پشتگیرکردنو نوێکردنەوەی دەسەڵاتی باوکسالار و بەرێگرتن لە سەرهەڵدانی چینێکی کرێکار گەشەکردنی سەرمایەداری دواخست.

پێدەچێ نووسەر هیچ هێزێك لە ئیسلامدا نەبینێ، جگە لە هەڵوێستی بەرامبەر بە سازش نەکردن. لەبەر ئەم هۆیە ئوسولیەت توانی چەندین قۆناغ ببڕێ، کەچی ریفۆرمیزمی ئیسلامی شکستەیخوارد، لەبەرئەوەی لە رووی فیکریو رەفتارەوە سازشیکرد. راست نییە بڵێین ناکۆکی

نێوان چەپو بزووتنەوەی ئیسلامی لە بڕوادایەو ناکۆکیەکە بچووکبکەینەوە بۆ مەسەلەیەکی سیاسی. چونکە ناکۆکیەکەی نێوانیان لەسەر بڕواو سیاسەتیشە، بەلای کەمەوە لە ڕوانگەی ئیسلامیەکانو مارکسیەکانەوە. وێڕای ئەوە، نووسەر پێمان ناڵێ چۆن توانرا وەهابیەکان لەبەر هۆکاری ناوەکی ئیسلامی نەك پەرچەکردار بۆ کۆلۆنیالیزمی خۆرئاوا دامەزرێت؟ سەرەڕای کاریگەریی کۆلۆنیالیزمو ئیمپریالیزم لە پێکهێنانی هوشیاریو پراکتیكو ڕێکخستندا، چۆن دەتوانین جیاوازیی پرنسیپەکانی چەپو بزووتنەوەی ئیسلامی لێکدەینەوە کە لە هەمان مێژوو و ژینگەدا سەریانهەڵداوە. بێگومان سەرکەوتنی بزووتنەوەی ئیسلامی ناکرێ تەنیا بگەڕێنرێتەوە بۆ پەرچەکردا بەرامبەر دۆخێکی دیاریکراو، چونکە بڕوا یان ئایدیۆلۆژیاکەی ئاخاوتن لەگەڵ هەستە قووڵو شاراوەکانی میللەتە ئیسلامیەکاندا دەکات.

لەبەشی حەوتەمدا نووسەر باسی وتاری باوکسالاری نوێ دەکات. مەعریفە لە ڕێگەی وتارێکەوە دەردەبڕێ کە بە زمانی عەرەبی دەنووسرێو گرنگترین سیماکانی ئیزدواجیەتە لەسەر ئاستی نووسینو وتارێژیو ژیانی کۆمەلایەتی. زمانی ڕەوان ڕۆڵێکی کۆمەلایەتی دەبینێ لە دیاریکردنی ئاقارو هەڵوێستە زەینیەکانو شێوازی فێرکردنو پەروەردەکردندا، چونکە بەهۆی چوارچێوە ئاینیە ڕەقهەلاتوەکەیو دەستهەڵگرتنی زمانی ڕەوان لەبیر لەخۆکردنەوە سروشتێکی ئایدیۆلۆژی هەیە. وێڕای توانای زمانی عەرەبی بۆ خستنەڕووی زاراوەکانی نوێکاری، بەلام واتاکانی بە پێویست هێما بۆ زیندوێتی نوێکاری ناکەن. لەبەرئەوەی ڕۆشنبیریی تەقلیدی هەرگیز هانی خوێندنەوەی قورئان یان خوێندنەوەی بەگشتی نەداوە. بۆیە پێدەچێ شێوازی گوتار دیالۆگخوازنەبێ، چونکە لەسەر بنچینەی ڕاستیەکی ڕەها دامەزراوە کە (وحی)یە. دەقەکانی فەرمانێکی ئایدیۆلۆژی دەسەلاتخوازانەیان هەیە، ئەمەش وادەکات فیکر لە وتاری باوکسالاری نوێدا زۆر دووربێت لە ئاستی ڕەخنەگرانە. نووسەر بۆ ئەمە پەنادەباتە بەر شکستەخواردنی چوونە ناو ناخی دەقی ڕۆشنبیریی خۆرئاوایی، وێڕای بەریەککەوتن لەگەڵ زانستە خۆرئاواییەکانو ناردنی خەڵکی بۆ خوێندن لە خۆرئاوا. کەواتە بەلای د. شەرابییەوە زمان بەڵگەی تێکچونێکی بنەماییانەیە لەناخی هوشیاریی ڕێنسانسیانەدا. ئەمەش بۆتە هۆی خوێندنەوەیەکی داخراو بۆ مێژوو و کۆمەڵگە، بەلام د.شەرابی باسکردنی ئەو زانستو فەلسەفانە لەیاددەکات کە بە زمانی ڕەوانی عەرەبی نووسراون، تەنانەت زانا فەرهەنگیەکانی زمانی عەرەبیان وەك زمانی فەلسەفەو زانستو ئەدەب بەکاربردوە. هەروەها زمان لە ململانێ فیکرییەکانی بواری فەلسەفەو زانستی یەکتاپەرستیو تەسەوفدا خرایەگەڕ. لەواقیعدا کەمتەرخەمی زمانی عەرەبی گرێدراوی کەمتەرخەمی کۆمەڵگە بوو، نەك بەپێچەوانەوە. چونکە لەو کاتەدا کە نەتەوەی ئیسلام لە دنیادا بالادەستبوو، زمانی ئەو زمانی زانستو نوێ بوو. بۆیە ئوسوڵیەتی ئیسلامی پێیوایە گەڕانەوە بۆ زمانی دامەزراو لەسەر قورئانی پیرۆزو بانگەوازی بۆ خوێندنەوەی دەقو تێگەیشتنی لە ڕوانگەیەکی زمانەوانیەوە، ڕزگارکردنی نەتەوەیە لە پاشکەوتوویيو زۆرداریی دەستەبژێر. لێرەشدا ڕاست نییە بوترێ زمانی ڕەوان لە ناخیدا "هەمان ئەو کۆسپە زەینیانە بەرهەمدێنێ یاخود دووبارەدەکاتەوە کە لەبەردەمی قەلاچۆکردنی نەخوێندەواریدان". چونکە هێزی زمان ڕێگرە

لەبەردەمی بەدەستهێنانەوەی هەر جۆرێك لە مۆدێلە ئەڵتەرناتیڤەکان. ئەگەر زمانی عەرەبی تەریببێت بە نەخوێندەواری، ئەی چۆن ئیسلام توانی شارستانیەتێکی پێشکەوتوو لە ساتێك لە ساتەکاندا پێشکەشبکات؟ ئایا نەهێشتنی نەخوێندەواری تەنیا بە هاوردی مۆدێلە خۆرئاواییەکە دەبێ؟ ئایا هاوردنی زمانێکی دیکە (مۆدێل) یان شارستانیەتێکی دیکە دژی گەشەکردنی مێژوویی و رۆشنبیریی نەتەوەکان نییە؟ ئایا گەشەکردنی کۆمەڵگە مانای زمان و شارستانیەتە یان پێچەوانەکەی؟ خۆ ئەگەر زمانی رەوان لە شارەکانی کۆمەڵگەی باوکسالاری نوێدا دابەشبێت بۆ دوو زمان و دوو وتار: زمانی ئوسوڵی و زمانی پێشکەوتخوازە عەلمانیەکان، ئەمە مانای ئەوەنییە کە ئەوانە "ناکۆك نین"، وەك نووسەر دەیەوێ تێمانگەیەنێ. چونکە وتاری تەقلیدی ئیسلام، کە نووسەر دەسەلاتخوازی دەق و دورخستنەوەی هەندێ بواری تیا دەبینێ (وەك مۆدێلە فیکرییە نوێکان)و میتۆدی بیرکردنەوە بەشێك نییە لە دەقەکە، بەڵکو لێکدانەوەی دەقەو نابێ لە هەمان روانگەوە مامەڵە لەگەڵ دەق و لێکدانەوەدا بکرێ. لێرەدا نووسەر دەپرسێ: چی روودەدات ئەگەر بێتو قورئان و چەمکەکانی مەعریفەی بکەینە زمانی عەوام، بۆ ئەوەی بە شێوەیەکی راستەوخۆ خەڵك تێیانبگات، وەك ئەوەی لە کتێبی پیرۆز لە سەرەتای سەردەمی نوێی ئەورووپا روویدا؟ ئێمە بە نووسەر دەڵێین چەندین هەوڵدان هەن بۆ خوێندنەوەی دەق، دابڕاو لە گەشەکردن و سیاقی مێژوویی و ناوەرۆکی زەینی مێژوویی (ئوسوڵیەتی ئیسلامی)، بەڵام کێشە راستەقینەکە بە بڕوای ئێمە ئەوەیە تێگەیشتنی دەق و گەشەکردنی دوو هۆ بوون لە دەرەوەی دەق، واتە چوارچێوە کۆمەڵایەتی و سیاسیەکەی دەقی لە بەرژەوەندیی واقیعی باودا سڕکرد. بەڵگەش بۆ شیانی گەشەکردنی زمانەوانی و بنەمای دەق، وتاری عەلمانیە کە نووسەر بە زمانی بۆرژواو گروپەکانی وردەبۆرژوای داناوە. راستیش نییە کە ئەم وتارە هیچ گۆڕانێکی گرنگ یان بنەمایی پێك ناهێنێ و لەدووتوێی خۆیدا هیچ مانایەك و گەشەکردنێك لە خۆناگرێ کە کۆمەڵگەی تەقلیدی جێهێشت و کەلێنی خستە نێو شیانی ئەگەری دابڕانێکی مەعریفی، وێڕای ئەوەی توێژی رۆشنبیر لە سەردەمی ئیسلامی کلاسیکیدا پشتی بە بەخشندەیی دەسەڵات بەست و توێژی رۆشنبیری ئیمرۆ کار بۆ خزمەتکردنی دەوڵەت دەکات، بەڵام زۆربەی بنچینە ئایدیۆلۆژی و سیاسی و کۆمەڵایەتیەکان جیاوازن و ناکرێ لەسەر ئاستی فیکری پێکەوە ببەسترێن، تەنیا لەبەر لێکچوونی پەیوەندیی نێوان دوو توێژەکە. چونکە لە وڵاتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا دەوڵەت پارە دەخاتەگەڕ بۆ هەموو ناوەندەکانی توێژینەوە زانستەکان، ئەمەش نەبۆتە هۆی ئەوەی ئەم توێژە رۆشنبیرە هاوشێوەی توێژی رۆشنبیری سەدەکانی ناوەراست بێت. چونکە کۆلۆنیالیزمی خۆرئاوایی دابڕانێکی زمانەوانی و بنەمایی و ئایدیۆلۆژی خستۆتەوە.

نووسەر لە بەشی هەشتەمدا تاوتوێی "بزوتنەوەی رەخنەیی نوێ" دەکات، کە پێکهاتووە لەسێ ئاقار: لایەنی رەخنەگرانە لە زانستە کۆمەڵایەتیە ئەنگلۆسەکسۆنیەکاندا، مارکسیزمی خۆرئاوایی، تیۆری بنەماگەری و ئەودیوبنەماگەری لە فەرەنسا. ئەم بزووتنەوەیە پاش پەککەوتنی ئاقارە ریفۆمیست، عەلمانی، ناسیۆنالیستی و چەپەکان سەریهەڵداوە. لە سیماکانی ئەم بزووتنەوەیە خوێندنەوەیەکی بەرنگارخوازانەیە بۆ دەقی باوکسالاری نوێ و لێکدانەوەی چەمکە

تەقلیدییەکانی و ملکەچکردنیەتی بۆ زمانی ڕەوان و دەربڕینی پرسیارکردنەوەی میتۆدەییە سەبارەت بە فیکری ئایدیۆلۆژی و ئایینی و ئوسوڵی. چونکە چیتر دابونەریت و سروشتەکان ڕاستی یان بەهای کۆتایی نین، بەڵکو گۆڕاون بۆ "کلیل و سمبولەکان بۆ دۆزینەوەی ئەو مانا و ئامانجانەی وتاری باوکسالاری نوێ کۆششیدەکرد بۆ شاردنەوەیان یاخود گۆڕینی مانایان". گرنگترین نوێنەری ئەم ئاقارە لە خۆرئاوای عەرەب عبدالله العروی، محمد ئارگۆن و محمد عابد الجابری و لە ڕۆژهەڵاتی عەرەبیش صادق العظم و الیاس مرقص و حلیم برکان و کمال ابودیب و عبدالکبیر الخطیبییە. نووسەر هەموو ئەمانە بە نامۆ دادەنێ، لەبەر خوێندن و ڕۆشنبیری و شێوازی جیاوازی بیرکردنەوەو ئاخاوتن و نووسین. هەروەها نووسینەکانیان نامۆیە بەواتا پێت بەپێتە مەجازییەکەی قورسن بۆ تێگەیشتن، بەهۆی بنەما لۆژیکی و ڕواڵەتکارییەکەی لە دەربڕیندا بەکارهاتووە. زۆربەی ئەم نووسەرانە لە تاراوگەن. گروپێکی دیکە ڕەخنەگرانی نوێ هەن کە لە وڵاتە عەرەبییەکان دەژین و لە خوێندنگە خۆرئاواییەکاندا خوێندنیان تەواوکردووە، بەڵام گرێدراوی ئەو هەلومەرج و بارودۆخەن کە تیایدا دەژین.

ڕەخنەگرە نوێکان، تەنانەت لەسەر ئاستی ڕەخنە لەخۆو ئەوانی تر گرتنیش، ڕووبەڕووی گرفتی زۆر بوونەتەوە کە ناتوانن چارەسەریان بکەن، چونکە بیرکردنەوەو دەربڕینیان خۆرئاوا بە دوامۆدێلی گەشەکردنی خۆیی و گەردوونی دەزانن. لێرەدا نووسەر دەپرسێ: ئایا هەوڵدانەکانیان بۆ گوێزانەوەی تیۆری سەربەخۆ لە کۆمەڵگەو مێژوو و گەشەکردنی بابەتی بەهۆی چەمکی گوێزانەوە سەرکەوتوەو نەبۆتە هۆی نامۆبوونی خۆیی لە ڕوی زمان و فیکرەوە؟

لە بەشی نۆیەمدا (دواقۆناغ) نووسەر باسی شیانی گۆڕانی کۆمەڵگەی باوکسالاری نوێ بۆ کۆمەڵگەیەکی جەماوەری دەکات و پێیوایە پاش قۆناغی سەربەخۆیی سیاقێکی کۆمەڵایەتی پێگەیشت کە بوە هۆی گۆڕینی کۆمەڵگەی باوکسالاری نوێ بۆ کۆمەڵگەیەکی جەماوەری، ئەمەش وەك بەرنجامێکی زاڵبوونی وردەبۆرژوا، بەڵام دوو چینەکەی تر، واتە بورژوا و چینی کرێکار، نەگۆڕان بۆ چینی کامڵ لە ڕووی پێکهاتەوە. چینی وردەبۆرژوا دووڕەگەو گرێدراوی ڕەچەڵەکە شاری و دێهاتیەکانەو لە ڕووی ئابوورییەوە بەرهەمهێنەر نییە، بەڵام توانی لە پەنجاکاندا بگاتە دەسەڵات (ئەفسەر ئازادیخوازەکان لە میسر بۆ نموونە)و پرۆلیناریا بخاتە نێو سیستەمی کۆمەڵایەتی نوێوەو پشت بە شێوازی ناسەرمایەداری پەرەسەندن ببەستێ، بەو جۆرەش بیرۆکەی نوێکردنەوەی سەرمایەداری ڕەتکردەوە. لێرەشدا نووسەر پێیوایە ژێرکەوتنی ئاقاری شۆڕشگێڕێ دەگەڕێتەوە بۆ پەنابردنە بەر سیاسەتێك دروشمەکەی بریتیە لە: "با سەرەتا بنەما کۆمەڵایەتیەکە ڕاستکەینەوە". جا لەبەر ئەوەی ئەم چینە بەرژەوەندیی بازرگانی یان پیشەسازی نەبوو، پێویستی بە پارێزگاریکردن هەبوو و ڕژێمە بیروکراتیە بەرخۆرەکانی لەلایەن بلۆکی سۆسیالیستیەوە دەپارێزان، بەڵام بەلای سەرمایەداریی خۆرئاواییدا ڕادەکێشران. هەروەها هۆکارەکانی ژێرکەوتن بریتیبوون لە: *1/* مەترسی ئەم دەوڵەتانە (بە تایبەتی شۆڕشگێڕییەکان) لە دەستێوەردانی سەربازیی ڕاستەوخۆی خۆرئاوا و ئیسرائیل، ئەمەش بوە هۆی سەرهەڵدانی سوپای گەورە کە باری ئابووری قورسکردن؛ *2/*

دوورکەوتنەوەی میللەت لە بەشداریکردنی سیاسی؛ *3*/ پاشکەوتوویی مارکسیزم؛ *4*/ خراپ بەکارهێنانی نەوت و شێواندنی ئابووریی نیشتمانی عەرەب.

لەم بیرۆکراسیەدا بەرژەوەندییە تاکەکەسیەکان زاڵبوون بەسەر بەرژەوەندییە گشتیەکانداو سیستەمی گوێدێری و ولائی تاکەکەسی بوە هۆی سەرهەڵدانی خۆپەرستی و چەسپاندنی چەمکی چاودێری و ملکەچی، چونکە ولائی کەسێتی نەك توانای دانپیانان یان پاداشتیان مسۆگەردەکرد. شۆڕشگێرەکان و موحافەزەکارەکان و ڕابردووخوازەکانیش چەمکی نەتەوەیان وەك قەبیلەیەك چەسپاندو دەسەڵاتێکی پۆپتیژیان دامەزراند کە ڕێگربوو لەبەردەم کاملبوونی کۆمەڵایەتی ڕاستەقینەداو زۆربەی دانیشتوانیش دەرفەتی ڕاستەقینەی بەشداریکردنیان بۆ نەڕەخسا. لە دواقۆناغی ڕەوتی سۆسیالیستیدا وڵاتە عەرەبیەکان بەهۆی ڕووکردنە دەرەوەو پشتبەستن بە هاوردنی خواردن و لاوازیی پیشەسازی و دابەزینی ئاستی بەکاربردن لەلای نیوەی هەژاری دانیشتوان و زیادەهەڵئاوسان لای چینە دەوڵەمەندەکان و زاڵبوونی کۆمپانیا فرەڕەگەزەکان، وڵاتە عەرەبیەکان تووشی لێکترازانی ئابووری بوون، ئەمەش بوە هۆی ئیفلیجبوونی ئابووریی نیشتمانی عەرەب و سامانی نەوتیش بوە هۆی شێواندنی پڕۆسەی پەرەسەندن و بەهێزبوونی دەسەڵاتی قەبیلەیی و پشتبەستن بە خۆرئاوا لە ڕوی زانستی و ئابوورییەوە.

توێژی دەسەلاتداریش پشتی بە وردەبۆرژوا (فەرمانبەرە بچووکەکان، بازرگانەکان، مامۆستایان، پێشمەرگەکان و پرۆلیتاریای شار) بەست تا لەکۆتایی شەستەکاندا کەلێنێکی گەورە کەوتە نێوان فەرمانڕەواو میللەتەوەو لەناوچوونی ڕەوایەتی دەسەڵات و هەڵوەشانەوەی پەیوەندییە کۆمەڵایەتیەکان. هەموو ئەمانە بەلای نووسەرەوە بوونە هۆی سەرهەڵدانی بزووتنەوەی ئوسوڵیەتی ئیسلامی و گرێدانەوەی وردەبۆرژوا بە ڕەگوڕیشە ئاینیەکانەوە. لێرەدا نووسەر بنچینەکانی بزووتنەوە ئوسوڵی دەگێڕێتەوە بۆ سەرەتای سەردەمی ڕێنسانس، بەڵام بزووتنەوەی ئیخوان مسلمین یەکەمین بەرنامەی سیاسی هەمەلایەنی لە دەرەوەی ئاقاری باو، لە ماوەی دەسەڵاتی ئەوروپی و سەرەتای سەربەخۆییدا، خستەڕوو. بەڵام بزووتنەوەی ئوسولی لە حەفتاو هەشتەکاندا لە ئایدیۆلۆژیای خۆییدا دەربڕی گۆڕانکارییەکانی بارودۆخی کۆمەڵایەتی بوو. چونکە بزووتنەوەی ئوسوڵی بە واتا ڕاستەکەی بزووتنەوەیەکی ئایینی نییە، بەڵکو دیاردەیەکی وردبۆرژواییانەیە کە ئایدیۆلۆژیایەکی ڕادیکاڵی پێکدێنن. هەروەها نووسەر پێیوایە سەرکەوتنی بزووتنەوەکە دەبێتە هۆی داڕمانی کۆمەڵگەی باوکسالاری نوێ، لە ڕووی سیاسی و کۆمەڵایەتی و ڕۆشنبیرییەوە، بەڵام بزووتنەوەکە هەموو شتێکی‌نوێ ڕەتناکاتەوە، بەڵکو زانست و ئیمانی بەرزکردۆتەوەو دەخوازێ پێکەوەیان بسازێنێ.

ئوسوڵیەت دەرفەتی هەم گوێدێری و هەم شۆڕش دەرەخسێنێ، چونکە دەتوانێ جەماوەر گۆشبکات و مرۆڤێکی گرنگ لە ئاڕاستەکردنی ڕێڕەوی ڕووداوەکاندا دەگێڕێ. وێڕای ڕەتکردنەوەی د.شەرابی بۆ تێڕوانینی ململانێ وەك ململانێیەکی چینایەتی، کەچی لە ڕوانگەی ململانێی چینایەتیەوە بەهانە بۆ بوونی ئەم بزووتنەوەیە دێنێتەوە، چونکە بزووتنەوەکە وەك بزووتنەوەیەکی "کۆمەڵایەتی دەربڕی بابەتی ململانێی چینایەتیە". ئەم بزووتنەوەیە تەکانێکی ئایدیۆلۆژی پێدرا، کاتێك ژمارەیەك لە بیریارە ناسیۆنالیست و مارکسیەکان

ڕویان تێکردو بوونە هۆی ڕیشەییکردنی بزووتنەوەکە. سەبارەت بە جەماوەریش، ئەوا ئەم بزووتنەوەیە بوە تاکە سەرچاوەیەك بۆ ئەوەی هەست بە بوونی ناسنامەو هێزبکەین، چونکە چەمکی چین یان نەتەوە تەسکەدەکاتەوەو دەیانگێڕێتەوە بۆ چەمکی گروپی ئایینی کە لەسەر بنەمای برایەتی ئیمان دامەزراوەو تێڕوانینێکی هەمەلایەنی شێلگیریان دەداتێو هیچ بوارێك بۆ پرسیارکردنەوە یان گومان ناهێڵێتەوەو بەڵێنی چارەسەرکردنی هەموو کێشەکانیان دەداتێ.

ئوسوڵیەت ئامانجیەتی ڕووبەڕووی دنیاو کێشەکانی بێتەوەو تێڕوانینی بۆ دنیا بگۆڕێ (واتە دابڕینی مەعریفی!). چونکە ئەو دوو کۆمەڵگەیەی سید قوتب دیاریاندەکات، کۆمەڵگەی ئیسلامی پێڕەوکاری ویستی خوداو کۆمەڵگەی جاهیلی دابینکەری ئامانجو خەونە مرۆییەکان گرێدراوی ویستن. نووسەر پێیوایە سەید قوتبو تیۆریستە ئوسوڵیەکانی دیکە هیچ چارەسەریان بۆ کێشەی لێکدانەوە نییە. چونکە ئوسوڵیەکان بەدەست کێشەی مەعریفەوە ناناڵێنن لەبەر ئەوەی لە هەموو مانایەك بەتاڵکراوەتەوەو پرسیاری "ئێوە زیاتردەزانن، یاخود؟" بۆتە وەڵامێکی ئارامبەخشو ڕەتکەرەوەی شیانی شیکردنەوەی ڕەخنەگرانە. هەروەها هەستکردن بە پاشکۆیەتی لە هەمان "گۆشەنیگای غەیبی لوتبەرزانەوە" چارەسەردەکرێ. بەو جۆرە لە دەستدانی زەویو شکستەخواردنە سەربازییەکان دەبنە هەرەسهێنانی لاوەکی، بەمەش هەڵدەستێ بەسەرلەنوێ نووسینەوەی مێژوو و دیاریکردنی ڕابردوو و نەخشەکێشانی داهاتوو. لێرەشدا مۆدێلی خۆرئاوایی سەرچاوەی ڕێنماییکردنی موسڵمانەکان نابێ. نووسەر دەگاتە ئەو سەرەنجامەی جیهانبینی ئوسولی بەهێزترە "شۆڕشگێڕە (شۆڕشگێڕی چەواشەیە)" چونکە دەتوانێ گۆڕان لە هۆشیاریدا بکات. بەڵام سەرکەوتنی بزووتنەوەکە، ئەوا بەڕای نووسەر سەرکەوتنی کۆنە (واتە سیستەمی باوکسالاری).

چی بکرێت؟ ناونیشانی بەشی دەیەمە کە دوو شێواز شۆڕش دیاریدەکات: ئوسولیو کۆمۆنیستی. بەڵام ئەوەی دووەم مەحاڵە، چونکە چینی کرێکار پێویستی بە ئایدیۆلۆژیاو ڕێکخستن هەیە.

نووسەر پێیوایە گرنگە سەرلەنوێ خوێندنەوە بۆ دیموکراسی سیاسیو یەکگرتنو دادپەروەری کۆمەڵایەتی بکرێت، بۆ سەرلەنوێ داڕشتنەوەی بە پێی واقیع، چونکە بەبێ هێزێکی ناوەکی ناکرێ کۆمەڵگەی عەرەب بپارێزرێ. ئەمەش دەبێ بە شێوازی یاساییو ئامڕازێك بکرێ کە میللەت پشتگیریدەکات، لەبەرئەوەی واقیع بۆتە قەڵای پۆڵایین کە ناکرێ تێکبدرێ. بۆیە پێویستە پەنا بە ئامڕازی ئاشتخوازانە ببرێ، وەك مانگرتنی شارەکانو ڕووبەڕووبونەوەی ڕاستەوخۆ لەگەڵ دەسەڵات. واتە ئەو فەلسەفەیەی نووسەر داوای پێڕەویکردنی دەکات، مۆدێلی دیموکراسی ڕادیکاڵیە لە ڕێگەی ڕەخنەو تێکۆشانەوە: ڕەخنەگرتن لە شێوازو هەڵویستەکانو تێکۆشان بە شێوازی ئاشتخوازانە نەك توندوتیژانە. ئامانجە گیشتەکانیش بریتیدەبن لە مافی مرۆڤو مافی سیاسیەکانی لە ڕاگەیاندنی نەتەوە یەکگرتوەکاندا هەن سەبارەت بە مافیمرۆڤ. ئامانجە تایبەتیەکانیش بریتیدەبن لە دامەزراندنی دامەزراوی نیشتمانیو نەتەوەیی هاوبەش بۆ کاری سیاسیو کۆمەلایەتی. لێرەشدا بزووتنەوەی ژنان پێشڕەوی بزووتنەوەکانە، ئەگەر تاکە بزووتنەوە

نەبێ، كە دەتوانێ بروسكەی گۆڕانكاری بۆ تیكدانی كۆمەلگەی باوكسالاری داگیرسینێ.

ئەو ئامانجەی ئەم كتیبە هەولیان بۆ دەدات، نویكاری، دیموكراسی عەلمانی، سۆسیالیزمی مرۆڤانەی دادپەروەرانەیە كە ڕەوایەتی ئایدیۆلۆژیو میژووییان هەیە، بەڵام لە كەلەپووری نەتەوەوە هەلناقولین. دەشێ چەمكی ڕەسەنتر هەبن، وەك زانستو شوراو قبولكردنی ئەوانی دیكەو دادپەروەریی كۆمەڵایەتی كە دەشێ لەناو كەلەپوردا بەهانەیان بۆ بهینریتەوەو لەلایەن جەماوەرەوە قبولكراوە. ئەو ڕەخنەیەی نووسەر ئاراستەی ڕەخنەگرە ریشەییەكانی دەكات بەرۆكی خودی خۆیشی دەگریتەوە. چونكە ئەو تەنیا لە دەرەوەی كەلەپوورو گەشەكردنی میژوویی نەتەوەوە نانووسێ، بەلكو بۆ كەلەپوریك دەنووسێ كە نەتەوەی عەرەب نیەو هەولدەدات تیۆر و چەمكگەلیك بەكاربهینێ كە پەیوەندیان بە سیاقی گەشەكردنی میژوویی نەتەوەكەمانەوە نییە. بۆ نموونە، بۆ دەبێ هوشیارییەكی چینایەتی بۆرژواییمان بەسەردا بسەپێ لەپیناو بەهانەهینانەوە بۆ سەرهەلدانی ئوسولیەتی ئیسلامی، لەكاتیكدا سەرنەكەوتنی چەپ دەگیریتەوە بۆ نەبوونی هوشیاریی چینایەتی؟ هەروەها بۆچی دەبێ كۆمەلگەیەكی باوكسالار بسەپێو لۆمەیبكەین بۆ دواكەوتنی نەتەوە، كەچی پیمانوایە هۆی بنچینەیی پاشكۆیەتی نەتەوە، كۆلۆنیالیزمی سیاسیو ڕۆشنبیریو ئابووریو سەرهەلدانی دەستەبژیری فەرمانرەوایە، كە لە كەلەپوورو گەشەكردنی نەتەوە دابراوەو چەمكو سیستەمی وەهای سەپاندوە كە لەلایەن نەتەوەوە قبولكراونییە و ریگر بوە لەبەردەم گەشەكردنی سروشتی ئابووری سەرمایەداریدا؟!

لەگەڵ نووسەردا هەستدەكەین كۆمەڵگەی دامەزراوەكان (خێزان، قوتابخانە، دەوڵەت...) بەهانە بۆ دەسەڵاتداریتیو چەسپاندنەوە دێننەوە، بەڵام ئازادبوون مەرجگەلی بابەتی هەیە كە دەبێ لە ئارادابن. واتە ناشێ بۆ نموونە ژن لە خۆرهەلات بە هەمان شێوازی خۆرئاوا بێ، چونكە سیاقەكە جیاوازە. هەروەها ڕەتكردنەوەی ئیسلام، چونكە توانای مەعریفە لەناودەبات، ڕەتكراوەیە. لەبەرئەوەی لە سەرەتای ئیسلامەوە میللەتەكانی نەتەوەكەمان هەوڵیانداوە ڕووخسارە خۆییەكانو پێكهاتە قەبیلەییو عەشائیرەكان ڕەتكەن، بەڵام دەسەڵاتدارەكان (زۆربەی خەلیفەو سوڵتانەكان) ناكۆكیە جیابوونەوەخوازیو پۆپۆلیستەكانیان بەكارهێناوە بۆ جڵەوكردنی تەواوەتیو بەهانەهێنانەوە بۆ چەوساندنەوەو پاشكەوتن (وەك ئەوەیە ئیمڕۆ ڕوودەدات)، بەڵام سەرچاوەی ئەمە خود ئیسلامی نییە لە ڕوە ڕۆشنبیریو ئایدیۆلۆژیو فەلسەفیو سیاسیەكەیەوە، چونكە لە ڕووی پرنسیپەوە ئیسلام داخرانی عەقڵو فیكری سەپاندوە. دابڕانی مەعریفی هۆكارەكەی سیاسیەو ئەویش لاوازیو ترسی دەسەڵاتە لە مەعریفە. هەروەها جێبەجێنەكردنی چەمكێكی دیاریكراو مانای ڕەتكردنەوەی چەمكی وەك شورا نییە. ئاشكرایە دیموكراسی لە خۆرئاوا وەك ئیمڕۆ نەبوەو لە سەرەتادا لەناو توێژێكدابوەو هەموو میللەتی نەگرتۆتەوە، هەروەها جۆن لۆك كاتێك باسی ئازادیو دەنگدان دەكات، مەبەستی ژنو بێ موڵكەكان نەبوو. هەموو ئەمانە نەبوونە هۆی ئەوەی چەمكی دیموكراسیو لیبڕالیزم ڕەتكرێتەوە، بەڵكو گەشەكردنیكۆمەڵایەتی بوو. هۆی گۆڕینی ناوەڕۆكی ئەو چەمكانە. شیكردنەوەكەی د.شەرابی بۆ نەتەوە، پەراوێزكارانەیە بۆ ڕێڕەوی نەتەوەو لە

پنچینەکانی شارستانیەتی عەرەبی ئیسلامیدا ڕەگی نییە. وێڕای ئەوە کێشەکەی ئامانجێکە بۆ دۆزینەوەی شێوازێکی شیکردنەوەو ڕەخنە، بەلام ژێرکەوتوبوو کاتێك هەوڵیدا چەمکگەلێك بسەپێنێ کە واتاکانیان لە دەرەوە هوشیاریی نەتەوەن. کێشەی ڕاستەقینەی ئەم کتێبە لە پێکەوەبەستنی چەمکگەلێکی ئینتیقائیدایە کە خراونەتەگەڕ بۆ شیکردنەوەو ڕەخنەگرتن لە شارستانیەتێك کە تیایدا دەژیو لەگەل شارستانیەتێکدا کە بڕوای بە داهاتووی نەماوە. بەو جۆرە گریمانەو هەڵوێستی جۆربەجۆری بەکارهێناوەو وەك بەڵگەنەویست مامەڵەی لەگەڵ کردون، ئەمەش لەو بڕوایەوە کە وتاری ڕەخنەگرانە دەتوانێ ببێتە ئامرازی گۆڕانکاری.

### سەرچاوە

گۆڤاری "الاجتهاد"، ژمارە 16/15 بەهاری 1992، "دار الاجتهاد للآبحاث و الترجمة و النشر"، بيروت.

# ئەفلاتون
# گفتوگۆ لەگەڵ "مایڵز برنییت" دا

برایان ماگی
لە فارسییەوە: محەمەد کەریم

### پێشەکی

**ماگی:** هەموو هەوڵێك بۆ گێڕانەوەی حیکایەتی فەلسەفەی خۆرئاوا دەبێ لە یۆنانیە کۆنەکانەوە دەست پێبکات کە نەك تەنها فەیلەسوفە بەراییەکان، بەڵکو هەندێ لە گەورەترین فەیلەسوفانی خۆرئاواش لە ناو ئەوانەوە سەریان هەڵدا. ئەو کەسەی کە ناوی لە هەموویان دیارترە سوکراتە کە لە ساڵی *399* پ.ز کۆچی دوایی کرد. بەڵام بەر لەویش کۆمەڵێ فەیلەسوفی دیار لە یۆنان هەبوون، وەکو فیساگۆرس و هیراکلیتۆس، کە زۆر بەناوبانگن، هەروەها ژمارەیەکی تر کە بە هیچ جۆرێ لەوان کەمتر نین. پێشڕەوی هەموویان تالیس بوو کە لە سەدەی شەشەمی پ.ز دا ناوبانگی پەیدا کرد.

فەیلەسوفانی بەر لە سوکرات هەموویان لەو سەرقاڵیەدا بەشدار بوون کە دەیانەویست چەند بنەمایەکی سەرەتایی بۆ ڕاڤەکردنی سروشت بە گشتی بدۆزنەوە. بە زمانی ئەمڕۆ، بەشێوەیەکی یەکسان لە "جیهانناسی" یان "زانست" لە لایەك و لە لایەکی ترەوە لە "فەلسەفە" یان دەڕوانی. سوکرات بە ئیرادەو داناییەوە لێیان ڕاپەڕی، چونکە باوەڕی وابوو ئەوەی کە ئێمە لە هەرشتێ زیاتر پێویستمان بە زانینی هەیە ئەوەیە کە خۆمان دەبێ چۆن بژین نەك ئەوەی سروشت چۆن کاردەکات؛ بەم پێیە، پێویستە لە پێش هەموو شتێکداو لە سەرو هەموو شتێکەوە بایەخ بە مەسەلە ئەخلاقییەکان بدەین. هەتا ئەو شوێنەی کە ئێمە دەیزانین، سوکرات هەرگیز هیچی نەنووسی و هەموو زانیارییەکانی خۆی بە دەمی ڕادەگەیاند. نووسینی هیچ یەکێ لە فەیلەسوفەکانی پێش سوکرات ڕاستەوخۆ بە ئێمە نەگەیشتووە. زانیارییەکانی ئێمە سەبارەت بە هەموو ئەو فەیلەسوفانەی کە تا ئێستا ناوم هێناون، لە سنووری سەرچاوەی دووەم و لە

ڕێگەی بەرهەمی کەسانی ترەوەیە، هەرچەندە دەبێ تەئکید لەوە بکەمەوە کە لە ناو ئەم سەرچاوانەدا بەشێك پوختەیەکی تاڕادەیەك درێژ و هەندێ قسەش ڕاستەوخۆ لە زمانی ئەوانەوە بەدی دەکرێ. ئەفلاتون یەکەم کەسە کە ئەمڕۆ نووسینەکانیمان لەبەردەستدایە. ئەفلاتون قوتابی سوکرات بوو، لە ڕاستیدا زانیارییەکانی ئێمە دەربارەی سوکرات زیاتر لە نووسینەکانی ئەفلاتونەوە وەرگیراون. بەبێ هیچ دودڵییەك ئەفلاتون یەکێکە لە فەیلەسوفە مەزنەکانی هەموو سەردەم و چاخەکان و، بە باوەڕی هەندێك گەورەترین فەیلەسوف بووە. لەم ڕووەوە، ئەگەر بمانەوێ بە دڵی خۆمان سەرەتایەك بۆ ئەم چیرۆکە زنجیرەییە هەڵبژێرین کە هەمیشە بەردەوام بووە، ساڵی *399*پ.ز – واتە ساڵی مردنی سوکرات و دەستپێکردنی نووسینەکانی ئەفلاتون – خاڵێکی باشە. کەواتە مۆڵەتمان بدەن با لەوێوە دەستپێبکەین.

کاتێ سوکرات مرد، تەمەنی ئەفلاتون سی و یەك ساڵ بوو و هەشتاو یەك ساڵ ژیا. لەو نیو سەدەیەدا، دەستی کرد بە دامەزراندنی قوتابخانە بەناوبانگەکەی لە ئەسینا کە بە ئەکادیمیا ناو دەبرێ و یەکەم نموونەی شتێکە کە ئێمە ئەمڕۆ پێیدەڵێین زانکۆ، هەروەها لەو ماوەیەدا بەرهەمەکانی خۆی نووسی. تا ڕادەیەك ئەم بەرهەمانە هەموویان بەشێوەی گفتوگۆ یان دیالۆگ نووسراون و بەڵگەی جیاجیا لە زمانی کەسانی جۆراو جۆرەوە دەبیسترێ کە تاڕادەیەك هەمیشە یەکێك لەو کەسانە سوکراتە. زیاتر -بەڵام نەك هەموو- گفتوگۆکان بە ناوی کەسانێکەوەیە کە قسە لەگەڵ سوکراتدا دەکەن و لێرەوە یەکێکیان ناوی فایدونە و ئەوی تریان لاخیس، سێیەم ئۆسۆفرون، چوارەم سیای تەتوس، پێنجەم پارمیندس، شەشەم تیمایوس و بەم جۆرە هەتا کۆتایی. تێکرای هەموو ئەمانە، ئەمڕۆ زیاتر لە بیست دیالۆگ لەبەردەستدایە کە درێژی هەندێکیان بیست لاپەرە و هەندێکیان هەشتا لاپەرە و یەك دوانێکیان دەگاتە *300* لاپەرە. بەناوبانگترینیان کۆماری (ئەفلاتون و خوان)ە و ئێستا بەرهەمەکانی ئەفلاتون بە تەرجومە کراوی و تەجلید کراوی لە بەردەستی خوێنەرانی دنیادایە. کتێبە نایابەکانی ئەفلاتون نەك تەنها لە فەلسەفەدا بەرهەمی گەورەن بەڵکو لە ئەدەبیشدا وەکو شاکار لە قەڵەم دەدرێن. ئەفلاتون هەم بیریار بوو هەم هونەرمەند. نووسینەکانی شێوەی هونەری و بەهای دراماتیکییان هەیە و زۆر لە هەڵسەنگێنەرانی پەخشان باوەڕیان وایە کە هیچ کەسێك هەرگیز بەو نایابی و جوانیە پەخشانی یونانیی نەنووسیووە.

بۆ قسە و باس دەربارەی بەرهەمەکانی لەم بەرنامەیەدا، یەکێك لە پڕ متمانەترین ئەفلاتون ناسانم لە جیهانی ئینگلیزی زماندا داوەت کردووە کە ئەویش پرۆفیسۆر (مایلز برنییت *Myles Burnyeot*) کە مامۆستای فەلسەفەی کۆنە لە زانکۆی کەمبریج.

### کرۆکی باسەکە

*+ماگی: دەزانم تۆ باوەڕت وایە سەرەتای داهێنانی فەلسەفی ئەفلاتون مردنی سوکرات بوو. دەکرێ داوات لێبکەم ڕوونی بکەیتەوە کە چۆن ئەوە ڕوویدا؟*

–برنییت: بەڕای من مردنی سوکرات لە ساڵی *399* پ.ز. بەلای زۆربەی خەڵکەوە گورزێکی دەروونی قورس بوو. سوکرات ساڵانێکی زۆر لە ئەسینا کەسێکی سەرسوڕهێنەر و ئەفسوناوی بوو کە هەم زۆریان خۆشدەویست و هەم زۆر لێی بێزار بوون. لە یەکێك لە ئاهەنگە گشتیەکاندا لەبەرچاوی هەموو

خەڵکی ئەسینا لە شانۆگەرییەکی کۆمیدیدا دایانشۆری بوو. پاشان لەناکاو ڕۆژێك ئەو کەسە ناسراوە ون بوو، هۆی ونبوونەکەشی ئەوە بوو کە بە تاوانی خۆنەپارێز و گەناندنی ڕەوشتی لاوان بە مەرگ حوکم درابوو. بەلای ئەو کەسانەوە کە خۆشیان دەویست هۆی مردنەکەی لە خودی مردنەکە ناخۆشتر بوو. سوقرات ژمارەیەکی زۆر مرید و دڵسۆزی هەبوو، هەندێ لەوانە، وەکو ئەفلاتون دەستیان کرد بە نووسینی دیالۆگی سوکراتی، واتە ئەو گفتوگۆ فەلسەفیانەی کە تیایاندا سوکرات ڕێنمایی باسەکەی دەکرد. وەکو ئەوە وا بوو کە گروپێك لە هەمنیشینان ڕوو بەڕووی ئەسینایییەکان هاوار و بانگیان کردبێ کە: (بڕوانن، سوکرات نەڕۆیشتووە. هێشتا لێرەیەو بە پرسیارەکانی تەنگەتاوتان دەکات و بە بەڵگەکانی بەزەویتاندا دەکێشێت) هەڵبەتە لەو گفتوگۆ سوکراتیانەدا داکۆکی لە ناوی سوکرات دەکرا و ئەوە دەسەلمێنرا کە ئەو بە ناحەق حوکم دراوەو مامۆستای گەورەی لاوان بووە نەك ئەو کەسەی ویستبێتی خراپیان بکات.

*+ماگی: مەرگی سوکرات شتێك نەبوو کە تەنها مێشکی ئەفلاتون بخاتە کارو پاشان لەبیر بچێتەوە. وانییە؟ بە واتایەك، سەرانسەری ژیانی فیکری ئەفلاتون دەبێت - یان بەلای کەمەوە دەتوانرێ - بە گەڕانەوەی بۆ لای سوکرات ئاڕاستە بکرێ.*

–برنییت: بەڕای منیش وایە. بە زیندوویی هێشتنەوەی ڕۆحی سوکرات بەلای ئەفلاتونەوە بەو مەعنایە بوو کە دەبوو ئەویش بە هەمان ئەو شێوەیەی کە سوکرات لە فەلسەفەدا کاری کردبوو، درێژە بە کاری خۆی بدات. یەکەمین بەرهەمی ئەم کارە، کۆمەڵێ دیالۆگی سەرەتاییە کە گرنگترینیان بریتییە لە: بەرگرییینامە[1]، کریتۆن، ئوسوفرون، لاخیس، خارمیدس، پروتاگوراس، گۆرگیاس کە تیایاندا سوکرات دەبینین دەربارەی ئەو جۆرە مەسەلانەی کە حەزی لێیان بووە -واتە مەسەلە زۆر فراوانە ئەخلاقییەکان– قسە دەکات. بەڵام لەبەر ئەوەی فەلسەفەی کارکردن بە شێوەی سوکراتی بە مەعنای بیرکردنەوەی سەربەخۆی فەلسەفییە، ئەم ڕەوتە وردە وردە ئەفلاتون بەرەو جێگایەك دەبات کە لە ئەخلاق و باقی بوارە فەلسەفییەکاندا فیکری خۆی پەروەردە بکات. لەبەرئەوە، لەو وێنەیەدا کە بۆ سوکرات دەکرێ، جۆرێك ڕەوتی کامڵ دەبینین، لە دیالۆگە سەرەتاییەکاندا، سوکرات ئەو مێشەکەرانەیەیە[2] کە دەست لە پرسیارکردن هەڵناگرێ بەڵام وردە وردە دەبێت بە کەسێك کە ڕوو لە تەرح کردنی تیۆری گرنگ لە سیاسەت و میتافیزیك و میتۆلۆجیادا دەکات. ئەمەش ئەو سوکراتەیە کە لە دیالۆگەکانی قۆناغی ناوەڕاست - واتە لە مەنون و خوان و فایدون و کۆما–دا هەیە.

*+ماگی: بە کورتیەکەی لە دیالۆگەکانی سەرەتادا، ئەفلاتون مامەڵە لەگەڵ ئەو مەسەلانەدا دەکات کە سوکرات حەزی پێیان بووەو بە شێوەی خودی سوکرات دەربارەی ئەو مەسەلانە قسە دەکات و بێگومان زۆر جار کۆمەڵێ شت لە زمانی سوکراتەوە دەڵێت کە دەزانێت بیروڕای ئەو بوون. بەڵام دوای تێپەڕبوونی چەند ساڵێك ئەو جووڵە سەرەتاییە، ئەفلاتون بەرەو قسەکردن لەسەر ئەو بابەتانە دەبات کە خۆی حەزی پێیانە و بە شێوەی خۆشی قسەیان لەسەردەکات و بیرو باوەڕی خۆی دەردەبڕێ، بەڵام هێشتاش زیاتر لە زمانی سوکراتەوە.*

–برنییت: پێم وایە ڕاستە. لە هەر جێگایەکدا توانای عەقڵێکی پەسەند هەبێ ئەفلاتون بیرو بۆچوونەکانی وەکو بەرجەستە بوونی بیرو

بۆچوونەکانی سوکرات لە زمانی ئەوەوە دەخاتە ڕوو. بەڕای من، سەرنجدانی ئەو خاڵە زۆر گرنگە کە ئەفلاتون لەسەر واقیعی مێژوویی کەسێتی سوکرات بانگەشەی ئەوە دەکات کە سوکرات پیاوێك بووە کە بەشێوەیەکی سەربەخۆ بیری کردۆتەوە و خەڵکیشی فێر کردووە کە بەشێوەیەکی سەربەخۆ بیر بکەنەوە بەم پێیە، قسەی ئەفلاتون ئەوەیە کە ئێوەش ئەگەر دەتانەوێ پەیڕەوی سوکرات بکەن، دەبێ سەربەخۆ بیر بکەنەوە و لە کاتی پێویستدا دەبێ ڕێگەشتان لە بیر و زەمینە تایبەتیەکانی سوکرات جیابکەنەوە.

*+ماگی: ئەو دیالۆگە سەرەتاییانەی کە سوکرات تیایاندا سەبارەت بە مەسەلە ئەخلاقیەکان قسە دەکات، هەمیشە نموونەیەکی دیاری کراویان هەیە. سوکرات لەگەڵ کەسێکدا دەکەوێتە قسە کە دڵنیایە لەوەی ئەو مەعنای زاراوەی ئاسایی وەکو "خۆشەویستی" یان "ئازایەتی" یان "خواپەرستی" دەزانێ. پاشان دەستدەکات بە تاقیکردنەوەی ئەو کەسە و پرسیاری لێدەکات، واتە دەیخاتە بەردەم "پرسیاری سوکراتیانەوە، بۆ ئەوەی لەم ڕێگەیەوە بۆ خودی ئەو کەسە و لە هەمووی گرنگتر بۆ ئەو کەسانەی کە ئامادەن بسەلمێنێ کە بە هیچ جۆرێ بە تەواوی بەسەر ئەو چەمکەدا زاڵ نین، کە پێیان وابوو بەسەریدا زاڵن. ئەم میتۆدە خۆی لە خۆیدا لەو کاتەوە هەتا ئێستا هەمیشە لە فەلسەفەدا ڕۆڵێکی گرنگی هەبووە. وانییە؟*

–برنییت: بە تەواوی وایە. هێشتا لە خوێندنی فەلسەفە بۆ ناساندنی فەلسەفە بەو کەسانەی کە دەیانەوێ شتێکی لە بارەوە بزانن، بەشێوەیەکی فراوان سوود لەو بەرهەمانە وەردەگیرێ. لە یەکێك لە چەمکە گرنگ و باوەکانەوە کە هەمیشە لە ژیاندا دەورێکی گرنگی هەیە دەست پێدەکەیت و خەڵك تێدەگەیەنیت کە چەند کێشەیەکی تێدایە. خەڵك هەوڵ دەدەن دەربارەی ئەو چەمکە بیر بکەنەوەو دواجار وەڵامێك دەدەنەوە. سوکرات ئەوە دەسەلمێنێ کە ئەو وەڵامە بەس نییە. سەرەنجام وەڵامی بێ چەند و چوون دەدەنەوە، بەڵام ئەم جارە بە باڵا دەستی و تێگەیشتنێکی زیاترەوە لەوەی رابردوو. زیاتر لەوەی وەکو خوێنەرێك لە سەدەی بیستەمدا بێت یان لە ڕۆژگاری کۆندا، بە هەرحاڵ ڕووبەڕووی مەسەلەیەك بوویتەوەو وەڵامت دەوێ و هەست دەکەیت کە ڕەنگە تۆش بتوانیت بە دەوری خۆت یارمەتی چارەسەرکردنی بدەیت.

*+ماگی: دەبێ دان بەوەدا بنێین کە ئێمە دوای زیاتر لە دوو هەزار ساڵ هێشتا دەربارەی مەعنای "جوانی" و "ئازایەتی" و "خۆشەویستی" و باقی زاراوەکانی دیکەی لەو بابەتە سەرسامین و بەدوای وەڵامدا دەگەڕێین. ئایا هیچ پێشڕەوییەکمان کردووە؟*

–برنییت: پێم وایە وەڵامی ئەم پرسیارە هەم پۆزەتیف و هەم نێگەتیڤ بێ. تۆ پێت وانییە؟ بە ڕای من، ئەگەر ئێستا ئەفلاتون خۆی بمایە، تەئکیدی لەوە دەکردەوە کە ئەگەر وەڵامی ئەم پرسیارانەشی بزانیایە و پێشی بوتینایە، بۆ ئێمە سوودی نەدەبوو. مەبەستی من لەوەیە کە، بەپێی سروشتی ئەم جۆرە پرسیارانە، دەبێ بە شێوەیەکی سەربەخۆ بە دوای وەڵامی ئەم پرسیارانەدا بگەڕێین. وەڵامێك کە لە ئەنجامی بیرکردنەوەی خۆتەوە بەدەست نەهاتبێ، بێ بەهایە. لەبەر ئەوەیە کە ئەم دیالۆگانە بەو شێوەیە بەلای فەلسەفەدا بەکێشت دەکەن.

*+ماگی: لەم دیالۆگانەی سەرەتادا "کە بە خێرایی هێشتا قسەمان لەسەر ئەوانەیە"، یەکێك لەو شتانەی کە سوکرات هەمیشە دوبارەی دەکاتەوە ئەوەیە کە خۆ تیۆرێکی ئامادە و پۆزەتیفی نییە و*

***تەنها پرسیار دەکات. بەڕای من وا دیارە کە بڕێک ڕەندی و پەنهانکاری لەم بانگەشەیەدا خۆی حەشارداوە، چونکە پێم وایە دواجار هەندێ بیرو بۆچوونی بێ چەند و چون لە ژێر سەربانی ئەم دیالۆگانەوە دەچۆڕێتەوە. ئایا تۆ لەگەڵ ئەم ڕایەدایت؟***

—برنییت: هەڵبەتە هەندێ بیروبۆچوون دەردەکەون، بەڵام ژمارەیان زۆر نییە. بۆ نموونە کۆمەڵێ بیری پڕ مەعنا و گرنگ لە "بەرگرینامە"دا دەردەکەون کاتێ سوکرات بانگەشەی ئەوە دەکات کە نابێ هیچ جۆرە زیانێك بە مرۆڤی باش بگات، چ لەم دنیایەدا و چ پاش مردن، یان لە گۆرگیاسدا کە سوکرات بە دوور و درێژی بەڵگەی ئەوە دەهێنێتەوە کە زۆرداریی زیان بە خودی زۆردار دەگەیەنێ و دادپەروەریی قازانج بە خودی دادپەروەر دەگەیەنێ. مەبەستی سوکرات ئەوەیە کە تەنها هێدمە و زیانی ڕاستەقینە ئەوەیە کە بەر ڕۆحی مرۆڤ بکەوێ. تۆ ڕەنگە هەرچی پارەیەکت هەیە لە دەستی بدەیت یان لە ئەنجامی نەخۆشیدا، ئیفلیج بیت، بەڵام هەموو ئەمانە بە بەراورد بەو زیانەی کە ئەگەر لە ژیاندا زوڵم بکەی، کە زیانێکە خۆت لە خۆتی دەدەی، هیچە. بە پێچەوانەی ئەمەوە، هیچ سوودێ بە قەد ئەو سوودە نییە کە مرۆڤی باش لە ئەنجامی کارکردنی بە شتە باشەکاندا لە ژیانیدا بەدەستی دەهێنێ و بەم پێیە، هیچ زیانێ بەڕای سوکرات زیانی ڕاستەقینە نییە جگە لە لەدەستدانی چاکە.

دەربارەی ئەم ئەندێشانە، سوکرات زۆر بە دڵنیاییەوە قسە دەکات و هەتا باس لەوە دەکات کە ئاگای لە کۆمەڵێ مەسەلە هەیە سەبارەت بەو ئەندێشانە. لەم بوارەدا ئەفلاتون هەرگیز دەستبەرداری قسەی سوکرات نابێت و هێشتا باوەڕی تەواوی بە ڕاستی ئەو مەسەلەیە هەیە کە زوڵم زیان بە زۆردار دەگەیەنێ و دادپەروەریش سوود بە دادپەروەر دەگەیەنێ.

***+ماگی: بەم پێیە، ئەگەر ڕۆحت بە پاکی و دەست لێنەدراویی بمێنێتەوە، لەم دنیایەدا ڕووداوی ناخۆش ناتوانێت هیچ جۆرە زیانێکی قووڵ و بەردەوامت پێبگەیەنێ.***

—برنییت: بەڵێ، ڕاستە. بەڵام کۆمەڵێ ئەندێشەی تر هەن کە سوکرات لە بارەیانەوە بانگەشەی ئاگاداریی لێیان و بە باشی لێتێگەیشتنیان ناکات و سەرئەنجام ئەفلاتون بە ناوی ئەوەوە دەیانڵێت، هەموویان لەم ڕستەیەدا کورت دەبنەوە کە چاکە بریتییە لە مەعریفە (زانین). لەو دیالۆگە سەرەتاییانەدا، کاتێ لە یەکێ دەپرسن "ئازایەتی چییە؟" "خواپەرستی چییە؟" "دادپەروەریی چییە؟" درەنگ یان زوو دواجار ئەوە ئاشکرا دەبێ کە ئەو چاکەیەی قسەی لێدەکرێ —لە سەروو ئازایەتی یان خواپەرستییەوەیە و— دەبێ وەکو بەشێك لە زانین یان مەعریفە لێك بدرێتەوە. ئەم قسەیەش وەکو ئەندێشەکانی کۆمەڵی یەکەم، تۆکمەیە بەڵام بە ڕووکەش هەڵەیە، چونکە هەستی ئاسایی —هەم لەو کاتەدا و هەم ئەمڕۆش— وا حوکم دەکات کە دانایی و زانایی پێویست بۆ زانینی ئەوەی لە هەر جێگایەکدا باشترین کار چییە، شتێکە و ئازایەتی پێویست بۆ کردنی ئەو کارە هەتا ئەگەر دژواری و مەترسیشی تێدا بێ، یان دان بە خۆدا گرتنی پێویست بۆ تەسلیم نەبوون بە دڵەڕاوکێی هەڵبژاردنی ڕێگای ئاسانتر، بە تەواوی شتێکی دیکەیە. دانایی و زانایی یەکێکە لە سیفەتە باشەکان لە هەر مرۆڤێکدا، ئازایەتی سیفەتێکی دیکەیە و دان بە خۆدا گرتن لە هەردوکیان جیایە. یەکێك کە ڕەنگە تەنها یەکێ لەم سیفەتانەی تێدابێ یان هەر یەکێ لەم سیفەتانە بە ڕادەی جیاواز بەکار بێنێ. بەڵام

ئەگەر ئازایەتی زانینی باشترین ڕێگەبێ، ئەو بەشەی جیاوازی و ناکۆکی هەرگیز نایەتە ئاراوە. بەڵام، بەڕای ئەفلاتون، ئەگەر ئەو کارەی کە من کردوومە ڕاست نەبووە، ناشێ هۆکەی ئەوە بێ کە دەمزانی دەبێ چی بکەم بەڵام ئازایەتی پێویستم نەبووە بۆ ئەنجامدانی ئەو کارە. کە ئازایەتیم نەبووە، تێگەیشتنیشم نەبووە و نەمزانیووە کاری ڕاست چییە. بەم پێیە هەر کارێکی ناڕاست بکەم لە ڕووی نەزانییەوە کردوومە؛ لەبەر ئەوە کردوومە کەنەمزانیووە باشترین کار کە دەبێ بیکەم چییە. بەڵام هەر کارێ کە یەکێك لە ڕووی نەزانیەوە بیکات، بەبێ ئەوەی بیەوێ لە خۆیەوە کردوویەتی. بەم پێیە، بۆ ئەوەی پوختەی بابەتەکە لە قاڵبی دروشمە بەناوبانگەکەی سوکراتدا دەربڕین دەبێ بڵێین: "هیچ کەسێ لە ڕووی ویست و خواستەوە کاری نابەجێ ناکات".

*+ماگی: بۆ ئێمە کە لە سەردەمی دوای فرۆیددا دەژین، باوەڕکردن بەو گۆتەیە تەقریبەن کاری کردە نییە کە هەموو سەرچاوەکانی ئیشەکانی ئێمە لە هەست (شعور)دایە یان سەرچاوەی کار - بەپێی بنەماش بۆ ئەوەی لای بکەر بناسرێتەوە - لەبەردەستی هەستدایە. بەم پێیە، پێم وانییە لەمرۆدا هیچ کەسێ بتوانێ باوەڕ بەو تیۆرە تایبەتەی سوکرات بکات.*

-برنییت: بڕوانە، بەڕای من، یەکەم شت کە دەبێ بگوترێ ئەوەیە کە زۆربەی خەڵك هەتا لەو کاتەشدا باوەڕیان بەو تیۆرە نەدەکرد. پروتاگوراس دەڵێت کە هەتا باوەڕی سەبارەت بە ئازایەتی بە پێچەوانەی باوەڕی هەموو مرۆڤێکەوەیە. بەڵام ڕووەکەی تری دراوەکە ئەوەیە کە ئەمرۆش هێشتا کۆمەڵێ فەیلەسوف هەن کە بەڵگەی ئەوە دەهێننەوە کە تەنها فاکتەرێك کە دەشێ، وەك دەڵێن، ئێمە بخاتە کار، بیروڕامانە دەربارەی چاك و خراپ و ئەگەر ئەم بیروڕایانەش هیچیان لە دەست نەیەت، شتێکی دیکە نامێنێتەوە. کەسانێك هەن کە هێشتا ناتوانن باوەڕ بەوە بکەن کە جگە لە هێزی تێگەیشتن، چەند مەسەلەیەکی دیکەی وەکو ئیرادە یان هێزەکانی دیکەش ڕەنگە لە کارەکانی مرۆڤدا کاریگەرییان هەبێ.

*+ماگی: قاڵبی دیالۆگ کە ئەفلاتون بۆ نووسینی هەڵبژاردووە، دوو مەسەلەی گرنگ بەڵام ڕەنگە لە چارەکردن نەهاتوو بخاتە ڕوو. یەکەمیان ئەوەیە کە تا چ ڕادەیەك ئەو سوکراتەی کە تیۆرەکانی دەدرێ بە ئێمە، سوکراتە ڕاستەقینەکەیە و تا چ ڕادەیەکیش ئەو کارەکتەرە دراماتیك و خوڵقێنراوەی ئەفلاتونە؟ چونکە ناکرێ نکوڵی لەوە بکرێ کە یەك بەیەکی ئەو دیالۆگانە دوای مردنی سوکرات نووسراون. دووەمیان ئەوەیە کە تیۆرەکانی خودی نووسەر چییە؟ چونکە هەموو بیروڕاکان لە زمانی کەسانی غەیری ئەفلاتوونەوە دەردەبڕێن.*

-برنییت: پێم وایە بە مەفهومێك پێویستە نیگەرانی ئەم مەسەلانە بین و بەمەفهومێکی تر، پێویست نییە. نیگەرانی بەو مەفهومە پێویست نییە کە ئەفلاتوون لە وێنەیەکدا کە بۆ سوکرات ڕەسمی کردووە دەیەوێت بڵێت کە سوکرات بەشێوەیەکی سەربەخۆ بیری دەکردەوە. خەڵك لە کۆنەوە بە چەند ئەنجامێك گەیشتبوون و ئەم ئەنجامانە زۆر لەلایان ئازیز بوون. ئەفلاتوون دەڵێت سوکرات ئەو دەسەڵاتەی هەبوو کە واز لەو ئەنجامانە بێنێ و کەسانی دیکەشی فێر دەکرد کە ئەو کارە بکەن. بەم پێیە، ئەگەر دەبینین ئەفلاتون ئەو ئەنجامانە بە دەست دەهێنێ کە تێگەیشتن گرنگترین فاکتەرە لە فەزڵدا، بەڵام فەزڵ لە تێگەیشتندا کورت نابێتەوە -

**هەروەکو چۆن لە راستیشدا دەگاتە ئەنجامێکی لەو جۆرە - دەبێ ئاگامان لەوە بێ کە ئەفلاتون بە تەواوی لە ڕێی پەیڕەوی کردنی ڕێنماییەکانی سوکراتەوە ئەو تیۆرەی کە سەبارەت بەوەیە کە فەزڵ خودی مەعریفەیە دەخاتە لاوەو لە کۆماردا تیۆرێکی باشتر دەخاتە ڕوو. لە لایەکی دیکەوە ئەو نیگەرانیە دەربارەی ئەو مەسەلانە کە تۆ تەرحت کرد بەو مەفهومە پێویستە کە دەبێ ئاگامان لەوەبێ و بزانین چی ڕوویداوە کە سوکرات لە کۆماردا شتێك دەڵێت کە لەگەڵ ئەوەدا کە پروتاگۆراس وتوویەتی، ناکۆکە. گرنگ ئەوەیە کە ئاگامان لەوە بێ لە کۆماردا ڕووبەڕووی بۆچوونێکی نوێ بووینەتەوەو بزانین کە ئەو بۆچوونە چۆن لەگەڵ مەسەلەکانی دیکەدا کەتیایاندا کتێبەکە بۆتە مایەی سەرنج گرێ دەدرێ. دەبێ بزانین فێرکردن و پەروەردەکردنی ئەخلاقی چۆن لە ئەنجامی ئەو بۆچوونە تازەیەدا لە رابردوو ئاڵۆزتر دەبێ و چۆن وێنەیەکی نوێی کۆمەڵگایەکی سیاسی خواستراو بەدەست دێت. ئەوەی گرنگە شێوەی گەڕان و ڕەوتی لێکۆڵینەوەیە. دەبێ بە هۆشیارییەوە بە دوای ڕەوتەکەدا بچین و بزانین لە کوێوە دەستمان پێکردووە و بە کوێ گەیشتووین.**

*+ماگی: بە دەربڕینێکی تر، لەوێوە کە گریمانە و بیروباوەڕەکانی ئێمە هەمیشە جێگای گومان و پرسیارن، "ئەنجامەکانمان" هیچ پێگەیەکی تایبەتیان نییە و تەنها ڕێگە بەرەو لێکۆڵینەوەی باشتر نیشان دەدەن.*

**–برنییت: بەڵێ، پێم وایە ئەفلاتون زۆر باوەڕی بەم بابەتە هەبوو.**

*+ماگی: زۆر باوەڕی بەوە هەبوو و دەیەویست بەو میتۆدەی لە کارکردندا بەکاری دەهێنا، ئەوە بۆ ئێمەش بسەلمێنێ.*

**–برنییت: کتومت وایە، پێم وایە دەکرا بانگەشەی ئەوە بکات کە بە زیندوویی هێشتنەوەی ڕۆحی سوکرات بەو مەعنایەیە.**

*+ماگی: هەڵبەتە ئەم کارە سەبارەت بە هونەرمەندە داهێنەرەکان لە فەیلەسوفەکان زیاتر باوە، بەڵام بەرهەمەکانی ئەفلاتونیش بۆ سێ قۆناغی سەرەتا و ناوەڕاست و کۆتایی دابەش دەکرێن.*

*هەتا ئێستا ئێمە باسەکەمان لە سنووری دیالۆگەکانی سەرەتادا بوو. ئێستا ئیدی ئەگەر بەرەو پێشەوە بچین و بگەینە قۆناغی ناوەڕاست، دەبینین ئەفلاتون بۆ یەکەمجار لە لای خۆیەوە چەند ئەندێشەیەکی ئامادە و پۆزەتیف دەردەبڕێ و هەڵبەتە بەرگری لەو ئەندێشانەش دەکات. بەڕای تۆ گرنگترین ڕێنماییە پۆزەتیفەکانی ئەفلاتون کامانەن؟*

**–برنییت: پێم وایە دەبێ زیاتر حساب بۆ دوو تیۆر بکرێ و لە باقی تیۆرەکانی دیکە جیا بکرێنەوە. یەکێکیان تیۆری نموونەکانە[3] وئەوی تریان ئەو باوەڕەیە کە فێر بوون بە مەعنای بەبیر هاتنەوە یان بەیاد هێنانەوەیە: واتە کاتێ تۆ شتێ فێر دەبیت، لە ڕاستیدا ئەو زانینە لە زەینت دەردەهێنی، کە لە پێش لەدایکبوونەوە هەتبووە.**

*+ماگی: با یەکەم جار بچینە سەر دووەم. زۆر خەڵك کاتێ یەکەم جار گوێبیستی ئەوە دەبن کە ئێمە بە یەدەکێك زانستەوە دێینە دنیاوە، ئەم قسەیەیان بە سەیر و پێکەنین هێنەر دێتە بەرچاو. بەڵام هەمیشە لە ڕووناکبیری خۆرئاوادا، چەند ئەندێشەیەکی زۆر پەیوەست بەم فیکرەوە هەبووە. فەیلەسوفە ئایدیالیستە تازەکان یان ئەو فەیلەسوفانەی کار لە ڕەسەنێتی مەعنا دەکەن بەڵگەیان هێناوەتەوە کە دەبێ مەعریفەی خۆڕسك یان وێناکردنی خۆڕسك لە ئێمەدا هەبێ. بەڕای من، پەیڕەوانی زۆربەی ئایینە گەورەکانیش باوەڕیان بە*

***شتێکی لەم جۆرە هەیە. ئەمڕۆ هەتا بیریارێکی دیاری وەکو (چۆمسکی – chomsky)یش بەڵگەی ئەمە دەهێنێتەوە کە کاتێ ئێمە لەدایک دەبین، سەراپای ڕێزمانێك لە مێشکماندا بەرنامە ڕێژی کراوە. بەم پێیە، باوەڕێکی لەم جۆرە، ئەگەر لە بارەیەوە بەجدی لێکۆڵینەوە بکرێ، بەڕاستی دەبێ حسابی جدی بۆ بکرێ. ئەو فۆڕمەی کە ئەفلاتون بەم مەسەلەیەی بەخشیوە چییە؟***

—برنییت: ئەفلاتون دەیوت کە زانین یان مەعریفە بەشێك لە سروشتی زاتی نەفسە. نەفسی تۆ بەرلەوەی بێیتە دنیاوە ئەو مەعریفەیەی هەبووە. (ئەمە لە قۆناغێکدا بوو کە ئەفلاتون باوەڕی وا بوو نەفس بەر لەدایکبوونیش بوونی هەیە و جێکردنەوەی ئەو مەعریفەیە لە بەدەندا لەم دنیایەدا، یەکێکە لەبەرجەستەبوونە بەردەوامەکانی). بەڵام بەڕای من، بۆ تێگەیشتن لە تیۆری بەیاد هێنانەوە، پێویستە بگەڕێینەوە بۆ خودی دیالۆگە سەرەتاییە سوکراتیەکان دەربارەی پێناسەکردنی چەمکە ئەخلاقیەکان.

بۆ نموونە با نامەی لاخیس لەبەرچاو بگرین کە ئەم پرسیارەی تێدا دەخرێتە ڕوو کە (ئازایەتی چییە؟) لاخیس سەردارێکە کە سوکرات دەیەوێ لە ڕێگەیەوە پێناسەی ئازایەتی بکات. لاخیس لە وەڵامدا دەڵێت ئازایەتی جۆرێکە لە پایەداریی. پاشان سوکرات وەکو هەمیشە کە کەسێ شتێ پێناسە دەکات، دیسان چەند پرسیارێکی دیکە تەرح دەکات و دەپرسێت: "ئایا ئازایەتی هەمیشە و بەبێ بواردن سیفەتێکی پەسەندکراو و ستایش کراوە؟" لاخیس دەڵێ بەڵێ و پاشان سوکرات چەند بەڵگەیەك بۆ پایەداریی دەهێنێتەوە تا دواجار لاخیس بە ناچاری دان بەوەدا دەنێ کە پایەداریی بە هیچ شێوەیەك سیفەتێکی پەسەندکراو نییە، بەڵکو کەللە ڕەقی و گێلییە.

*+ماگی: یان کەرێتییە...*

—برنییت: بەڵێ، کەرێتییە، یان دەشێ لە ڕووی ئەخلاقیەوە نە باش بێت و نە خراپ، بۆ نموونە وەکو سەڕافێك کە دەست لە پارەدان هەڵناگرێ لە تەحەمول کردنی زیانەکاندا پایەداری دەکات چونکە دەزانێت دواجار قازانج دەکات. کەواتە ئەگەر پایەداری دەشێ ناپەسەند بێ، یان نە باش بێت و نە خراپ، لە کاتێکدا کە ئازایەتی هەمیشە باشە، ناکرێ وا بزانین ئازایەتی یەکسانە بە پایەداریی، هەتا یەکسان نییە بەو بەشەی پایەداریش کە مەعریفە دەکاتە ڕێنمای خۆی. ئەمە نموونەی باوی دیالۆگی سوکراتییە.

بەڵام تەنیا شتێك کە بەپێی لۆجیك سەلمێنراوە ئەوەیە کە بیروباوەڕەکانی لاخیس لەگەڵ یەکتریدا ناکۆکن و ئەگەر بە گشتی وەڵامەکانی لەبەرچاو بگرین، دەبینین لەگەڵ یەکتری ناکۆکن. یەعنی لە یەك کاتدا ناشێ هەموویان ڕاست بن. دواجار ئەم مەسەلەیە خۆی لە خۆیدا پێمان ناڵێت کە کام لە وەڵامەکانی لاخیس لەگەڵ واقیعدا نایەتەوە. لەگەڵ ئەوەشدا، سوکرات وەکو شتێکی ئاسایی وا خۆی دەنوێنێ کە ئەو پێناسەیەی کە بەرامبەر پێشنیازی کردووە – یەعنی لەم بارەیەوە، پێناسەکەی لاخیس کە ئازایەتی وەکو بەشێك لە پایەداریی پێناسە دەکات– بەتاڵە و درۆکەی سەلمێنراوە. بەم پێیە، بە کردەوە وەڵامە لاوەکی و فەرعیەکانی لاخیس بە ڕاستگۆ دەناسێنێ یان، بەهەر حاڵ، بە ڕاستگۆتر لە پێناسەی پێشنیازکراوی دادەنێ و ئەم وەڵامانە دەکات بە بنەما بۆ بەتاڵ کردنەوەی پێناسەکە و دەڵێت "ئەم وەڵامە (یەعنی پێناسەکە) لەبەرئەوەی لەگەڵ واقیعدا نایەتەوە دەبێ بخرێتە کەنارەوە.

*ماگی: ئەو خاڵەی کە ئێستا باست کرد، لە ڕوانگەی هەر بیریارێکی جدییەوە گرنگییەکی لە سڕینەوە نەهاتووی هەیە. هەموومان پێمان وایە کە ڕەنگە بە دیالۆگ بگەینە ڕاستی. بەڵام دیالۆگ توانایەکی لەو جۆرەی نییە. دیالۆگ لەوە زیاتری لە دەست نایەت کە ئەوەمان پێ نیشانبدات ئەنجامی قسەکەمان بۆ ئەو پێشەکییەی کە دامان ڕشتووە پێویست دەبێ یان نا. بەڵام بەو گریمانەی کە پێویستیش دەبێ، پێویست نییە بێگومان ڕاست بێت.*

–برنییت: پێم وایە هەموومان شەیدای ئەو بیرەین کە بە دیالۆگ دەتوانین بگەینە ڕاستی، لە کاتێکدا کە ئەگەر بە ڕاست و دروست ئەمە هەڵبسەنگێنین، دەبینین ئاراستەکردنی ئەو بیرە زۆر سەختە. سوکراتیش بە نیازی ئاراستەکردنی نییە، تەنها پرسیار دەکات و وەڵامەکان لە جێگایەك کۆ دەکاتەوە بۆئەوەی ناکۆکی نیشان بدات و پاشان ئیدیعای ئەوە دەکات کە پێناسەکەی بەتاڵ کردۆتەوە. ئەگەر بمانەوێ تیۆرێك دەربارەی میتۆدی کاری ئەو بخەینە ڕوو، دەبێ فکرێکی وەك ئەوەی هەردووکمان ئاماژەمان بۆ کرد بخەینە ڕوو، بەو مەعنایەی کە بڵێین هەموو کەسێ دەتوانێ بەو هۆیانەی کە خۆی بیریان لێدەکاتەوە، هۆکاری سەرکەوتنی ڕاستگۆیی بەسەر درۆدا فەراهەم بکات.

ئەمەش ڕاست ئەو کارەیە کە ئەفلاتون لە مینوندا دەیکات و تیۆرێك دەربارەی شێوازی دیالۆگی فەلسەفی یان دیالۆگی سوکراتیانەدا دەیخاتە ڕوو و دەڵێت زانینی وەڵامی ڕاستی پرسیاری وەکو "ئازایەتی چییە؟". "دادپەروەریی چییە؟" بە شێوەیەکی شاراوە لە زیهنی هەمووماندا هەیە. ئەم زانینەی کە بە قوڵی لە ناخی ئێمەدا خۆی حەشارداوە یەکسەر لەبەردەستماندا نییە، توانای ئەوەمان دەداتێ کە وەڵامی ناراست ڕەت بکەینەوە و ئەوە نیشان بدەین کە ڕاستن. لە بەشێکی دیالۆگی سوکراتدا لەگەڵ لاخیس، بە پشت بەستن بە هەندێ لە گۆتەکانی خودی لاخیس ئەوە دەسەلمێنرێ کە گۆتەکانی دیکەی وەکو پێویست لەگەڵ واقیعدا نایەتەوە.

ئەو زانینەی کە ئاماژەمان بۆ کرد لە هەمان بەشدا کەم کەم دێتە دەرێ.

*+ماگی: لەو گفتوگۆیانەی کە پێشان کردمان دەزانم کە بە باوەڕی تۆ، ئەو تیۆرەی کە شیتکردەوە بنەمای تیۆرێکی دیکەی پەیوەستە بە قۆناغی ناوەڕاستی ئەفلاتونەوە، یەعنی تیۆری نموونە کە لە هەموو تیۆرەکانی دیکەی ئەو زیاتر نفوزی هەبووە، بە جۆرێ کە زاراوەی "فەلسەفەی ئەفلاتون" بەشێوەیەکی سەرەکی بە یەکسان بەو تیۆرە دادەنرێ. دەکرێ لەم بارەیەوە ڕوونکردنەوەمان بدەیتێ؟*

–برنییت: میحوەری ئەو دیالۆگە سوکراتیانەی کە لە بارەیانەوە قسەمان دەکرد، گەڕان بوو بۆ دۆزینەوەی پێناسەکان. پرسیار ئەوە بوو کە پێناسەی ئازایەتی چییە. پێناسەی جوانیی چییە؟ پێناسەی دادپەروەری چییە؟ ئەگەر وایدابنێین کە زانینی وەڵامی ڕاستی ئەم پرسیارانە بە شێوەیەکی شاراوە لە ناخی ئێمەدا هەیە و ئەم زانینەمان بە شێوەیەکی سەربەخۆ لە جیهانی هەست و ئەزموون و لە پێش ئەوەدا هەبووە – یەعنی هەمان ئەو جیهانەی کە تیایدا دەژین و هەستەکانمانی تێدا دەخەینە گەڕ و تیایدا، بەملا و بەولادا دەچین – بە دەربڕینێکی دیکە ئەگەر زانینی ئێمە بەشێوەیەکی سەربەخۆ لە هەموو ئەو شتانە و لە پێشیانەوە هەبێ، لەو حاڵەتەدا گومان لەوەدا نییە کە ئەوەی دەیزانین – یەعنی ئەوەی لە بارەیەوە زانینمان هەیە،

وەکو دادپەروەریی و جوانیی و ئازایەتی - خۆشی دەبێ لەم دنیایەدا کە تیایدا دەژین سەربەخۆ بێ و لەم دنیایە کۆنتر بێ. بنەمای تیۆری نموونە هەمان ئەم مەسەلەیەی دواییە، بەو مەعنایەی کە دادپەروەریی و جوانی و هتد.. بوونیان جیا و سەربەخۆیە لە هەموو کارێکی دادپەروەرانە و هەموو کەسە دادپەروەرەکان و هەموو شتەکان و هەموو کەسێکی جوان کە ڕەنگە لە جیهانی هەست پێکراودا بیانبینین و لە پێش هەموویاندا هەیە. جوانی و دادپەروەریی بوونێکی جیاو سەربەخۆیان هەیە. ئەمەش یەعنی تیۆری نموونە.

*+ماگی: ئەو باوەڕەی کە جیهانێکی دیکەی غەیری ئەم دنیایە هەیە - جیهانێکی نموونەیی یان ئارمانی -کە هەر بە هاومەعنایەك بە دنیای ئێمە بدات، لەو جیهانەدا هەیە، کاریگەریی و نفوزێکی بێسنوور و حسابی لە سەرتاسەری ڕۆشنبیریی ئێمەدا هەبووە، وانییە؟*

-برنییت: چۆن وانییە، وایە.

*+ماگی: بۆ نموونە - بۆئەوەی گرنگترین نموونەمان لەبەرچاو گرتبێ - لە ئایینی مەسیحیدا فەلسەفەی ئەفلاتون کاریگەرییەکی گەورەی هەبووە لەسەر مەسیحیەت.*

-برنییت: بەڵێ، ڕاستە، بەڵام، بەڕای من، دەبێ لە بەکارهێنانی دەستەواژەی وەکو "جیهانی نموونە" یان "جیهانێکی دیکە"دا وردبین. ئەفلاتون ئەم دەستەواژانەی بەکاردەهێنا، بەڵام بە پێچەوانەی ئەوەوە کە دەشێ ئێمە بیری لێ بکەینەوە، مەبەستی لەو ناکۆکیە، ئەو ناکۆکیە نییە کە لە نێوان کۆمەڵێ شتی تایبەتی و کۆمەڵێ شتی دیکەی کوتومت وەك ئەوانەدا هەیە، لە کۆتاییدا بە شێوەیەکی کامڵتر و ئەبستراکتتر لە جێگایەکی دیکەدا، ئەو ناکۆکیەی ئەفلاتون مەبەستێتی بۆ نموونە لە جێگایەکی وەکو ئاسماندا بریتییە لە ناکۆکی نێوان گشت و تایبەت. پرسیارێکی لەو بابەتەی "دادپەروەریی چییە؟"، "جوانیی چییە؟" و غەیری ئەمانە، پرسیارێکە گشتی، پرسیارێکە دەربارەی دادپەروەریی و جوانی بەشێوەیەکی گشتی پرسیارێك نییە دەربارەی شتێکی تایبەتی هەر ئێستا و لێرەدا. دەبێ ئەو ناکۆکیە لەبەرچاو بگیرێ.

لە نامەی (فایدۆن) لە جێگایەکدا سوکرات دەڵێت کە کارکردن لە فەلسەفەدا یەعنی مەشق کردن بۆ مەرگ. با واز لەوە بێنین کە کارکردن لە فەلسەفەدا لە راستیدا یەعنی مەشق کردن بە مردوویی (ئەوانەی لەوێن پێدەکەنن) چۆن سوکرات قسەی وا دەکات؟ لەبەرئەوەی مردن یەعنی جیابوونەوەی رۆح لە لەش، و کاتێ تۆ لە فەلسەفەدا کاردەکەی، هەتا ئەو شوێنەی دەتوانیت ڕۆحت لە لەشت بە دوور دەگریت چونکە لە بیری ئێستا و ئەوەدانیت کە لەشت هەیە. کاتێ دەپرسیت "دادپەروەریی چییە؟" مەبەستت لەوەیە کە دادپەروەریی لە هەر کات و شوێنێکدا خۆی لە خۆیدا چییە، مەبەستت ئەوە نییە کە "ئەمڕۆ یان دوێنێ کێ زوڵمی لە من کرد؟" کاتێ دەپرسی "جوانی چییە؟" مەبەستت لەوە نییە کە "جوانترین کەس لەم ژوورەدا کێیە؟" بەم پێیە، ئەگەر لە بیری ئێرە و ئێستادا نەبیت، بەو مەعنایەی ئەفلاتون مەبەستێتی ئێستا لێرە نیت. لەو شوێنەی کە رۆحتی لێیە- هەڵبەتە نەك لەو لایەنەوە کە لە جێگایەکی تایبەتیترو باشتری، بەڵکو لەو ڕوانگەیەوە کە بەو مەعنایە لە هیچ کوێ نیت. لە شتە گشتیەکاندا نقوم بوویت. ئەنجام ئەوەیە کە، بەکارهێنانی دەستەواژەی "جیهانی نموونە" کێشەیەکی تێدا نییە بەو مەرجەی کە ئاگامان لەوە بێ مەبەست لەو دەستەواژەیە،

قەڵـەمڕەوی شـتە گشـتییە جێگیرەکانــە کــە گــۆڕان قبوڵ ناکەن.

*+ماگی: ئەو دیالۆگانەی قۆناغی ناوەڕاست کە ئێستا قسەی لەسەر دەکەین واتە - مینون و فایدۆن و کۆمار و خوان و فایدروس - لە کاتێکدا نووسراون کە ئەفلاتون لە لوتکەی بە توانابیدا بوو. لەبەرئەوە، پێم وایە خراپ نییە کـەمێك لەسـەریان بوەسـتین و چاوێك بە چۆنایەتی ئەدەبی و باقی چۆنایەتییەکانی دیکـەیاندا بخشـێنین لـە ڕووی هونەرییـەوە، بۆچـی کەسانێك ئـەم نامانـە بـە چـەند شـاکارێ دەزانـن لـە باڵاترین سنووری هونەری ئەدەبیدا؟*

-برنییت: لەبەرئـەوەی هێنـدە زینـدوون. چـەند فەیلەسوفێکی دیکەش وەکو کسنوفون و سیسرون و ئۆگەستین و بارکلی و هیوم، چ لـە سـەردەمی کۆن و چ لـە سـەردەمی نوێـدا، هـەوڵیانداوە شـتەکانیان لـە قاڵبی دیـالۆگ یـان گفتوگـۆدا بنووسـن. بـەڵام تەنـها کەسێك لـەو لیستـەدا کە دەشێ هـەتا کـەمێك لەگـەڵ ئەفلاتوندا قابیلی بەراوردکردن بێ هیوم-ە، و بەڕای من، لەبەرئـەوەی کـە ئـەویش وەکـو ئـەفلاتون، بـەلای کەمـەوە بەقەد ئەو ئەنجامانەی بەدەسـت دەهێـنرێن گرنگـی بـە جوڵـەی بـیری فەلسـەفی دەدات. لای کسـنوفون و بـارکلی ئـەوە ئاشـکرایە کــە ئــەوەی نووسەر گرنگی پێدەدات وەڵامەکانە، نە ئەو جوڵـە و سەفەرەی کە دەبێ بەرەو ڕوویان بکرێ. سەبارەت بە ئـەفلاتون، دەبـێ مامۆستاییەکەشـی لـە قسـەکردندا بخەینە سەر ئەوەی لە بارەیەوە وتمان: یـەعنی ئـەو زمانەی کە لایـەکی شـەپۆلی وەسـفی درێـژ و خـەیاڵ ئـەنگێزە و لاکـەی تریشـی بریتیـە لـە شـیکردنەوەی جدی و لە هەموو باق و بریق و شاخ و گوێیـەك پاك کراوەتەوەو تیایدا قسـەی خۆش و وەڵامـی حـازر بـە دەستی جوانیش بەدی دەکرێ. پاشان دەبێ ئەوەش بڵێین کە ئەفلاتون بـە چ شـارەزاییەکەوە هـەتا تـەم و مژاویترین و ئاڵۆزترین ئەندێشە وەکو ڕۆژی ڕووناك، ڕوون دەکاتـەوە. ئەگـەر بمانـەوێ درێـژەی بدەینـێ، دەبێ هـەروا بـەردەوام شـتی تـازەی بخەینـە سـەر و دواجـار بڵێــین کــە ئــەفلاتون، هــەم لــە هونــەردا سەرسـوڕهێنەرەو هــەم لــە فەلسـەفەدا کەسـێکی بلیمەتە.

*+ماگی: لـە کۆنـەوە بـاوەڕ وابـووە کـە شـاکاری ئەفلاتون کۆمارەکەیـەتی ئایا تـۆش هـەمان بـاوەڕت هەیە؟*

-برنییت: بەڵێ، هەمان باوەڕم هەیە.

*+ماگی: بۆچی؟*

-برنییت: لەبـەر ئـەوەی پێم وایـە ئـەفلاتون لـە کۆمارەکـەیدا زیـاتر لـە هـەر نووسـینێکی دیکـە ئـەم بـاوەڕەی خـۆی دەسـەلمێنێ کە هـەر مەسـەلەیەك بـە مەسـەلەیەکی دیکــەوە گــرێ دراوە. لێکۆڵینــەوە هــەرگیز نابــێ بوەســتێ لەبــەر ئــەوەی "هــەر ئەنجامێکمان کە بەدەست هێناوە" بەرەو مەسەلەی دوای خـۆی بـەکێش دەکرێ. ئەفلاتون لـە پرسـیاری سـوکراتیانە و سـادەی هـاوڕێکی بـاوەوە دەسـت پێدەکات و دەپرسـێت "دادپـەروەریی چییـە؟" ئـەم پرسیارە پرسیارێکی دیکەی لێدەکەوێتەوە کە "ئایا دادپـــەروەریی ســـوود بـــە کەســـی دادپـــەروەر دەگەیەنێ؟" گرنگترین کارێ کە کۆمار دەبێ بیکات ئەوەیـە کـە نیشـانی بـدات دادپـەروەریی سـوود بـە خودی کەسی دادپەروەر دەگەیـەنێ و تـۆ بـۆ ئـەوەی بەختەوەر بی، زیاتر لە هەر شتێکی دیکە پێویستت بـــە دادپـــەروەریی هەیـــە، و بـــە پێچەوانـــەی ئەمـەوە مرۆڤـی زۆردار بەدبـەختترین و بێنـەواترین بوونەوەرە.

ئەفلاتون دەبینێ بۆ سەلماندنی ئەم بابەتانـە، دەبێ تیۆرێك سـەبارەت بـە سروشـتی مـرۆڤ بخاتـە ڕوو. نەفس دابەش دەکات بۆ سێ بـەش و لـە هـەمان

شوێندا لە قسەکەی سوکرات دەکشێتەوە کە دەیوت فەزڵ یەعنی مەعریفە. بەرەبەرە ئەوە ئاشکرا دەبێ کە فەزڵ جگە لە مەعریفە و زانست شتی دیکەشی لە خۆ گرتووە، هەرچەندە دەبێ جڵەوی هەموو کاروبارەکان بە دەست مەعریفەوە بێت. بەڵام خودی ئەو بیرەی کە دەڵێ جڵەوی فاکتەرە دەروونیە غەیرە عەقڵیەکان دەشێ و دەبێ لە دەستی مەعریفەدابێ، ڕێگا بۆ بیرێکی دیکە دەکاتەوە کە دەڵێ لە کۆمەڵدا دەبێ زانست و مەعریفە فەرمانڕەوا بێ. بەم پێیە لە زانستی سیاسەتدا دەگەینە تیۆرێك کە شێوەیەکی تازەو باشتر لە کۆمەڵدا بۆ ژیان ڕەسم دەکات. لە هەمان کاتدا، ئەو تەئکیدەی کە لەسەر ئەو ئەندێشەیە بنیات نراوە کە زانست دەبێ جڵەوی کاروبارەکان بگرێتە دەست، ئەم پرسیارە دەخاتە ڕوو کە: "چ زانستێ دەبێ جڵەوی کارەکانی لە دەستدابێ و لە بنەرەتدا زانست چییە و بۆچی لە گومان باشترە؟" بەم پێیە دەگەینە تیۆریك دەربارەی مەعریفەزانی کە کەم کەم فراوان دەبێ و دەبیتە لیکۆلینەوە لە ناو زانستەکاندا. باسیکی ئاسان سەبارەت بە بیرکاری دیتە پیشێ. بە چاوی دڵ دەبینین کە تیگەیشتنی تەواو لەو کۆمەلگایەی تیایدا دەژین یەعنی چی و ئەمە بۆ سەلماندنی ئەو ئیدیعایەیە کە ئەو تیگەیشتن و دەرککردنەی مەبەستمانە هەمان ئەو شتەیە کە دەبێ بەسەر خۆماندا چ وەکو تاك و چ وەکو کۆمەڵ – باڵ بکیشێ، چونکە سوودەکانی دادپەروەریی، هەم وەکو تاك و هەم وەکو کۆمەڵ بەر ئیمە دەکەوێ. دوای ئەو هەموو ئەنجامەی کە لەو پرسیارەوە – واتە "دادپەروەریی چییە؟" – دەسدەکەوێ، بیگومان تەنیا ئەنجامیك کە دەشێ بە دەست بهینرێ بریتییە لە بوونی ژیانی ئەو دنیا و ئەفسانەی "ئەر – *myth of Er*"ە لە کۆتایی کتێبەکەدایە ڕەنگە بشێ بگوترێ

کە کۆمار ئەو باوەڕە دەگەیەنێتە قۆناغی پراکتیك کە باس و لێکۆڵینەوە هەتا کاتی مردن کۆتایی نایەت.

*+ماگی: کۆمار بەڕادەیەك دەوڵەمەند و پڕ مانایە کە لەم باسەدا لە تواناد نییە لە هەموو تان و پۆکانی بکۆڵینەوە. بەڵام بێگومان یەکێك بووە لە کتێبە بە نفوزەکان لەسەراپای مێژووی ڕووناکبیریی ئێمەدا و هیوادارم لای هەندێ کەس پاڵنەری خوێندنەوەی دروست بووبێ.*

*با بچینە سەر دوا قۆناغی دیالۆگەکانی ئەفلاتون. بە هەمان شێوە کاتێ لە دیالۆگەکانی قۆناغی سەرەتاوە بەرەو قۆناغی ناوەڕاست دەچووین، گۆڕانکاریمان بینی، کاتێ لە قۆناغی ناوەڕاستیشەوە دەچینە سەر دوا قۆناغی دیالۆگەکان، گۆڕانکارییەکی دیکە دەبینین. لەناکاو چۆنێتی ئەدەبی و دراماتیکی و دڵگیری دیالۆگەکان کەم دەبێتەوە و بە قسەی هاوچەرخەکان زیاتر ڕووبەڕووی چەند نامەیەکی شیکاریی و هەتا زانکۆیی دەبینەوە. ئەمە بۆچی وایە؟*

–برنییت: من باوەڕم وانییە کە چۆنێتی دراماتیکی کەمتر دەبێتەوە. مەسەلەکە ئەوەیە کە ئەو تەنز و خۆگێل کردن و مەجاز و وشەکاریی و باقی ئەو ڕێو شوێنە هونەرییانەی کە لە بەرهەمەکانی پێشوودا بۆ ڕەسم کردنی روخساری ئەو کەسانە تەرخان دەکرا کە لە دیالۆگەکاندا بەشداری دەکەن، لێرەدا بۆ ئەوە تەرخان دەکرێ کە ئەندێشە و بەڵگەهێنانەوەکان بە شێوەیەکی زیندووتر بخاتە ڕوو. زۆر کات، بەڵگە و ئەندێشەکان ئەوانەن کە لە نووسینەکانی پێشووی ئەفلاتون، وەکو کۆمار یان فایدۆن، دا پێی ئاشنا بووین. سەرسووڕهێنەرترین مەسەلە لای ئەفلاتون ئەوەیە کە پەیوەندیی لەگەڵ خوێنەرەکانیدا دروست دەکات بە شێوەیەك کە لە هەر نووسینێکدا دەتوانێت بەڕاستی ئەوە بزانێت کە

خوێنەر بەرهەمەکانی پێشتری ئەوی خوێندۆتەوە. پێم وایە لە مێژوودا ئەفلاتون یەکەم کەسە کە لەم کارەدا سەرکەوتنی بەدەست هێنا بێ. ئەفلاتون ئەو پەیوەندییە بەکار دەهێنێ بۆ ئەوەی بتوانێ بە تەلمیح هەندێ شت بڵێ و شەپۆل و دەنگدانەوەیەکی زیاتر بە ڕیتمی قسەکەی بدات و دەیەوێ بە پێچەوانەی چاوەڕوانی خوێنەرەوە شتێك بڵێت و خوێنەر غافڵگیر بکات. بەڵام لە جێگایەکدا بە باشترین شێوەو بە کارامەیی تەواوەوە ئەم شێوەیە بەکاردەهێنێ کە بیەوێ لەبەرچاوی هەمووان بۆ خۆی لە مەسەلەکە بکۆڵێتەوەو بە دڵنیاییەوە لەوەی کە خوێنەر بە ئەندێشەکانی پێشووی ئەو ئاشنایە، بیەوێ دووبارە لەو ئەندێشانە بکۆڵێتەوەو بە تەلمیح بە خوێنەر بڵێ: "ئەوەندەش بۆ فایدۆن و کۆمار خۆت مەبوورێنەرەوە. ڕاستە زۆر جوان بوون، بەڵام ئەو ڕاستیانەی لەوێدا وتومن - ئەگەر بکرێ ناویان بنرێ ڕاستی - ئەگەر لە بەرامبەر ڕەخنەدا قابیلی داکۆکی لێکردن نەبن بۆ منیش و بۆ تۆش بەهایان نابێت. ڕەنگە لە بنەڕەتدا هیچیان ڕاستیان لە خۆ نەگرتبێ. ڕەنگە هەموویان هەڵەبن. کەواتە بیەڵە با هەندێ لەوانە هەڵبژێرین و بەڕاستی بیخەینە بەر ڕەخنە و شیکردنەوەیەکی توندەوە.

***+ماگی: ئەگەر بتویستایە یەکێك لە دیالۆگەکانی قۆناغی کۆتایی لەوانی دیکە جیا بکەیتەوە، کامیانت هەڵدەبژارد؟***

-برنییت: باشترین نموونە نامەی - پارمنیدس -ە کە تیایدا وەزعی سوکرات پێچەوانە دەبێتەوە. سوکرات لێرەدا دیسان تیۆری نموونە شیدەکاتەوە کە پێشان لە فایدۆندا باسی کردووە. بێگومان تیۆرەکە هەر تیۆرەکەی فایدۆنە، نەك تەنها لە ڕووی ناوەڕۆکەوە، بەڵکو هەروەها لە ڕووی دەنگدانەوەی وشەکانی فایدۆنیشەوە، لەم دیالۆگەدا ئەفلاتون بە ئاشکرا دەیەوێ خوێنەرانی دەستنیشان بکات و بە سەراسیمەییەوە بە خۆی بڵێ "سەیرە! ئەمە هەر سوکراتەکەی فایدۆنە کە ئەم جارە لە جیاتی ئەوەی پرسیار بکات، دەبێ وەڵام بداتەوە" ئەو کەسەی کە لەم دیالۆگەدا بە پرسیار سوکرات دادەگرێتەوە، پارمنیدسی پیرە کە بە زنجیرەیەك ڕەخنە و نارەزایی و دژواری دروست کردن وەها تیۆری نموونەکەی سوکرات دادەگرێتەوە کە زۆر لە فەیلەسوفەکانی دوای ئەرستۆ باوەڕیان بەوە هێناوە کە ئەو ڕەخنانە ڕوخێنەرن. بەڵام ئەفلاتون وەڵامی مەسەلەکە بە ئێمە ناڵێ. لە زمانی پارمنیدسەوە دژوارییەکان باس دەکات و لێدەگەرێ ئێمە خۆمان بڕیار بدەین کە ئایا نارەزاییەکان هەن یان نین، ئەگەر هەن ئێمە چۆن مامەڵە لەگەڵ تیۆری نموونەدا بکەین.

***+ماگی: ئەو نامەیەی کە هەندێك پێیان وایە لە دوا قۆناغدا نووسراوە و هەندێکی تر باوەڕیان وایە پەیوەندی بە قۆناغی ناوەڕاستەوە هەیە، (تیمایوس)ە کە لەگەڵ تەواوی دیالۆگەکاندا جیاوازی هەیە، یەکێ لە جیاوازییەکان لەو ڕووەوەیە کە بابەتەکەی زیاتر جیهان ناسی و زانستە تا فەلسەفە، بەڵام بە شێوەیەکی سەرەکی لەبەرئەوەیە کە ئەفسانەیەکی شاعیرانەی لە خۆ گرتووە دەربارەی خوڵقاندن کە لە (سفر تکوین)ی کتێبی پیرۆز دەچێ. لە بنەڕەتدا ئەفلاتون بۆچی شتێکی وای نووسیوە؟ مەبەستم لەم پرسیارە زیاتر ئەوەیە کە ئایا، بەڕای ئێوە، کە بەڕاستی ئەفلاتون کوتومت باوەڕی بەو ئەفسانەیە هەیە کە دەربارەی خوڵقاندن دروست کراوە؟ واتە بەهەمان شێوەی کە دەبێ وایدابنێین جولەکە کۆنەکان باوەڕیان بە (سفر تکوین) هەبوو؟***

-برنییت: بیروبۆچوونی خودی خۆم ئەوەیە کە ئەفلاتون لەسەدا سەد باوەڕی بە (سفر تکوین)

نەبووە. ئەم مەسەلەیە لە سەردەمی کۆندا جێگای مشتومڕ و ناکۆکی بوو، نزیکترین یاران و هاوکارانی ئەفلاتون قسەیان ئەوە بوو کە حیکایەتی تیمایوس سەبارەت بەو دروستکەرەی کە ڕەگەز پەرێشانی و بێ سەرەو بەرەیی دەگۆڕێ بە نیزام، لە ڕاستیدا شیکردنەوەی بیرو بۆچوونەکانی ئەفلاتونە دەربارەی بنەمای بنچینەیی گەردون، بە زمانێکی ئەوپەڕی زیندوو پڕ وێنەوە. بۆچوونی ئەفلاتون ئەوە بوو کە سەراپای دنیا بەرهەمی ڕێکخستنی پاشا گەردانیە و مەبەستی لە نەزم، بە پلەی یەکەم نەزمی بیرکاری بوو، هەڵبەتە ئەمە لەگەڵ (سفر تکوین)دا جیاوازی زۆرە. خودای خولقێنەر لای ئەفلاتون عەقڵێکی بیرکارییە کە لەسەر جیهان ئیش دەکات.

*+ماگی: بەم پێیە، ئەوەی لەم نامەیەدا دەیخوێنینەوە بریتییە لە دەربڕینی ئەو مەسەلەیەی کە جیهان کە لە کۆنترین ڕۆژگارەوە بۆ هەموو مرۆڤێکی خاوەن بیر لە ناو پەردەی نهێنیدا خۆی حەشارداوە، لە ڕاستیدا بەهێزی عەقڵ قابیلی لێتێگەیشتنە؟ لە کۆتاییدا ئەوەیە کە ئەم مەسەلەیە بە زمانی شاعیرانە بەیان کراوە؟*

—برنییت: ڕێك وایە. هەڵبەتە مەسەلەیەکی وا بەو گشتێتییە کە لەسەر ئەوە بنیات نرابێ کە سەراپای گەردون بەرهەمی ڕێکخستنی پاشا گەردانییە، شتێك نییە کە نە بە شێوەیەکی گشتی قابیلی سەلماندن بێ نە بە شێوەیەکی تایبەتی و بەش بەش. ئەفلاتون بە تەواوی ئاگاداری ئەم خاڵە بوو، هەر بۆیە، وێڕای لایەنەکانی تر، مەسەلەکەی لە بەرگی ئەفسانەدا تەرح کرد. لەگەڵ ئەوەشدا، بۆ لێکۆڵینەوە لە شتێك ئیلهامی لەو ئەفسانەیە وەرگرت کە زۆر بە جدی لێکی دەدایەوە، واتە ئەو بەرنامە توێژینەوەییەی کە دیارترین بیرکاری زانانی سەردەمی خۆی لە ئەکادیمیاکەیدا بۆ جێبەجێ کردنی دامەزراند. هەر پێشکەوتنێ لە ئەندازیاریی و ئەستێرە ناسی بیرکاریی و هارمۆنیك لە بیرکاریدا و هەتا هەر پێشکەوتنێ لەو تیۆرە پزیشکییەدا کە نەخۆشی و تەندروستی ئەنجامی هاوسەنگی و گونجاوین لە بەشەکانی میزاجدا، هەریەکە لەم هەنگاوانە بەڵگەیەکی ترن بۆ سەلماندنی ئەوەی کە ئەفلاتون بایەخی پێدەدا، یەعنی ئەو بیرەی کە دەبێ لە نەزم و هاوئاهەنگی و گونجاویی بیرکارییدا بۆ هۆی شتەکان بگەڕێین. وێڕای ئەمەش، لەوێوە کە ئەم هاوئاهەنگی و گونجاوییە بیرکاریانە بەرای ئەفلاتون باشترین نموونەی چاکی و جوانین، بەرنامەی توێژینەوەیی ئەفلاتون بە شێوەیەك بەرنامەڕێژی کراوە کە نیشانی بدات فاکتەری بنچینەیی لە دۆزینەوەی هۆکار لە سەراپای جیهاندا، بریتییە لە چاکی و جوانی.

*+ماگی: ئەم مەسەلەیە لەگەڵ کۆماردا چۆن دێتەوە؟ لەبەرئەوە دەپرسم کە یەکێ لەو خاڵانەی خۆت چەند دەقەیەك بەر لە ئێستا لە باسی کۆماردا بە جوانی روونت کردەوە ئەوە بوو کە کۆمار بە مەعنایەك فەلسەفەیەکی کامڵی لە خۆگرتووە. ئەگەر وایە، ئەوەی ئەفلاتون لە تیمایوسدا دەیڵێت چۆن لەگەڵ کۆماردا دێتەوە؟*

—برنییت: بەڕای من، لەگەڵ کۆماریشدا کوتومت دێتەوە. لە کۆماردا هێڵە سەرەکیەکانی بەرنامەیەکی زانستی - و لە قۆناغی یەکەمدا بەرنامەیەکی زانستی بیرکاریی - بۆ تێگەیشتن لە جیهان ڕەسم کراوە. لە تیمایوسدا ئەفلاتون دەست بە جێبەجێکردنی ئەم بەرنامەیە و جێبەجێکردنی پشکەکەی خۆی دەکات. ئەوەت لە یاد نەچێ کە هەم لە سەردەمی کۆن و هەم تا ماوەیەکی زۆر دوای ئەوە، کاتێ خەڵك دەیانەویست فەلسەفەی ئەفلاتون لە زمانی خۆیەوە بخوێننەوە، دەگەڕانەوە بۆ

تیمایوس و تا ڕادەیەك تا ئەم دواییانە، تیمایوس بە بەرهەمی سەرەکی ئەو دەزانرا نەك کۆمار.

*+ماگی: بەم پێیە، جیهانناسی و ئەو زانستەی کە لە تیمایوسدا هاتووە، بەر لەوەی بە کردەوە باس بکرێ و بخەملێ، لە مەیدانی ئیمکاندا لە کۆماردا پێشبینی کراوە؟*

-برنییت: بەڵێ لە بەشی بەرایی دیالۆگی تیمایوسدا، وەکو باسێ دەناسینرێ کە لە رووی دراماتیکییەوە، دریژەی باسی کۆمارە. ئەو بیرکاریزانانەی کە ئەفلاتون لە ئەکادیمیاکەیدا کۆی کردبوونەوە، پیشنیازەکانی کۆمار - یان بە قسەی من، بەرنامەی تویژینەوەییان - بۆ پیشخستنی زانستە بیرکارییەکان جیبەجێ کردبوو بۆ ئەوەی دەسەلات و سنووری نەزمی بیرکاریی جیگیر بکەن. زۆر لە سەرکەوتنە گەورەکانی یۆنانیەکان لە زانستی بیرکاریدا تا سەردەمی بەتلیمۆس، لە هەوڵ و کۆششی ئەو بیرکاریزانانەوە سەرچاوەی گرتبوو. گرووپی بەتلیمۆسی ئەنجامی کۆتایی ئەو تویژینەوانەیە کە بەپیی پیشنیازەکانی ئەفلاتون سەبارەت بە زانستەکان لە ئەکادیمیاکەیدا ئەنجام دەدرا. لەویوە کە نەزمی بیرکاری گوزارشتی تایبەتی ئەفلاتونە بۆ چاکە و جوانی، ئەو زانستانەی باسکران لە کاتیکدا کە ئەوە نیشان دەدەن جیهان لە رووی بیرکارییەوە قابیلی لێ تیگەیشتنە، زانستی بەهاکانیش لە کارەکە دینە دەرێ. بەم پییە، لایەنە فەلسەفیەکانی کۆمار - واتە هەموو ئەو شتانەی کە فەرمانرەوای دانا دەبێ لییان تێ بگات - لە هەمان کاتدا بنەمایەك دەهیننە ئاراوە بۆ شیوازیکی تازەی سیاسەت رادیکاڵ. ئەوەی کە فەرمانرەواکان دەبێ بەر لە فەرمانرەوایی کردن هەموومانی پێ فیر بکەن، ئەو زانستانەیە کە بابەتی بەخشینیان هەم بەهاکان و بوونە.

*+ماگی: دیارە کە پسپۆریی تۆ لە یەکێك لە دیالۆگەکانی دوا قۆناغ، واتە لە (سیای تەتوس)دایە. چۆن ئەو بایەخە تایبەتیەت بەو بابەتە لا دروست بووە؟*

-برنییت: لەبەر ئەوەی سیای تەتوس بەرای من لە ڕادەبەدەر هەژێنەرە و هەرگیز نەمتوانیووە بگەمە کۆتاییەکەی و هەر جارێ کە دووبارە دەچمەوە سەری و دەبینم چەند شتێکی تر هەن کە پێشان نەمدۆزیوونەتەوە. ئەمە هەمان ئەو نامەیەیە کە لایب نیتس تەرجومەی کردووە و بارکلی -ش زۆر شتی لە بارەیەوە نووسیوە و ویتگنشتاین وەکو سەرچاوە بەکاری هێناوە. نامەیەکە کە هەمیشە بۆ فەیلەسوفەکان بزوێنەر و هەژێنەر بووە.

*ماگی: دەربارەی چییە؟*

-برنییت: ئەو پرسیارەی کە دەکرێ ئەوەیە کە "زانین چییە؟" سیای تەتوس -یش دیالۆگێکە بە هەمان شێواز و سیاقی دیالۆگی سوکراتی کە لە دیالۆگەکانی پێشوودا هەبوو، بە کورتی بە پێودانێکی گەورەتر و فراوانتر سێ وەڵام پێشنیاز دەکرێ: زانین واتە هەستکردنی حسی، زانین واتە داوەریی راستگۆ، زانین واتە داوەریی راستگۆ لەگەڵ باسکردنی هۆکاردا. هەموو ئەم وەڵامانە یەکەیەکە بە شێوازی سوکرات ڕەت دەکرێنەوە. ئەگەرچی هەتا لە کۆتاییشدا پێمان ناوترێ کە ئەفلاتون خۆی پێیوایە زانین چییە، بەڵام دەبینین دەربارەی مەسەلەکە و لق و پۆپەکانی ئەوەندە شتی تازە فێر بووین کە هەست دەکەین زانیاریمان لەو بارەیەوە دەوڵەمەندتر بووە نەك هەژارتر.

*+ماگی: هەڵبەتە هەتا ئەمرۆ یەکدەنگی سەبارەت بە ماهیەتی وردی زانین وجودی نییە، بەڵام پێم وایە بۆچوونێك هەیە کە تەقریبەن هەمووان قبوڵیانە زیاتر لەوەی کە تۆ وتت نزیك دەبێتەوە،*

*ئەویش ئەوەیە کە ئەو داوەرییانەی کە پشتگیریی لە زانین یان مەعریفە دەکەن دەبێ تا ئەوپەڕی لە دەرککردنی حسیەوە وەرگیرابن بەڵام لە ناوەڕۆکدا دەبێ بتوانین بەپێی عەقڵیش ئەو داوەرییانە ئاراستە بکەین.*

-برنییت: ئەها، تۆ هەر ئێستا ڕێگەچارەیەکی سەرنجڕاکێشت دۆزییەوە بۆ ئەو کێشەیەکی کە لە کۆتایی سیای تەتوسدا، لە دوای ڕەتکردنەوەی هەموو وەڵامەکان، هێشتا وەکو خۆی ماوەتەوە. سوکرات هەر سێ تێزەکەی بەتاڵ کردۆتەوە: یەکەمیان ئەوەیە کە زانین هەر دەرککردنی حسیە، دووەمیان ئەوەیە کە داوەریی ڕاستگۆیە، سێیەمیان ئەوەیە کە داوەریی ڕاستگۆیە لەگەڵ باسکردنی هۆکاردا. ئێستا تۆ ڕای خۆت دەردەبڕی کە ڕەنگە بە کۆکردنەوەی بنەماکانی هەرسێ پێناسەکە لە پێناسەیەکدا، بکرێ زانین پێناسە بکرێ و ڕەنگە پێناسەی زانین، لە مەعریفە زانیەوە بەدەست بێت. وەڵامی تۆ بۆ ئەم بەشەی نامەکە، وەڵامێکی زۆر شایستەیە، واتە ئەوەی کە کەسێك لەسەر بنەمای ئەوەی کە لە خودی نامەکەوە فێری بووە، بە شێوەیەکی سەربەخۆ پێناسەیەك پێشنیاز دەکات.

*+ماگی: بەر لە تەواوبوونی ئەم باسە، دەبێ دەربارەی مانەوەی ئەندێشەکانی ئەفلاتون لە قۆناغەکانی دوایشدا شتێك بڵێین، چونکە بێگومان فەلسەفەکەی ئەو لە ڕووی نفوز و کاریگەرییەوە لە سەرانسەری مێژوو لە هیچ فەلسەفەیەکی دیکە کەمتر نەبووە. دەکرێ ئاماژەیەك بە هێڵە سەرەکیەکانی کاریگەریی ئەفلاتون بکەیت؟*

-برنییت: نابێ ئەوەمان لەیاد بچێ کە لە دنیای کۆندا دوو فەلسەفەی دژ بە ڕێبازی مادی یان (ماتریالیزم) هەبوون. خودی ڕێبازی مادی بەشێوەی ئەتۆمیزم یان (باوەڕ گەردیلەی لە بەشکردن نەهاتوو)ی لێهات کە دیموکریتوس و ئەپیکوروس هەردووکیان باوەڕیان پێی هەبوو. ئەفلاتون و ئەرستۆ هەردوکیان فەیلەسوفی دژی مادین و دژی ئەو بۆچوونەن کە هەموو شتێ - لە ژیان و ڕێکخستن و دەروون و شارستانیەتەوە بیگرە هەتا هونەر و سروشت - دەکرێ بە ئەنجامی جووڵەی گەردیلە مادییەکان بزانرێن کە تەنها یاساکانی جووڵە و سروشت خۆیان بەسەریاندا زاڵە. دژایەتی ئەرستۆ بەڕادەیەك توند و قووڵە کە هەڵکردنی فەلسەفەکەی لەگەڵ زانستی نوێدا کە ئەو هەموو بابەتەی دەربارەی ئەتۆم و جووڵەی گەردیلە مادیەکان و شتی لەو بابەتەی تێدا هاتووە، زۆر دژوارە. بە ڕێکەوت نەبوو کە زانستی نوێ لە سەرەتای کارکردنیدا یەکەم دەبوو فەلسەفەکەی ئەرستۆ کە لە سەدەکانی ناوەڕاستدا باڵا دەست بوو لەسەر ڕێگەی خۆی ڕامالێ. بە پێچەوانەی ئەمەوە سازاندنی فەلسەفەکەی ئەفلاتون لەگەڵ زانستی نوێدا ئاسانترە و ، بەڕای من، فەلسەفەکەی ئەو بەو هۆیەوە توانی لە دوای مردنی فەلسەفەکەی، دیسان لە سەردەمی ڕێنیسانس و پاش ئەوەش درێژە بە ژیانی خۆی بدات. ئەگەر یەکێك بیەوێ ئەوە نیشانبدات چۆن دەتوانرێ بەها زانستی و ڕۆحانیەکان پێکەوە بسازێنرێن، هەم دەتوانێ فەلسەفەکەی ئەفلاتون بەکاربێنێ و هەم بکەوێتە ژێر کاریگەرێتیەکەیەوە. ئەگەر یەکێك بیەوێ بەو شێوەیەی کە شایانێتی حەق بە ئاڵۆزیی و بەرزی و نزمیەکان بدات و باوەڕی بەوە هەبێ کە ڕێبازی مادی مەسەلەکان زۆر بە سادەیی دەخاتە ڕوو، ئەو فەیلەسوفەی کە دەبێ بۆ تەیارکردنی ئامراز و پێویستیەکان و یارمەتی لێ داواکردن بگەڕێتەوە بۆ لای ئەفلاتون.

*+ماگی: بەلای ئێمەوە کە خەڵکانی سەدەی بیستەمین، بە تایبەتی ئەو ڕاستیە ڕەنگ و بۆی*

***هاوچەرخی پێوەیە کە فەلسەفەکەی ئەفلاتون لەو بەرنامەیەدا کە بۆ تێگەیشتن لە جیهان رێکیخستووە، گرنگترین پایە بۆ فیزیای بیرکاری تەرخان دەکات.***

**-برنییت: بەڵێ، وایە. ئەوەی لە زانستی نوێدا چۆتە قۆناغی پراکتیکیەوە هەر ئەو شتەیە کە ئەفلاتون ئارەزووی ئەنجامدانی دەکرد. بەم پێیە، لە نێوان ئەو دوانەدا، جۆرێك لە هاوخەمی و سازان هەیە کە سەبارەت بە فەلسەفەکەی ئەرستۆ ڕاست نییە.**

## پەراوێزەکان

**1-*Apology* لە وەرگێڕانەکەی (لطفی)دا ناوی ئەم نامەیە بە تەلەفوزە فەرەنسییەکەی واتە (ئەپۆلۆژی) هاتووە. جگە لە (کۆمار و خوان) لەم کتێبەدا ناوی نامەکانی ترمان بە تەلەفوزە ئەسڵیە یۆنانیەکەی هێناوە. بۆ ئاگاداریی لە جیاوازی شێوەی نووسینی ئێمە و (لطفی) بڕوانە: کارل پوپر، جامعه باز و دشمنان ان، ترجمه عزت الله فولادوند، ج*1* ، ص*61-161* (و.فارسی).**

**2-*gadfly* ئاماژەیەکە بۆ ئەو باسەی کە سوکرات لە کاتێکدا بە تۆمەتی خراپ کردنی لاوان ڕاپێچی دادگا دەکرێ، بۆ بەرگریکردن لە خۆی لە دادگادا بە ئەسینایییەکان دەڵێت ئێوەی خەڵکی ئەم شارە وەکو ئەسپێکی تەمەڵ وان بۆ ئەوەی بکەونە ڕێ پێویستتان بە مێشەکەرانەیەك هەیە بۆ ئەوەی جار بە جارێ پێتانەوە بدات، من وەکو ئەو مێشەکەرانەیە وابووم کە پێوەم دەدان و هانم دەدان بۆئەوەی بیر بکەنەوە، ئێستا ئەگەر من بکوژن، کەسێکی تری وەکو منتان دەستناکەوێ. (و. فارسی).**

**3-نموونەکان (مثل) کۆیە و تاکەکەی نموونە (مثال)ە بە ئینگلیزی *Theory of Forms* یان *Theory of Ideas* پێدەوترێ (و. فارسی).**

## سەرچاوە

**ئەم بابەتە بەشێکە لە کتێبی (فلاسفه بزرگ، اشنایی با فلسفه غرب) نووسینی برایان ماگی - وەرگێڕانی بۆ فارسی عزت الله فولادوند چاپ دوم *1377* - لاپەڕە *23-50*.**

# گفتوگۆیەك لەگەڵ د. بورهان غلیون

## پێویست ناکات عەقڵی ڕەخنەگرانە وەك جۆرێك لە خۆ و ئەوانی دیکە بریندارکردن تێبگەین

ڕەزا الملولي سازیداوە
لە عەرەبییەوە: هەڵکەوت عەبدوڵلا

### هاوڵاتیبوون و پێشکەوتن

□ لەکتێبی "تیرۆری ئەقڵ"دا دەڵێیت یەکێك لە ڕواڵەتەکانی تەنگوچەڵەمەکە ئەوەیە ئاخاوتنی هەمیشەیی دەربارەی پێشکەوتن، ئازادیو بوژانەوە لەناوچووەو جۆرێك لە باسکردنی بێکۆتایی سەبارەت بە پاشکەوتوویی و میکانیزمەکانی جێیگرتۆتەوە. چۆن بتوانین باسی پێشکەوتنو ئەو مرۆڤە بکەین کە لە ڕوی زانستییەوە نەگەیشتۆتە ئاستی وەرگرتنی نازناوی هاوڵاتی و ئێستا خۆی ڕەتدەکاتەوە، چونکە ڕێگەی خۆدروستکردنی نییە؟

- تۆ مەسەلەیەکی زۆر گەورە دەوروژێنی، ئەویش مەسەلەی هاوڵاتیبوونە، کە گرێدراوی مەسەلەی دیموکراسی و پێکهێنانی دەسەڵاتە. لەڕاستیدا گرێدراوی زۆر مەسەلەیە کە جڵەوی مێژووی سەرهەڵدانی دەوڵەتو پێکهاتنی چەمکی دەسەلاتیان کردوە لە کۆمەڵگەی نوێی عەرەبدا... و هەتاکو ئێستاش لەگەڵ ئاسەوارە خراپەکانیدا دەژین.

پێموایە پێشکەوتن یەکێکە لە سیماکانی مێژوو و میللەتەکانی ئێمەش هەنگاویان ڕوەو پێشکەوتن هەڵهێناوە، ئەگەرچی هێشتا سەرسەم دەدەن بۆ دۆزینەوەی ڕێگەیەکی گونجاو بۆ پاراستنی هاوسەنگیی مادی، دەروونی، کۆمەڵایەتی و ڕۆشنبیریی پێویست.

دەشێ بوترێ، سەرەتای ئەم سەرسمدانە دەگەڕێتەوە بۆ سەدەی ڕابردوو... بەڵام بەو مانایە نییە پێش سەدەی ڕابردوو پێشکەوتن لەگۆڕێبوە، بەڵکو هێماکردنە بۆ هوشیاری بەرامبەر بە گرنگی کارکردن لەپێناو پێشکەوتنو پێویستی ڕەتکردنی

دابونەریت و شەکەتکارییە تەقلیدییەکانی سەدەی ڕابردوو. ئا لەو کاتەوە تەنگوچەڵەمەکە ئاشکرابوو؛ تەنگوچەڵەمەی گەڕان بەدوای ڕێگەیەکی تایبەتی پێشکەوتندا.

دەبێ بڵێین مێژووی هاوچەرخی خۆمان بەلاوە گرنگە، چونکە ئەوە بنچینەییە بۆ دامەزراندنی چەمکی هاوڵاتێبوون و بناغەکانی کۆمەڵگەیەکی نوێ. مێژووی ئەم ڕۆژگارە هاوچەرخەش بە سێ قۆناغدا تێپەڕیوە:

قۆناغی یەکەم ئەوەیە کە بەناوی ڕێنسانسەوە ناسراوەو لە ڕاستیدا قۆناغی "نوێکردنەوەی ئیسلامی"یە. واتە پیاوانی وەك محمد عبده، ئەفغانی و دەیانی دیکە لە خۆرئاواو خۆرهەلاتی نیشتمانی عەرەب بەشداریانکرد لە دانانی بیرۆکەیەکی جەوهەریدا، ئەویش ئەوەیە کە نوێکردنەوە پێویستەو لەنێو نەریتە ڕۆشنبیرییەکانەوە دەستپێدەکات، وەك نوێکردنەوەی فیکرو فیقهی ئیسلامی و نوێکردنەوەی چەمکەکانمان سەبارەت بە دەوڵەت و دەسەلات لە ئیسلامدا... لێرەدا ئەو ڕەخنە توندوتیژە لەیادناکەین کە ئاڕاستەی ئەو نەریتە سوڵتانیە زۆرداره کرا کە بەناوی ئیسلامەوە لە وڵاتە عەرەبییەکان باڵادەستبوو... گرنگترین کتێبەکان لەم چوارچێوەیەدا ڕەخنەی عبدولرەحمان کەواکبی بوو لە زۆرداری لە کتێبی "سروشتەکانی ئیستیبداد"دا و ڕەخنەی عەلی عەبدولڕەزاق لە چەمکی ئەو خیلافەتەی لە سەردەمی عوسمانیدا بەردەوامبوو، هەروەها لە سەروەریی چەمکی دەسەلاتی ملهوڕیی زۆردارانە.

ئەم فیکرە نوێکارە تۆوی یەکەمی چاند لەپێناو خولقاندنی هوشیارییەکی ڕاستەقینە دەربارەی حەتمیبوونی پێشکەوتن و بەرەنگاربوونەوەی پاشکەوتوویی لە هەموو بوارەکاندا. لێرەدا دەستەبژێرێکی نوێ خولقا کە پێیوابوو داهاتووی جیهانی عەرەب گرێدراوی پێداچوونەوەی گشت بەڵگەنەویستە کۆنەکانە.

بەداخەوە، ئەم قۆناغە بەردەوام نەبوو، چونکە دەستێوەردانی بێگانەو کۆلۆنیالیزم، لە سەرەتای سەدەوە، لە ڕۆژهەلات و سەدەی پێشووەوە لە مەغریب، ئەم بزووتنەوەیەی لە ناوەڕاستی ڕێگەدا ڕاوەستاند و دەرفەتی گەشەکردنی پێنەدا تا ببێتە تەوەرێك بۆ دامەزراندنەوەی تێکڕای سیستەمی عەرەبی لەسەر ئاستی سیاسی و ڕۆشنبیری... ئەم ئەڵقەیە لە سەرەتاوە تێکشکێنراو و قۆناغێکی تر سەریهەڵدا، ئەویش قۆناغی بیرکردنەوە بوو دەربارەی ئەوەی دەشێ دامەزراندنەوەی سیستەمی عەرەبی لە ڕێگەی ئایدیۆلۆژیایەکی ناسیۆنالیستانەوە بێ.

لەو بڕوایەدام ئایدیۆلۆژیای ناسیۆنالیزم، پاش ئایدیۆلۆژیای نوێکردنەوەی ئیسلامی، ڕۆڵێکی بینی لە خولقاندنی هوشیارییەکی نوێ لای عەرەب، بەرامبەر بە ناسنامەی جیاکارەیان لەنێو مێژووی ئیسلامدا.

ناسیونالیزم لە ئەنجامی نەتەوە ناوچەیییەکان (میسری، سوری و فیرعەونی) گەشەیکرد بۆ بزووتنەوەی ناسیۆنالیزمی عەرەب کە لە سەردەمی جەمال عبدولناسردا پانتاییەکی گەورەی داگیرکرد و هاوکات بوو لەگەڵ گەشەکردنی بزووتنەوەی نیشتمانپەروەری عەرەب و ئەو هاوکارییەی لەپێناو سەربەخۆیی لە وڵاتە عەرەبییەکان هەبوو.

ئەو ساتە ناسیۆنالیزم، پاش نەمانی باڵادەستیی سیاسی، بوە دەرکەوتەیەکی ڕۆشنبیریی گرنگ، ئەویش ناسنامەی عەرەبی بوو، چونکە ئەم ناسنامەیە لای تێکڕای میللەتە عەرەبەکان چەسپی.

پێموایه ئەمه یەکێکه له دەستکەوته گەورەکان له مێژووی نوێی عەرەبدا. ئەوەبوو ئەم ئاقاره ناسیۆنالیستیه ڕوەو تەکاندان به وڵاته عەرەبیەکان و بۆ نزیکبوونەوەو تێوەچوون و یەکترتەواوکردن گەشەیکرد. ئەمەش هەنگاوێکی بنچینەیی و جەوهەریی بوو لەپێناو هەر پەرەسەندنێکی دواییدا، واته لەپێناو به دەستەوەگرتنی یەکێك له جڵەوەکانی پێشکەوتن.

چرکەساتی سێیەم له مێژووی هاوچەرخی عەرەبدا، که هۆشمەندیی ئێمەی پێکهێنا، چرکەساتی وێناکردنی ئەو دادپەروەرییه کۆمەڵایەتیه بوو که تا ڕادەیەکی زۆر سروشتی تیۆره سوسیالیستیەکانی وەرگرتبوو و وەك ئاقاری سیاسیی باو و هەندێ جاریش وەك ڕژێم زاڵبوو بەسەر زۆربەی وڵاتەکانماندا. ئەم چرکەساته کاتێك کۆتاییهات، که ڕژێمەکانی بانگەشەیان بۆ سۆسیالیزم دەکرد، گۆڕان بۆ ڕژێمی زۆردار و هەمان ئامرازه تەقلیدییەکانی فەرمانڕەوایەتیان هێنایەوەئاراو لەبری ئەوەی دەرفەتی ڕاستەقینه بخوڵقێنن لەپێناو دادپەروەری کۆمەڵایەتیدا، جیاوازیی نێوان چینەکان و تاکەکانی کۆمەڵگەیان قوڵکردەوە.

ئەمه ئەو چرکەساتانه بوون که مێژووی ئێمەیان ڕەنگکردبوو و پێموایه دنیای ئیمڕۆی عەرەب بەڕێوەیه بۆ ڕەتکردنی ئەم چاخەو چوونه نێو چاخێکی نوێوە. لێرەدا چەندین ئاقاری ڕیشەیی هەن که کاردەکەن بۆ ڕەتکردنی ئەم چاخەو ئەو تەنگوچەڵەمانەی دروستیکردوون.

گەشەکردنێکی گەوره له چەمکی دیموکراسی و مافی مرۆڤدا ڕوویداوە، ئەمەش یەکێکه له دەستکەوته نوێ و گەورەکانی هاتۆته نێو هوشیاریی سیاسیی ئێمەوە... با وەبیر خۆمانی بهێنینەوە، پێش چەندین ساڵ بیرۆکەی مافی مرۆڤ و دیموکراسی بابەتێکی دەربڕاونەبوو و هیچ بوارێك بۆ ئاخاوتن دەربارەی دەوڵەتی یاساو ئازادییه دیموکراسیەکان نەبوو، هەروەها مەحاڵبوو باس له دەستنیشانکردنی ڕۆڵی دەوڵەت و کۆمەڵگەی شارستانی (مدنی) بکرێت...

هەموو ئەو فیکره نوێیانه ئەنجامی ئەزموونی نێگەتیڤانەو شکستەخواردنی ڕژێمه دیکتاتۆرییەکان هاتنەئاراوە... ئەوەی گرنگه، کۆمەڵگەی ئێمه ئەم خاڵەی یەکالاکردۆتەوەو دیموکراسی — ئەگەر نەشهاتبێتەدی — داخوازییەك و قیبلەنمایەکه ئاڕاستەو ڕەفتارمان دەکات و بەشێکیشه له بیرۆکەی هاوڵاتیبوون.

خاڵی دوەم که عەرەب پاش ململانێیەکی زۆر یەکالایکردۆتەوە، بابەتی ناسیۆنالیزمە... له چاخی پێشوودا ناسیۆنالیزم مەسەلەی بانگەوازیکردن بوو، ناکۆکی گەوره لەنێوان ناسیۆنالیزمی ناوچەیی و ناسیۆنالیزمی عەرەبیدا هەبوو. هەموو ئاگاداری مێژوویی ململانێی نێوان دەوڵەته عەرەبیەکان و ئەو نەتەوانەین که لەسەر ئاستی نیشتمانەکەمان سەریانهەڵداوە... ڕۆژگار ئەم مەسەلەیەی جێهێشتووەو عەرەب وابیردەکەنەوە تاقه جەستەیەکی گرنگ هەیە، ئەویش ناوی جەستەی عەرەبه. لەناو ئەم جەستەیەشدا تایبەتمەندیی واهەن که ناکرێ پیشتگوێخرێن. ئەم تایبەتمەندیانەش ناکرێ گرنگی ئەو تێوەچوونه ڕەتبکەنەوە که مەرجی ڕاستەقینەی مادییه بۆ پەرەسەندنی هەمەلایەن. هەروەها بیرکردنەوە له یەکگرتنی عەرەبی، جا به شێوەی یەکگرتنێکی کامڵ بێت لەسەرەتادا یاخود لەسەر شێوەی فراکسیۆنی هەرێمی بێت ڕوەو یەکگرتنی گشتی هەنگاوبنێ، دەستکەوتێکی سیاسیی گرنگه، ئەنجامی

وردبوونەوەی فیکری ناسیۆنالیستانە ڕوویداو وەك ڕەتکەری ململانێ و ناکۆکییەکانی نێوان هەرێمایەتی و نەتەوایەتی وایە. پێموانییە ئیمڕۆ هاولاتیەکی عەرەب هەبێ هەست بە ناکۆکی نێوان نیشتمانپەروەریی ناوچەیی و نەتەوەییبوونی عەرەب بکات، ئەمەش پێچەوانەی ئەوەیە کە لە ڕابردوودا باوبوو. کەواتە نیشتمانپەروەریی ناوچەیی بەشێکە لە نیشتمانپەروەریی دایك کە نیشتمانپەروەریی عەرەبیە.

خاڵی سێیەم کە یەکالاکراوەتەوە، مەسەلەی ناسنامەیە... هاوڕاییەکی گشتی هەیە کە ڕەتکردنەوەی دەستکەوتەکانی سەردەم کارێکی قبوڵکراو و پراکتیکی نییەو ڕەتکردنەوەی ڕەگوڕیشە مێژوویی و ڕۆشنبیرییەکانی میللەتیش نائەقلانیە، چونکە مانای سڕینەوەی کەسێتی ئەم میللەتەو دانانێتی لە دۆخێکدا کە ناتوانێ بەهۆیەوە لە دەستکەوتەکانی ژیواری (حضارة) نوێ تێبگات. چونکە هاوچەرخخوازی ڕابردوو ڕەتناکاتەوەو ناکۆك نییە لەگەڵ چەسپاندنی بناغەیەکی کەلەپووری و ڕەگوڕیشەی ژیواری نەتەوە... نەتەوەکان وەك درەخت وان، هەتاکو بەرزبنەوە پێویستی زیاتریان بە ڕەگی قوڵتر هەیە لەناو خاکەکەدا.

ئەوانەی باسمکردن ئەو تەوەرە نوێیانەن کە ئەنجامی تاقیکردنەوەکانی ڕابردوو و ململانێکانی ڕوویانداوەو سەریانهەڵداوە...

## ڕابردووچێتی
## کاوێژکردن و ڕەتکردنەوەی داهێنانە

□ پێتوایە دووڕاگرتنی ناوەڕۆکە ڕەخنەییەکان لە بازنەی ئەقڵی عەرەب بە پلەی یەکەم بگەڕێتەوە بۆ سروشتی ڕابردووچێتی کە زاڵە بەسەر ڕۆشنبیریی عەرەبدا؟ هەروەها لەو بڕوایەدانین ئەو سروشتە یاریدەدەری چەسپاندنی تیخکردنمان بێت لەلایەن ڕۆشنبیریی خۆرئاواوە؟

- ڕاستە. من سروشتی ڕابردووچێتی ناودەنێم لاساییکردنەوە. هەموو کۆمەڵگەکانی بە چەندین قۆناغی ژیواری گەورەدا تێپەڕیون و گەیشتونەتە ئاستێك کە پێیانوابێ بەهۆی ئەوەی بەدەستیانهێناوە دەتوانن ڕێرەوەکە بەردەوامبکەن و لەسەر کاوێژکردنی ڕابردوو بژین. چونکە ڕابردووچێتی کاوێژکردنەو پێچەوانەی داهێنانە.

شارستانێتی عەرەب، وەکو هەموو شارستانیەکانی پێش خۆی (چینی، یۆنانی و ئەوانیتر)، چوە نێو قۆناغی کاوێژکردنەوەو پێویستی بە شۆڕشێك هەبوو لەناو خۆیداو تەقاندنەوەیەکی ڕاستەقینەی گەرەك بوو لەناو کۆمەڵگەی عەرەبدا، هەتاکو زیندوێتی خۆی بەدەستبێنێتەوەو بڕوای بە بەڵگەنەویستەکانی ڕابردوو نەمێنێ و بیر لە داهاتوو بکاتەوە.

لەکۆتایی سەدەی پێشوودا شۆڕشێکی ڕاستەقینە لەناو فیکرو هوشیاریی عەرەبدا ڕوویدا. پێموایە چاخی ڕابردوو چاخی داهێنان نەبوو، بەڵکو سروشتی ڕەخنە لەخۆگرتنی بە بەری خۆیدا کردبوو، ڕەخنەکەش زۆر توندوتیژبوو.. ئێمە خۆمان بەوە تاوانباردەکەین ڕابردووچی ماوینەتەوە، بەلام ڕاستیەکەی ئەوەیە ڕابردووچێتی کەشی گشتی زاڵبوو. لە سەدەی پێشودا و لەناو فیکری عەرەبیدا نیشانەیەکی بنچینەیی بەدیدەکرێت، ئەویش نیشانەی ڕەخنە لەخۆگرتنی توندوتیژە.

ئەم ڕەخنەیە چوارچێوەیەکی فیکری دانەمەزراند بۆ تەکاندن بە داهێنانی بەردەوام لە فیکری عەرەبدا، چونکە پەرچەکردابوو بەرامبەر ڕابردوو و بەشێکی زۆر لە بنچینە تیۆری و خولقێنەرو هاندەرەکانی لەوەوە هەڵدەهێنجا.

ئەوەشمان لەبیرنەچێ لاساییکردنەوەی ڕۆشنبیریی بالادەست، واتە ڕۆشنبیریی خۆرئاوایی، لەگۆڕێبوو. ئەو قۆناغەی خەریکە دەچینە ناویەوە، ڕزگارکردنی فیکرو هوشیاریی عەرەبە لە دوو لاساییکردنەوە:

*1*)لاساییکردنەوەی ڕابردوو، کە بریتییە لە بڕوابوون بە بەڵگەنەویستەکان و کاوێژکردنی ڕابردوو بێ ڕەتکردنەوە یاخود تێگەیشتنی بە شێوازێکی داهێنەرانە، ئەمە وێڕای ئەوەی لاساییکردنەوەی ڕابردوو چاوەکان لەئاست حەقیقەتی خودی ڕابردوودا کوێردەکات.

*2*)لاساییکردنەوەی ئەوی دیو دانانی ئەوەی لە خۆرئاواوە دێت بەشتێکی گونجاو بۆ ئێمە. ئەمەش مانای نەبوونی تێڕوانینی ڕەخنەگرانەیە بەرامبەر بە فیکری نوێو دەرهاویشتەکانی ژیواری نوێ. ئەگەر فیکرو هوشیاریی عەرەب لەم لاساییکردنەوە ڕزگاریانبێ، ئەو کاتە هوشیارییەکی ئازاد لەگۆڕێدەبێ... داهێنان گرێدراوی هوشیاریی ئازادی پشکنەری ڕەخنەگرانەیە، کە گوێ بە بەڵگەنەویستو نەگۆڕەکان نادات و گومان بە بنچینەکانیان دەکات... لەو بڕوایەدام هەنگاوێکی گەورەمان ڕووەو هوشیاریی ئازاد هەڵنەناوەو تەنیا هەندێ ڕواڵەتی ئەو هوشیارییە ئازادەمان هەیە، ئەمەش ئەنجامی پێوەنالاندن و هەستکردنمان بەوەی چیتر ناتوانین بۆ گەشەکردنی واقیعی خۆمان لاسایی خۆرئاوا بکەینەوە.

## ئەقڵی ڕەخنەگرانە

□ باسمان لە پرۆسەی کاوێژکردنی ڕابردوو کرد، بەبێهوشیارییەکی ڕەخنەگرانەو بەبێ ڕوانینە ئەو میراتە ژیوارییە بە شێوەیەکی ڕەخنەگرانەی پشکنەر... بە بڕوای تۆ دەتوانین شێوازێکی فیکری لە میانەی کۆششی ڕەخنەیی جۆراوجۆرەوە بەرهەمبهێنین و هاوکات ئەو شێوازە لە سەروی ناکۆکی نێوان ئەقڵ و ئیمانەوە بێت؟

- نابێ واتێبگەین ئەقڵی ڕەخنەیی جۆرێکە لە خۆ و ئەونی دیکە برینداركردن... ڕەخنە زۆرجار خراپ بەکارهێنراوەو برینداركەربووە، بەڵام ڕەخنە پێداچوونەوەی بنچینە تیۆرییەکانی هۆشیارییە، سەرلەنوێ دامەزراندنەوەی ئەو چەمکە بنچینەییانەیە کە کۆمەڵگە لە سەریان دەژی... ڕەخنە دەرخستنی وردپڕوشی و خەوشی ئەوەیە کە هەیەو دامەزراندنی بنچینەی نوێیە بۆ هۆشیاری و ڕەفتار. بەم واتایە، تەنانەت ئیمانیش ملکەچی ڕەخنەیەو بەدووره لەوەی ئیمانێکی بۆماوە بێت؛ واتە ئیمانی پیرە پیاوەکان، ئەمەش ئەو ئیمانە نییە کە لە ئیماندارەکان داوادەکرێ. بۆیە دەبێ ڕەخنە لە ویژدان بگیرێ و ئەو ویژدانە بنیاتنرێتەوە کە ئیمانی لەسەر دادەمەزرێ.

یەکێك لە خاڵە لاوازەکانی ڕۆشنبیریی عەرەب لە ئیمڕۆدا، لە ڕوی ئەقڵییەوە نییە، چونکە دەتوانین زانستەکان وەك هەن وەرگێڕینە سەر زمانی عەرەبی، بەڵکو لاوازی لە ڕۆحدایە، واتە ڕەخنە لەخۆگرتنی ناوەکی بۆ موتوربەکردنی سەرچاوە ڕۆحیەکان کە تایبەتن بە نەریتە ئاینییەکان و خودی ئایینی ئیسلام.

ئەوەی تاکو ئێستا ڕوویداوە، ناکۆك بوە لەگەڵ ئاقاری بەخشینی بڕوابەخۆبوون بە تاك و توانای هاوکاریکردن لەگەڵ ئەوی تردا... چونکە هەندێ لە بزووتنەوە ئیسلامیەکان، کە سروشتێکی سیاسیان هەیە، ئایینیان گۆڕیوە بۆ جۆرێك لە سزادان؛ لەبری ئەوەی بیگۆڕن بۆ سەرچاوەیەك بۆ هاوکاریی ڕۆحی و بەزەیی و هەڵکردنی نێوان تاکەکان. واتە دامەزراندنی مرۆڤایەتی بەواتای قوڵی وشەکە...

بۆیــە داوای قوڵکردنـــەوەی سروشـــتی ڕۆحـــی ڕاستەقینە لای مرۆڤ دەکەم، چونکە ڕەخنەی ئەقڵی پێویستی بە ڕەخنەی ئایینیش هەیە (نوێکردنـەوەو قوڵکردنەوەی بنچینەکانی ئیمان).

## هەڵئاوسانی ئایدیۆلۆژی

❑ پێموایــە هۆیەکــەی خســـتنەگەڕی سیاســـیی جیاوازی ئایینـە، واتـە لـە بـری هـەڵکردن دەمارگیری سـەریهەڵداوە، لـەبری ئیجتـهاد داخـران و ڕەقهـەڵاتن هاتونەتەئاراوە... هتد.

لە کۆمەڵگە عەرەبیەکاندا ڕەچاوی ئـەوە دەکـەین شـــێوازە فیکرییـــەکان ئـــەنجامی هەڵئاوســـانی ئایدیۆلۆژی هوشیارییەکی نوێ دانامـەزرێنێ... ئایا بڕواتانوایـــە ئایدیۆلۆژیـــا بـــاری بـــاوی هەتاهــەتاییکردوە، بــێ ئــەوەی بتوانــێ دۆخێکــی جیاوازو نوێ بخوڵقێنێ!

ڕاســـتدەکەیت.. هەڵئاوســـانی ئـــایدیۆلۆژی نیشانەی سی (*30*) ساڵی ڕابردوە بەلای کەمــەوە... ئەم هەڵئاوسانە وایکردوە فیکر بابەتی بەکاربردن بێ نــەك بابــەتێك کــە بــە هوشــیاری و پیاچوونـــەوە گەشــەدەکات. ڕۆشــنبیرییەکان خۆشــیان بوونەتــە پاشکۆی پڕۆسەو ململانێی سیاسی.

پێموایــە ئیمــڕۆ ئایدیۆلۆژیــا، وەك شــێوازێکی تـێڕوانین و ڕەوتێــك لــە تەنگوچەڵەمەدایــە، چونکــە ئایدیۆلۆژیاکــان ژمارەیـــان زۆربــوەو ناکۆکییـــەکان زۆربوون، بێ ئەوەی چارەسـەری پراکتیکیـان دابێتـە دەست ئەوانەی پێویستیان پێیەتی.

## شۆڕشی ڕۆحی

❑ پێموایـە ئەوە دەگەڕێتـەوە بۆ جیـاوازیی نێـوان تیۆر و پراکتێك، نێوان چەمکەکان و پیواری (غیاب) بەرجەستەکردن لەلایەکی دیکەوە!

- مەبەســـتم هـــەمان شـــت بـــوو.. چونکـــە لەتوانایدانەماوە هیچ شتێك لێکداتەوە، بۆیە فرمانە کۆمەڵایەتیەکەی لەدەستدەداوە... کۆمەڵگەی عەرەب چاوەڕوانی هوشیارییەکی ڕەخنەگرانەیە کە بۆ هـەر کوێیەك بچێ لەگەڵیدا بێ، هەمەش مانای شکاندنی لاساییکردنەوەو هۆشیاریی ئایدیۆلۆژییە. ئێستاش ئامادەییەك بۆ قبوڵکردنی ئەو ڕەخنەیە لەگۆڕێیە.

کارەکـە لەئەسـتۆی داهێنەرەکانـە، لـە مێـژووی جیـهاندا داهێنـان وەك تـەنێکی گـەورەو یـەکجار سەرهەڵنادات... بەڵکو داهێنان لە بۆشایی بچووکەوە هـەنگاودەنێ، بۆ ئـەوەی دوایـی ببێتـە دیاردەیـەك... سەبارەت بە خۆمان، پێموایە ئێمە هێشتا لە قۆناغی سەرلەنوێ دامەزراندنەوەی هوشیاری عەرەبیداین، لە ڕێگــەی ئــەو ڕەخنــە بەهێزانـــەوە کـــە ئیمـــڕۆ بڵاودەبنـەوەو بـەهۆی پێداچوونـەوەی بەڵگەنەویستە زۆرەکانـــەوە، بەتایبـــەتی شۆڕشـــی ڕۆحـــی، کـــە پـەیوەندیی بـە ئـــەخلاق و ویـــژدان و شـــێوازەکانی مامەڵەکردنی نێوان مرۆڤەکانەوە هەیە.

شۆڕش بەبێ جۆرێك لە موتوربەکردن ڕووندادات، واتە بەهای نوێ هەن کە دەبێ تێیانبگەین و بەهای لەدەستچووش هـەن کە دەبێ وەدەسـتیانبهێنەوە... ئێمە لە ململانێیەکی ڕاستەقینەداین لەگەڵ خۆمان و مێـژووی خۆمـاندا... ململانـێ مانـای دژایـەتیکردن نییـە، بـەڵکو جـەنگی نوێکردنـەوەو تورِدانـی کـۆت و بەندەکان و وەرگرتنی ناوەڕۆکە.

## تەنگوچەڵەمەی بەهاکان

❑ هـــەندێ لـــە کۆمەڵگـــەکانمان سیســـتەمێکی بـــەهاداری ڕوون و ئاشـــکرایان نییـــە، ئەمـــەش لاسـەنگیەکی ئاشـکرای لـەنێوان هوشـیاریی بـاو و ئـەوەدا دروسـتکردوە کـە خـەڵك لـە ناوچەکـەماندا خوازیـارین... بـەڕای تۆ ئـەو هـۆ ماتانـە چـین کـە لـە

پشتی پیواری بەهاکانەوە خۆیان حەشارداوە؟ ئایا ململانێی سیاسی ڕۆڵی لەوەدا هەیە؟

- ئێمە تەنگوچەڵەمەیەکی قوڵ دەژین، ئەمەش مەبەستی من بوو لە شۆڕشی ڕۆحی... ئەم تەنگوچەڵەمەیە گرێدراوی ئەو پلەدارییی بەهایەیە کە کۆمەڵگەی عەرەب تیایدا دەژی.

ئەوەی لە بەهابەندەکانەوە (مەنزومەی قیەمەوە) بۆمان ماوەتەوە یان ئیتر کاریگەریان نەماوە یاخود لەلایەن ئەو بەهای نوێیانەوە ئاراستەدەکرێن کە ژیانمانیان تیخکردووە، ئەم بەهایانەش توندوتیژ و بەهێزن، لەوانە بەهای کاریگەبوون بەوانی تر و لاساییکردنەوە تا ڕادەی پاشکۆیەتی و بەرخۆری. مەبەست هەمان ئە بەهایانەیە کە خەڵکی بەردەوام لەگەڵیان دەژین. هیچ نەتەوەیەك ناتوانێ ویستی ڕاستەقینەی خۆی بگێڕیتەوە، لەو کاتەدا نەبێ کە دەتوانێ زاڵبێت بەسەر یەکێك لە چرکەساتەکاندا، کە بریتییە لە نەبوونی بەهابەندییەکی روون و دەتوانێ دەستوور بۆ پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکان سازبکات کە یارمەتی مرۆڤ دەدەن لە ڕەفتاری ئەوی دیکەو پەرچەکردارەکان تێبگات. ئەمەش هێمایە بۆ بوونی سیستەمێك بۆ مامەڵەکردن لەگەڵ خەملاندنی بەها نوێکاندا.

لەو بڕوایەدام، ئێمە هێشتا لە چوارچێوەی ململانێدایین لەپێناو خەملاندنی بەهای نوێدا، چونکە ململانێیەکی توندوتیژ بەسەردەبەین لەنێوان دوو بەهابەندیدا: یەکێکیان بۆمان ماوەتەوەو توندوتۆڵ و بەهێز چەسپیوەو یەکێکی نوێ کە پشتبەستووە بە هەموو دەسکەوتە ژیارییە نوێکانی لە دەرەوە بۆمان هاتووە.

بۆیە ناتوانین ئەوەی یەکەم ڕەتکەینەوە، بێ ئەوەی دەست لەخۆمان هەڵگرین، بەو جۆرەش بێ ڕەگ بە ئاسمانەوە دەمێنینەوەو ناشتوانین نوێییەکە ڕەتکەینەوە، چونکە گرێدراوی ئەو دەستکەوت و شێوازانەیە کە بوونەتە بەشێك لە ژیانمان.

ئەم ململانێیە لە گۆڕێیەو دەشێ ئەنجامی ئەو شڵەژانەی دەیخاتەوە جۆرێك لە موتوربەکردن، تێکەڵاوکردن و داهێنان بێتەئاراوە، مەبەست لە داهێنان لەم بوارەدا سەرلەنوێ ڕێکخستنەوەی ئەولەویاتەکانی کۆمەڵگەیە کە هێشتا لە کۆمەڵگەی عەرەبدا ڕووی نەداوە... چونکە ڕۆشنبیریی عەرەب، کە بەرهەمهێنانی ئەم داهێنانەی لەئەستۆیە، هێشتا لە قۆناغی ململانێی ناوەکیدایە لەپێناو دیاریکردنی پلەداریی بەهاکان و سەپاندنی ئەولەویات لە مامەڵەکردن و ژیاندا.

لە کتێبی "تیرۆری ئەقڵ"دا باس لە سیستەمی ئەخلاقی دەکەم و لە بەشێکی تەواودا گفتوگۆم لەسەر کردوەو وتومە دەربڕینی مەسەلەی بەهاکان لە کۆمەڵگەی ئێمەدا شتێکی نوێیە، چونکە لەوەوبەر ڕەتماندەکردەوەو بە بەشێك لە ڕابردوومان دادەنا... ئێستا دەرك بەوە دەکەین ئەوە بەشێك نییە لە ڕابردوو و هیچ کۆمەڵگەیەك بێ بوونی پلەدارییەکی بەهاکان، جا کۆن بێ یان نوێ، ناشێ هەبێ.

کە ئێمە دەرکمان بە کێشەکە کردوە، ئەوە سەرەتای ململانێکەیە لەپێناو دیاریکردنی پلەداریی بەها نوێکاندا، دیاریکردنی ئەم پلەدارییەش بە فیکری و هوشیاری یەکالاناکرێتەوە، بەڵکو بە ململانێی کۆمەڵایەتی: کێ دەیسەپێنێ؟ چۆن ڕوودەدات؟ ئەوە هێزە کۆمەڵایەتییەکانن کە لە کۆتاییدا سەرەنجامی ئەم ململانێیە دیاردەکەن. بۆیە دەڵێم: ئێمە ناتوانین بابەتەکە یەکلابکەینەوە... ئێمە بەشێکین لەو ململانێیە لەپێناو ئەوەی بەهاکانی دیموکراسی و هەڵکردن و دادپەروەری بڵاوبنەوە... ئەم بەهایانە دەتوانن هێزی کۆمەڵگەکان

دادەمەزرێنن و دیاریبکەن، بەڵام دەشێ مێژوو فۆرمێکی جیاواز بۆ ئەوە بخاتەڕوو کە بیری لێ دەکەینەوە.

لەناو ئەم ململانێیەدا داهێنان دادەمەزرێ و ئەویش هاندەری داهێنانەو ئەو کۆمەڵگەیەی ململانێی تێدانەبێ ناتوانێ داهێنان بهێنێتەئاراوە. لەبەرئەوەی داهێنان بەبێ گرژبوون ڕوونادات، چونکە ئەو چارەسەری گرژبوونەو نابێ لە گرژبوون و ئەو ناکۆکیە سڵبکەینەوە کە دەشێ پلەداریی بەهاکان بهەژێنێ. شایانی باسە ئێمە ئێستا لەو دۆخەدا دەژین.

گۆڕانکاری لە کۆمەڵگەی عەرەبدا زۆر قوڵ و بەهێزە، نەتەوەی عەرەبیش ئیمڕۆ بە نەتەوەی عەرەبی سەدساڵ لەمەوبەر ناچێ: لەسەر ئاستی دیموگرافی، بۆ نموونە، *60٪*ی دانیشتوانی جیهانی عەرەب لە خوار تەمەنی *24* ساڵیەوەن، ئەم پێکهاتە نوێیەش مانای ئەوەیە کۆمەڵگەی عەرەب گەنجترین کۆمەڵگەکانی دنیایە.

تونس ـ جانفی *1989*

**سەرچاوە**

في الحداثة و التقدم: حوارات فكرية، رضا الملولي، دار نقوش عربية/ تونس.

# فایلی ژمارەی داهاتوو

**لە ژمارەی داهاتووی "گۆڤاری سەردەم"دا فایلێکی تایبەت بڵاو دەکەینەوە لەسەر بزووتنەوەی خوێندکارانی خۆرئاوا لە کۆتایی ساڵانی شەستەکانی سەدەی ڕابردوودا**

# ئینجیل بەپێی گێڕانەوەی مەرقەس

**خۆرخێ لویس بۆرخیس**

**لە فارسییەوە: یاسین عومەر**

ئەم ڕوداوانە لە کێڵگەی لاکۆلۆڕادۆ[1]، لە بەشی باشوری دەوروبەری شاری خونین[2]، لە دوایین ڕۆژەکانی مانگی مارسی *1928* دا ڕویدا. پاڵەوانی ڕوداوەکە باڵتازار سپینۆزا[3] خوێندکارێکی کۆلیژی پزیشکی بوو، کە لە وەسفکردنیدا دەتوانرێت بگوترێت یەکێ بوو لە لاوە ئاساییەکانی بۆینس ئایرس، هیچ شتێکی سەرنجڕاکێشی نەبوو جگە لە میهرەبانییەکی تەقریبەن بێ سنورو توانایەك لە قسەو وتاربێژی دا؛ ئەم توانایەی لە قوتابخانەی ئینگلیزی ڕامۆس میخیا[4]، خەلاتێکی زۆری بۆ وەدەستهێنا بوو. ئەهلی باس و خواس و مشتومڕ نەبوو، هەمیشەش هەقی بەو کەسە دەدا کە قسەی بۆ دەکرد. لەو یارییانەی کە بەشداری تێدا دەکرد پشتی بە بەخت و شانس دەبەست، بەلام یاریکەرێکی خراپ بوو چونکە هیچ چێژێکی لە بردنەوە وەرنەدەگرت. زیرەکیەکەی نەکەوتبووە سەر ڕێیەکی ڕاست. لە سی و سێ ساڵیدا هێشتا بڕوانامەکەی خۆی وەرنەگرتبوو، لەبەرئەوەی لە وانەیەکدا کە زۆریش حەزی لێیبوو، نمرەی دەرچوونی نەهێنا بوو. باوکی، کە باوەڕی بە ئایین نەبوو (وەکو هەموو پیاوانی سەردەمەکەی خۆی) بە وانەو نووسینەکانی هێربێرت سپنسەر[5] ئاشنای کردبوو، بەلام جارێکیان بەرلەوەی بە گەشتێك بۆ مۆنتیڤیدیۆ بچێت، دایکی بەڵێنی لێوەرگتبوو کە هەموو شەوێك نزا بخوێنێت و خاچ بکێشێت. سپینۆزا هەرگیزاو هەرگیزو بە درێژایی چەندین ساڵ لە بەڵێنەکەی خۆی لاینەدا.

سپینۆزا ئەوەندەش بێ گێچەڵ نەبوو، ڕۆژێکیان، زۆرتر لەڕوی کەمتەرخەمیەوە نەك تورەیی، لەگەڵ کۆمەڵە خوێندکارێکی زانکۆدا کە هەوڵیان دەدا هانی بدەن تا بەشداری خۆپیشاندنی زانکۆ بکات دوو سێ مشتەکۆڵەیەکیان سرەواندبووە یەکتری. بەهۆی ئەم خولق وخوە بێوەیەی، بیروباوەڕگەلێك یان باشتر وایە بڵێم عادەتگەلێکی زەینی هەبوو کە شایانی توێژینەوە بوو: ئەوەندەی گرنگی بە ئەرژەنتین نەدەدا، بەلام

ترسی لەوە هەبوو کە لە شوێنەکانی تری جیهاندا خەڵکی بە سورپێستمان بزانن فەرەنسای دەپەرست بەڵام ڕقی لە فەرەنسیەکان بوو؛ ئەمریکاییەکانیشی بە هەند هەڵنەدەگرت، بەڵام دانی بەو ڕاستیەدا دەنا کە لە بۆینس ئایرسیش باڵەخانەی بەرزی وەکو باڵەخانەکانی ئەمریکا هەن؛ بڕوای وابوو کە لە ئەسپسواریدا گاچووەکانی دەشت لە گاچووەکانی کوێستان باشترن. کاتێ دانێڵی[6] پوورزای بانگهێشتی کرد تا مانگەکانی هاوین لە لاکۆلۆرادۆ بەسەر بەرێت، یەکسەر پەسەندی کرد – نەك لەبەرئەوەی کە زۆر حەزی لە ژیانی کێڵگەو باخ بێت، بەڵکو لەبەر حەزی دەرونیی خۆی بەڕێکەوتن‌و هەروەها لەبەر ئەوەی وەڵامدانەوە بەبەڵێ بۆ ئەو ئاسانتر بوو لە داهێنانی پاساوگەلێك بۆ ڕەتکردنەوەی بانگهێشتەکە.

باڵەخانەی سەرەکی کێڵگەکە گەورەو هەندێکیش وێران بوو؛ شوێنی نیشتەجێی سەرکار، کە ناوی گۆتریێ[7] بوو، لە نزیك باڵەخانە سەرەکییەکەوە بوو. خێزانی گۆتریێ لە سێ کەس پێکدەهات: باوك، کوڕێك تازە موی لێهاتبوو، کچێکیش کە وا دەرنەدەکەوت کچی ئەو باوکە بێت. هەرسێکیان باڵایان بەرز، لەش پتەو، ئێسك ئەستور، قژێکیی مەیلەو سووریان هەبوو و سیماو ڕوخسارێکیان هەبوو کە نیشانەی خوێنی سورپێستیان تێدا بوو. زۆر کەم قسەیان دەکرد. ژنی سەرکار لەمێژ بوو مردبوو.

لەوێ، دور لە شار، سپینۆزا شتگەلێك فێر دەبوو کە پێشتر نەیدەزانی، و تەنانەت بیریشی لێنەکردبووەوە– بۆ نمونە ئەوەی کە نابێت ئەسپ لە شوێنی نیشتەجێی خەڵکدا چوارناڵەی پێبکرێت، یان ئەوەی کە نابێت هیچ کاتێ بەبێ مەبەستێکی دیاریکراو ئەسپسواری بکرێت. لە پاش ماوەیەکی زۆر توانی جۆری مەلەکان لە ڕێی دەنگەکانیانەوە بناسێتەوە.

لە پاش چەند ڕۆژێك، دانێڵ ناچار بوو، بۆ کڕینی مێگەل، بەرەو بۆینس ئایرس بەڕێبکەوێ. ئەم کارە بەلای کەمەوە یەك هەفتە وەختی دەگرت. سپینۆزا تاڕادەیەك لە بیستنی باسکردنی سەرکەوتنە یەك لەدوای یەکەکانی کوڕە پورەکەی لە ئەشقبازی لەگەڵ ژناندا‌و ڕوکردنی ماندونەناسانەی ئەو بۆ وردەکاریەکانی مۆدێلی بەرگی پیاوانە تاقەتی چووبوو، وای بەباش زانی کە بەخۆی‌و کتێبی وانەکانییەوە لە کێڵگەکەدا بمێنێتەوە. بەڵام گەرما تاقەتپڕوکێن بوو، و تەنانەت لە شەویشدا ئەم گەرمایە کەمی نەدەکرد. گەردوگوڵی بەیانیی ڕۆژێك، هەورەتریشقەیەك خەبەری کردەوە. با، لەدەرەوەی ماڵ کاژە ئوسترالییەکانی بەتوندی دەلەراندەوە. سپینۆزا بە بیستنی دەنگی یەکەمین نمەی گەورە گەورەی باران، سوپاسی خوای کرد. زوبەزو هەوا ساردی کرد. هەر هەمان ڕۆژ نیوەڕۆکەی ڕوباری سالادۆ[8] هەڵسا.

ڕۆژی دواتر، کاتێ باڵتازار سپینۆزا لە هەیوانی خانووەکەوە سەیری کێڵگە بە ئاوداپۆشراوەکانی کرد، لە دڵی خۆیدا بیری کردەوە کە بەیەکچواندنی دەشت بە دەریا زۆریش بێ بناغە نیە _لانی کەم بەیانی ئەو ڕۆژە بێ بناغە نەبوو _ هەر چەندە دەبلیو ئەیچ هادسۆن[9] گوتوویەتی کە دەریا بەربلاوتر دێتە پێش چاو لەبەر ئەوەی لەعەرشی کەشتیەوە دەریا دەبینین، نەك بەسواری پشتی ئەسپەوە یان لە ئاستی چاواندا.

باران خۆشی نەکردەوە، خێزانی گۆتریێ بە کۆمەکی سپینۆزای شاری، کە مەعلوم نەبوو یارمەتییان دەدات یان بەر دەستیان دەگرێت، توانییان بەشێکی زۆری مێگەلەکە دەرباز بکەن، بەڵام

ژمارەیەکی زۆری ئاژەڵەکان نوقم بوون. چوار جادە بە لاکۆلۆرادۆ دەگەیشت؛ هەموویان ئاو داییۆشیبوون. ڕۆژی سێیەم، ئەو کاتەی کە قڵیشتێك هەڕەشەی لە سەربانی ماڵەکەی سەرکار کرد، سپینۆزا لە پشتەوەی باڵەخانە سەرەکییەکە، نزیکی ئەنبارەکە، ژوورێکی دا بە خێزانی گۆتریێ. ئەم کارە ئەوانی لەم نزیکتر کردەوە، لە هۆڵێکی گەورەی نانخواردندا پێکەوە نانیان دەخوارد. هەر زوو دەرکەوت کە پەیوەندیو قسەکردن لەگەڵ ئەوانەدا کارێکی دژوارە. خێزانی گۆتریێ کە لەمەڕ کاروباری لادێ ئەم هەموو شارەزاییەیان هەبوو لە ڕوونکردنەوەی ئەم کاروبارانەدا خۆیان دەدۆزیەوە. شەوێکیان سپینۆزا لێی پرسین کە ئایا خەڵکی هێشتا شالأوی سوورپێستەکانیان لەبیرە یان نا لەو سالأنەدا کە فەرماندەیی هێزەکانی سەر سنور لە خونین جێگیر بوو. ئەوان گوتیان بەڵێ، بەلأم ئەگەر پرسیارێك لەمەڕ پەڕاندنی سەری چارلزی یەکەمیش بکرایە هەر هەمان وەلأمیان دەدایەوە. سپینۆزا قسەکەی باوکی بیرکەوتەوە کە دەیگوت ئەو بیرەوەرییانەی کە لەبارەی ڕۆژگاری پێشووەوە لە لادێو گوندەکاندا دەگێڕدرێتەوە، لە ڕاستیدا هەر یەکەیان مەسەلەیەکە لە فەرامۆشکاری یان نەبوونی ئاگاداریی ورد لەبارەی مێژووەکانەوەیە. گاچووەکان زۆربەیان بەرواری لەدایکبوونی خۆیان یان تەنانەت ناوی ئەو کەسەش کە خستوونییەتیەوە نازانن.

وا دەردەکەوت لە هەموو ماڵەکەدا، جگە لە دەورەیەکی (گۆڤاری کشتوکاڵی)، کتێبێك لەمەڕ ڤێرتینەری، نوسخەیەکی بەنرخی داستانێکی ئۆرۆگوایی بەناوی (تاباریێ)[10]، یەك دانە لە "مێژووی مێگەلە شاخ کورتەکان لە ئەرژەنتین" ژمارەیەك داستانی شەهوەتوروژێن و پۆلیسی، و ڕۆمانێکی تازە بەناوی "دۆن سێگوندۆ سۆمبرا"[11] بابەتی خوێندنەوەی تر نەبوو. سپینۆزا، کە هەوڵی دەدا بە جۆرێك لە ڕێگەکان مەودای بەتاڵو لە چار نەهاتووی پاش نانخواردن پڕبکاتەوە، یەك دوو بەشێکی ڕۆمانەکەی بۆ خێزانی گۆتریێ خوێندەوە؛ هیچیان نووسینو خوێندنەوەیان نەدەزانی. جا بۆ بەدبەختی لەبەرئەوەی سەرکار خۆی گاچوو بوو، کارەکانی گاچوویەکی تر، واتە پاڵەوانی کتێبەکە، نەیتوانی سەرنجی بەلای خۆیدا ڕابکێشێت، سەرکار دەیگوت کە کارەکەی ئەو گاچووە ئەوەندە قورس نەبووە، و گاچووەکان هەمیشە لە سەفەردا ئەسپێکی زیادەیان پێیە کە هەرچی پێویستییانە هەڵیدەگرێت، ئەو ئەگەر گاچوو نەبوایە ئەوا هەگیز شوێنگەلێکی دووری وەکو لاگونادگومس[12]، شاری براگدۆ[13]، لەوەرگەی خێزانی نونێس[14] لە چاکابوکۆی[15] نەدەبینی. گیتارێك لە چێشتخانەکەدا بوو؛ کرێکارانی کێڵگە، بەر لە کاتی ئەو ڕوداوانەی کە من باسیان دەکەم، خوویان وابوو لە دەوری یەك کۆببنەوەو دانیشن. یەکێکیان ئامێرەکەی کوك دەکرد، بەبێ ئەوەی تەنانەت بیشیژەنێت، ناوی ئەم کۆڕو کۆبونەوەیان نابوو جەژنی گیتار.

سپینۆزا، کە ڕیشێکی هێشتبووەوە، لەبەردەم ئاوێنەکەدا دەستی کرد بە وردبوونەوە لە بەژنو باڵأی خۆی، و لەم بیرەی کە چۆن چۆنی، کاتێ بۆ بۆینس ئایرس دەگەڕێتەوە، بە گێڕانەوەی چیرۆکی هەڵسانی ئاوی سالادۆ حەوسەڵەیەك بۆ هاوڕێکانی ناهێڵێتەوە. زەردەیەکی هاتێ. سەیر ئەوە بوو دڵی بۆ شوێنگەلێك تەنگ بوو بوو کە هیچ کاتێ بەرلەوە هاتوچۆی نەکردبوو و پاشانیش هەر نەیدەکرد: گۆشەیەکی شەقامی کابرێرا[16] کە سندوقێکی پۆستی لێبوو؛ یەکێك لە شێرە لە چیمەنتۆ دروستکراوەکان کە لە سەر دەرگای باڵەخانەیەکی شەقامی خونوی[17]، چەند شەقامێك لەولای

گۆڕەپانی ئۆنسە[18]؛ مەیخانەیەکی کۆنی زەوی کاشیکراو، کە لە پەیوەند بە ناونیشانی تەواویەوە دڵنیا نەبوو. ئەوەندە نیگەرانی باوك و براكانی نەبوو، بیگومان ئەوان تا ئەو كاتە بیستبویان کە لافاو *هەر بەڕاستیش* دانێلی دابڕیوە.

سپینۆزا، کە هێشتا بە هۆی لافاوەکانەوە نەیدەتوانی لە ماڵ بچێتە دەرێ، لە ناو ماڵەکەدا دەستیکردە گەشتوگوزارو نوسخەیەکی ئینگلیزی ئنجیلی کەوتە بەردەست. لە نێوان لاپەڕە سپیەکانی کۆتایی کتێبەکەدا، ئەندامانی خێزانی گۆترێ[19] _ناوی ڕاستەقینەیان ئەمە بوو_ دەستنووسێکیان لە بارەی نەژادی خۆیان بەجێهێشت بوو. ئەوان خەڵکی ئینڤێرنیس[20] بوون؛ لە سەرەتاکانی سەدەی نۆزدەدا وەکو کرێکاری سادە، گەیشتبوونە کیشوەرە تازە؛ و لەگەڵ سورپێستەکاندا ژنوژنخوازیان ئەنجامدابوو. شەجەرەنامەکە لە دوو سێ ساڵێکی پاش هەزار و هەشت سەدو هەفتادا دەبڕا، واتە ئەو کاتەی کە ئەوان چیدی نووسینیان بیر چووبووەوە. لە دوای چەند وەچەیەکیش بە تەواوی قسەکردنیان بە زمانی ئینگلیزیی لە بیر چووبوەوە؛، کاتێ سپینۆزا ئەوانی ناسی تەنانەت زمانە ئیسپانییەکەشیان ئەوەندە پاراوو ڕەوان نەبوو. هەموو جۆرە بیرو باوەڕێکی ئاینییان لە دەست دابوو، بەڵام لە خوێنیاندا، نیشانەگەلێکی نادیار لە دەمارگیریی وشکی کالڤینزمەکان و ئەفسانەی سورپێستە دەشتنشینەکان مابووەوە. دوای ماوەیەك، سپینۆزا لەمەڕ ئەم دۆزینەوەیەی خۆی قسەی لەگەڵ کردن، بەڵام ئەوان ئەوەندە سەرنجیان نەدایە.

هەروا کە لاپەڕەی کتێبەکەی هەڵدەدایەوە، پەنجەکانی لاپەڕەی یەکەمی ئینجیلی مەرقەسی کردەوە. سپینۆزا بڕیاریدا، وەکو ڕاهێنانێك لە وەرگێڕاندا، و ڕەنگیشە بۆ ئەوەی کە بۆی دەربکەوێت کە ئایا خێزانی گوترێ هیچی لێ تێدەگەن یان نا، لەپاش نانی شێو دەقەکەیان بۆ بخوێنێتەوە. لەوەی کە ئەوان بە تەرکیزی تەواوەوە گوێیان دەگرت و بە قوڵایی باسەکەدا ڕۆچبوونە خوارێ زۆر سەری سوڕما، ڕەنگە پیتە ئاڵتونیەکانی سەر بەرگی کتێبەکە ئەو هەیبەتەی بە کتێبەکە بەخشیبووبێ. سپینۆزا پێیوابوو کە هێشتا بیروباوەڕە کۆنەکان لە خوێنیاندا ماوەتەوە و بۆی دەرکەوت کە بەدرێژایی مێژووی تۆمارکراو وەچە یەك لە دوای یەکە مرۆییەکان، هەمیشە دوو چیرۆکیان گێڕاوەتەوە_ یەکێکیان چیرۆکی ئەو کەشتیە گومبووەی کە لە زەریای سپی ناوەڕاستدا بەدوای بەهەشتی بەڵێنپێدراودا دەگەڕا، و ئەوی تریشیان چیرۆکی ئەو خودایەی کە لە جەلجەتا لە خاچدرا. سپینۆزا بە یادی وانەکانی گوتاربێژیی قوتابخانەی ڕامۆس مەخیا، لەکاتی گێڕانەوەی ڕیوایەتەکاندا هەڵدەستایە سەرپێ.

ئەندامانی خێزانی گوترێ ئێستا ئیدی گۆشتە برژاوو ساردینەکانیان بە پەلە قوت دەدا تا لە خوێندنەوەی ئینجیلەکە دوا نەکەون. بەرخۆڵەیەکی بچکۆلانەی فێرەدەستی کچە کە بە پارچە شریتێکی شین ڕازاندبوویەوە، لە نێو تەلە دڕکاویەکاندا گیری خواردو خۆی برینـدار کرد. ئەو سیانە بۆ وەستاندنەوەی خوێنەکە، دەیانویست تاڵی جاڵجاڵۆکە بخەنە سەر برینەکە، بەڵام سپینۆزا بە چەند دەنکە کەپسولێك ئاژەڵەکەی چارەسەر کرد. ڕێزدانانی ئەوان لە دەرمانکردنەکەی ئەو بووە مایەی سەرسوڕمانی. (ئەو کە لە سەرەتادا متمانەی بە خێزانی گوترێ نەبوو، ئەو دوو سەدو چل پزوەی کە لەگەڵ خۆیدا هێنابووی، لە تویێ یەکێ لە کتێبەکاندا شاردبوویەوە.) ئێستا ئیتر کە خاوەنی

موڵکێکی نادیار بوو، سپینۆزا بە نوێنەرایەتی ئەو موڵکـە چـەندین فـەرمانی شـەرمنانەی دەدا، کـە یەکسەر جێبەجێ دەکرا. ئەوان وەك بڵێی بەبێ ئەو هەست بە ونبوون بکەن، حەزیان دەکرد ژور بە ژور و بـەدرێژایی ئـەو هەیوانانـەی کـە چـواردەوری ماڵەکەیان دابوو بە دوایەوە بن. کاتێ کتێبەکەی بۆ دەخوێندنەوە، بەوەی زانی کە ئەوان بە دزییەوە ئەو وردە خواردنانە دەدزن کە ئەو لەسەر مێزەکە فڕێی دابوون. شەوێکیان غافڵگیری کردن و گوێی لێبوو کە لە چەند وشەیەکی زۆر کورتدا، بەرێزەوە باسی لێوە دەکەن.

کاتێ ئینجیلی مەرقەسی تەواو کرد، ویستی یەکێ لە سێ ئینجیلەکەی تریان بۆ بخوێنێتەوە کە مابوەوە بەڵام باوکە داوای لێکرد هەر ئەوەیان بۆ دوبارە بکاتەوە کە خوێندبوویەوە، تا باشتر بتوانن تێی بگەن. سپینۆزا هەستی کرد ئەوانە وەکو منداڵ وان کە دوبارە کردنەوەیان لەلا خۆشترە تا تازەیی و هەمەچەشنی. ئـەو شـەوە _ و ئەمـە هیـچ مایـەی سەرسـوڕمان نیـە _خـەوی تۆفـانی نوحـی بینـی؛ دەنگی پیاکێشـانی چەکوشـێك کـە بـەر بەدەنـەی کەشـتیەکە دەکـەوت خەبـەری کـردەوە؛ و بیریکردەوە کە ڕەنگە دەنگی هەورەتریشقە بوو بێت. لە ڕاستیدا ئەو بارانەی کە خۆشی کردبووەوە دوبارە دەسـتی پـێ کردبـووەوە. سـەرمایەك بـوو دەتگوت گوێزانە. ئەندامانی خێزانی گۆترێ پێیان گوتبـوو کـە لافـاو زیـانی بـە سـەربانی ئەمبارەکـە گـەیاندووەو لـە پـاش ئـەوەی کـە دارەڕای سـەربانەکەیان چـاککردەوە نیشـانی دەدەن. لەگەڵ ئەودا کە چیدی لە ناویـاندا غەریبـە نـەبوو، بەحەزو خۆشییەکی وەهاوە ڕەفتاریان دەکـرد، کـە تەقریبـەن گەیشتبووە ڕادەی مـەرایی کـردن. هیـچ یەکێ لـەوان حـەزی لـە قـاوە نـەبوو، بـەڵام کوپێکـی بچکۆلـەی لێبـوو کـە لەبـەر ئـەو بـەردەوام شـەکریان تێدەکرد.

باوبۆرانی دووەم، شەوی سێ شەممە دەستی پێکردبوو. شەوی پێنج شەممە، سپینۆزا بەهۆی لێدانێکی لەسەرخۆوە کە لە دەرگای ژوورەکەی درا کە _ بۆ دڵنیایی زیاتر _ هەمیشە قفڵی دەدا، خەبەری بووەوە. لـە پێخەفەکـەی هاتـەدەرەوەو دەرگاکـەی کردەوە: کچەکەی سەرکار بوو، لە تاریکیدا زۆر بە گران دەیتوانی ببینێت، بەڵام بە دەنگی پێیدا زانی کە پێی پەتییە، و چەند ساتێ دوای ئەوە، لە ناو جێگەدا، تێگەیشت کە دەبێت کچە ئەو هەموو ڕێگەیەی لەوبەری عیمارەکەوە بە ڕوتی بڕی بێت. کچە باوەشی پیادا نەکردو هیچی لەگەڵدا نەگوت، هەر هێندە نەبێت بە هەڵلەرزینەوە لە تەنیشتیەوە ڕاکشا. ئەمە یەکەم جار بوو پیاوێکی لەگەڵ خۆیدا دەبینی. کچە لەکاتی ڕۆشتنیشدا ئەوی ماچ نەکرد؛ سپینۆزا تێگەیشت کە تەنانەت ناویشی نازانێت. لەبەر هۆیەك کە نەیدەویست بۆ خۆیشی ڕوون بکاتەوە، بڕیاری دا کە لە کاتی گەڕانەوە بۆ بۆینس ئایرس ئـەوەی ڕویـدا بـوو بـۆ هیـچ کەسـێکی نەگێڕێتەوە.

ڕۆژی دواتر وەکو ڕۆژی پێشوو دەستی پێکرد، جگە لەوەی کە باوکەکە لەگەڵ سپینۆزا قسەی کردو لێی پرسی کە مەسیح خۆی هێشتبووی بیکوژن تا هەموو خەڵکی تری جیهان ڕزگاریان بێت. سپینۆزا کە خۆی باوەڕی بە ئاین نەبوو وەلێ لەئاست ئەوەی کە بۆ ئەوانی خوێندبووەوە خۆی بە بەرپرسیار دەزانی، بۆیە وەڵامیدایەوە: "بەڵێ، بۆ ڕزگار کردنی هەمووان لە دۆزەخ."

ئالەو کاتەدا گۆترێ پرسی: "دۆزەخ چییە؟"

"شوێنێکە لە ژێرزەویدا، شوێنێکە کە تیایدا گیانەکان دەسوتێنن، و دەسوتێنن."

"ئایا ئەو سەربازە ڕۆمییانەیش کە بزمارەکانیان بە چوار پەلی مەسیحدا داکوتی ئەوانیش ڕزگاریان بوو؟"

سپینۆزا کە زانیاریەکانی لەمەڕ کاروباری ئاینی ئەوەندە نەبوو گوتی: "بەڵێ."

هەموو ئەو ماوەیە، لەوە دەترسا کە نەکا سەرکار پرسیار لەبارەی ئەوەوە بکات کە شەوی ڕابردوو بەسەر کچەکەیدا هاتبوو. لەدوای نانی نیوەڕۆ، داوایان لێکرد کە دوبارە بەشی دواییی ئینجیلەکە بخوێنێتەوە.

سپینۆزا، ئەو ڕۆژە پاش نیوەڕۆکەی، ماوەیەکی زۆر نوست. نوستنێکی سوك، کە لێدانی بەردەوامی چەکوش و دڵەڕاوکێکی نادیار لێی تێکدەدا. نزیکی خۆرنشینانێك، هەستا و چووە هەیوانی دەرەوە. وەك بڵێی لەبەرخۆیەوە قسە بکات، گوتی: "ئاوەکان نیشتونەتەوە. ئیدی ئەوەندە ناخایەنێت."

گوتری، وەکو زایەڵە، دوبارەی کردەوە: "ئیدی ئەوەندە ناخایەنێت."

هەرسێکیان بەدوای ئەودا دەهاتن. لە حاڵێکدا کە لەسەر بەردڕێژەکە کەوتبوونە سەر ئەژنۆ، داوای تەبەروکیان لێکرد. پاشان سوکایەتیان پێکردو تفیان لێکرد، بەرەو بەشی دواوەی باڵەخانەکە ڕاویان نا. کچە دەگریا. سپینۆزا زانی کە لەودیوی دەرگاکە چی چاوەڕوانیەتی. کە دەرگاکەیان کردەوە، گۆشەیەك لە ئاسمانی ساماڵی بینی. مەلێك دەیخوێند. لای وا بوو مەلی سەهرەیە. ئەمبارەکە بێ سەربان بوو: ئەوان داری سەربانەکەیان داگرتبووە خوارێ تا خاچی لێ دروست بکەن.

## پەراوێزەکان

*1-La Colorado*
*2-Junin*
*3-Baltasar Spinoza*
*4-Ramos Mejia*

*5-Herbert Spencer* فەیلەسوفی ئینگلیزیو دامەزرێنەری قوتابخانەی فەلسەفی گەشەسەندن(*1820-1903*).

*6-Daniel*
*7-Gutre*
*8-sALADO*

*9-W.H.Hudson* نووسەری ئینگلیزی. لە دایكو باوکێکی ئەمریکی لە نزیکی بۆینس ئایرس لەدایك بووە. زۆرتر بەرهەمەکانی بەباسکردنی جوانیەکانی سروشت تایبەتن. (*1841 _ 1922*).

*10-Tabare*

*11-Don Segundo Sombra* ڕۆمانێکی "ڕیکاردۆ گویراڵدیس"ی نووسەری ئەرژەنتینیەو یەکێکە لەبەرهەمە کلاسیکییەکانی ئەدەبیاتی ئەرژەنتین. دۆن سگۆندۆ (پاڵەوانی کتێبەکە) نمونەی گاچوویەکی ئەرژەنتینیە.

*12-Laguna de gomez*
*13-Bragado*
*14-Nunez*
*15-Chacabuco*
*16-Cabrera*
*17-Juiny*
*18-Once*

*19-Guthrie* شارێکە لە باکوری سکۆتلەندە.

*20-Inverness*

## سەرچاوە

هزار توهای بورخس، ترجمه احمد میرعلائی، تهران، کتاب زمان، چاپ اول *1380*.

# داڵ و وشە و شوورای دووپشکەکان

مەنووچێهر کەیخەسرەو پوور
لە فارسییەوە: یەدوڵڵا ڕەحیمیان

لەو شەوە بارانیەدا نووسەر لە پشت مێزی کارەکەیەوە دانیشتبوو و لە کاتێکدا کە تای پێنووسەکەی لە لێوەکانی نزیك دەکردەوە لە شوێنێکی نادیار رامابوو. بیری لە هەوێنی چیرۆکە تازەکەی دەکردەوە. هەوێنێك کە لە ڕەوایەتێکی وەرگرتبوو. چیرۆکی ڕووداوێك کە پێوەندی بە داڵێکەوە بوو کە ئارام و ئۆقرەی خەڵکی گوندێکی ناوچەیێکی شاخاوی تێك دابوو.

"داڵ کە هەستی بەوە کردبوو باڵە بریندارەکانی ئیدی ناتوانێ لە تەشقی ئاسماندا رایگرێ و پێیە بێ هێزەکانی توانای هەڵگرتنی قورسایی جەستەیان پێ نەماوە و کاتی مەرگی نێزیك بووەتەوە، هێلکە گەلێکی بچووکی ئێجگار زۆری لە ژێر خاکدا شاردەوە.

ئاسمان ڕەش هەڵگەڕا بوو. زریان بە شمشێرێکی درێژەوە گەیشت. داڵی پیر و بەدفەڕی دوو کوت کرد. نیوەییێکی بۆ خۆرهەلات و نیوەکەی تری بۆ خۆرئاوا فڕکدا.

ڕەوایەت ئەیگوت. هەر کاتێ ئەو دوو نیوەیە بگەن بە یەك، هێلکە شاراوەکانی داڵ سەر لەنوێ لە خاك سەردەردێنن، دەترووکێن و بێچوە داڵەکان دێنە سەرزەوی.

نووسەر بێچوە دووپشکی لە داڵ پێ باشتربوو و ئەمەی بۆ باشتر دەبینرا.

برووسکە و هەورە تریشقە و پاشان داکردنی تەرزەییێکی توند نووسەری بۆ ڕەوتی ئاسایی گەڕاندەوە. چیرۆکەکەی بەم ڕستانەوە دەستپێکرد: مانگی چواردە لە نێوان هەورە ئەنجن ئەنجن بووەکانەوە وەك جەردەییێکی دەریایی بە تەنیا چاوێکی ساخەوە، لە وێرانە دووکوتکراوەکانی، گوندی مەڵبەندە شاخاویەکە رامابوو. لە نێوەڕاستیدا کە بە ناوەندی گوند دادەنرا دیوارێکی بەرز و درێژ خۆی دەنواند. لە پای دیوارەکەدا تەرمێك هێندەی دیوارەکە درێژ کەوتبوو. تەرم ئەیبینی، بەلام هیچی نەدەگوت. ئەیبیست بەلام وەلامی نەدەدایەوە دەست و پێی ساخ بوو، بەلام

هەڵنەدەستا. لە کەندەلاَنێك کە لە پشت سەریەوە دیاربوو، ژمارەییێك مشك دەچوونە ناو و دەهاتنە دەر. چما لە شیلەی مێشکی دەخۆن و ئەو تەرمە توانای بیرکردنەوەی پێ نەمابوو. لەسەر سینەی ژمارەگەلی یەك - نۆ - یەك - چوار، هەرکام لە ڕەنگێ هەڵکەنرابوو. ژمارەی چوار، دوایین ژمارە ڕەش بوو، بە تەواوەتی ڕەش.

ڕەشایی شەو کە ڕەنگی گۆڕا بایێکی تووش هەڵیکرد. دیوار دەستی کرد بە لەرینەوەو رووخان. با، خاك و خۆڵی بن دیوارەکەی هەڵگرت و بۆ ئاسمانی برد، هێلکەکان کەوتن. شەقیان برد. شکان و لە نێوانیانەوە شتگەلێکی ڕەش و لیق هاتنە دەرێ، دووپشکەکان...

دووپشکێك لەسەر لاپەڕەی دەفتەری نووسەردا وەستا بوو - کلکی بەرز کردبوەوە. لە نووسەری دەڕوانی. نووسەر لە بەرینی ڕواڵەتی دووپشکدا هەستی بە مانای راستەقینەی دۆزەخ کرد... ترس تەواوی لەشی داگرت، لەناکاو بە نەعرەتەوە قیراندی - دووپشك - دووپشك - دووپشك - یارمەتی، یارمەتی لەگەڵ دەنگی هاواریدا ژنەکەی خۆی گەیاندە نێو ژوورەکە. شووەکەی بینی لە کولە سووچێکدا خۆی گرمۆڵە کردبوو، سەری خستبووە نێو پەنجەکانیەوە.

-چ رووی داوە!؟.

-دووپشك - دووپشك - لەسەر نووسراوەکانم.

ژن قیژەیێکی کورتی کێشا، بەلاَم بە تەقالا بەسەر خۆیدا زاڵ بووەوە. لە دەفتەرەکەی ڕوانی، بەلاَم هیچ لە ئارادا نەبوو. هەموو شوێنێکی پشکنی، بەلاَم چاوی بە هیچ نەکەوت. نووسەر خۆی لە خۆیدا نوقم کردبوو. ژن بە دڵە ورێزەوە دەفتەرەکەی داتەکاند، هیچ نەبوو. چاوی لەسەر دێڕە سەرەتاییەکانی چیرۆکەکە ڕاما. بزەیێکی تاڵی گرت.

خوێندیەوە: "هاتە دەر دووپشك" ئەم دوایین رستە چما بۆ زەینی خەیاڵ بردووی تۆ - مەودای نێوان راستی و خەیاڵی سڕیوەتەوە، ئەوەندە لە نووسراوەکانتدا نوقم بووگی کە...

نووسەر بە جووڵەییێك ناڕەزایی دەربڕی.

ژن دەفتەرەکەی خستە سەر مێزەکە و ڕۆیشتە دەر. نووسەر هەستا. بیری کردەوە ڕەنگە شەکەتی بووبێتە هۆی ئەم کێشەیە، یان وەك ژنەکەی گوتی نوقم بوون لە نێو نووسراوەکان و بەردەوام هێنانەوە یادیان، بەلاَم ئەو بە چاوی خۆی بینیبووی. بارانییەکەی لەبەرکرد. لە ژوورەکەی دەرکەوت و لە تاریکایی شەودا ون بوو.

نووسەر دوو ڕۆژ دواتر لە ئەنجومەنی ئەدەبیی دەستەی *74*دا وتارێکی لەسەر ناوی "راستی خەیاڵ و خەیاڵی راستەقینە" خوێندەوە.

دانیشتوان لە بێدەنگی تێفکریندا پەلیان دەهاویشت: "کرمی راستی بەکارتێکردنی خەیاڵ ئەبێ بە پەپوولەییێکی شاعیرانەی خەیاڵ بزوێنی راستەقینە. خەیاڵ کچی راستیە - ناسکتر لە کچی راستەقینە، وەکو پەرییە، ڕەنگە ئەم پەپوولە خەیاڵ بزوێنەی کە لەسەر گوڵی ئەندێشە و خەیاڵی ئێمەدا نیشتووتەوە هەر ئەو پەرییەی کچی راستەقینەی خەیاڵ بێ. ناسکتر لە ڕاستی. هەبوونێك لە زەیندا کە ئەبێ جێی راستی بگرێتەوە، بۆ ئەوەی راستی بمێنێتەوە..."

لە ناکاو هەستی کرد لە پشت پەرداخی سەر تریبوونەکەوە، دووپشکێکی ڕەش و قێزەون دێتە دەرێ. هەر بەو لەشە نەگریسە و هەمان روانینی دۆزەخییەوە، بە کلکێکی هەڵکراوە. دەستەکانی نووسەر لەسەر تریبوونەکەدا وشك بوو، توانای جووڵانەوەیانی نەبوو. دەسەلاَتی هیچی نەمابوو.

ئاخافتنە بچڕبچڕەکەی دانیشتوانی سەرسام کرد. لە یەکتریان دەڕوانی.

قسەکانی نووسەر هێشتاکە ناڕێك و پچڕاو بوو: راستی - خەیاڵ - خەیاڵ - راستی - داڵ - شەو - شوورا - دووپشکەکان - دووپشك - دووپشك. ژنێك قیژاندی، ئەوانی دیکە بە ترساوییەوە هەستان. پیاوەکان بەرەو لای هەڵهاتن. قیڕ و هۆڕۆ ئاژاوە هۆڵەکەی تەنی. هاواری نووسەر دەبیسترا:دووپشکەکان، دووپشکەکان.

—دووپشکێك خەریکە بە تریبوونەکەدا دەڕواتە خوار و دووپشکێکی دیکە بە مێزەکەدا سەرئەکەوێ.

ژنەکان و پیاوەکان روانیانە تریبوون و ئەو شوێنەی قامکی بۆ راکێشا بوو، بەلام هیچ شتێ لەوێ نەبوو دانیشتوان لە یەکتریان روانی.

—داماگ و عەقڵی لێ گۆڕاوە.

هێور هێور بڵخە نیشتەوە. بێدەنگییەکی قورس بە سەر هۆڵەکەدا زاڵ بوو. نووسەر بە ئەستەم هەستاو لە نێوان تێز و مەخابن و سەرسوورمانی دانیشتوان و ئەندامانی ئەنجومەنی دەستەی *74* دا کەوتە رێ. شەرمسار و شەکەت و وەڕەز لە ئەنجومەنی ئەدەبیی دەرکەوت.

پیاوێك لە پای تریبوونەکەدا قالۆنچەیێکی دۆزییەوە، پیشانی خەڵکەکەی دا و بە تیزەوە گوتی: ڕەنگە ئەمەی مەبەست بووبێ!. هەموو پێکەنین.

بارانی دەرەوە لە نێو شەقامەکانی ئەم لای دیوارەکەدا بە توندی دەیشێلا. بە خانووەکەی کە لە شەقامی ئەو لای دیوارەکە بوو گەییشت. ژنەکەی بە دیمەنێکی ئاڵۆزەوە هاتە پێشوازیەوە. ژن لەگەڵ ئەوەی یارمەتی ئەدا تا جلکە خووساوەکانی لەبەر داکەنێ گوتی:

—ئەزانم، هەموو شتێك ئەزانم. بە تلیڤۆن رایانگەیاندم چۆنت قەوماندووە. ئاخۆ بەست نییە؟ داڕووخانی دیوارەکانی جیایی هۆی شانازییە، بەلام تۆ لە چیرۆکەکەتدا دەنووسی. (بە داڕووخانی دیوار دووپشکەکان لەو هێلکانەی کە داڵ لە ژێر خاکی گوندەکە شاردبوونیەوە هاتنە دەرێ.)

—گوێ گرە تا بۆتی شی کەمەوە.

—نا، تۆ گوێ گرە. تۆ بووییتە هۆی شەرمساری من. ئەرۆنەرۆی خولقاوی زەینی خۆتت هێناوەتە نێو جیهانی راستەقینە و ئێستا بۆ خۆت لێ کەوتوویتە ترس و دڵەوریێزەوە.

—بهێڵە بۆتی باس بکەم.

نە، نامەوێ، تۆ راستی و خەیاڵ لە یەکدی جیا ناکەیتەوە.

بۆ خاتری خودا ئیدی بەسە، ئازارم مەدە.

—بیبڕەوە.

ژن بێدەنگ بوو...

نوسەر بەرەو ژووری خەوتنی ڕۆیشت.

خەو، خودای ئارامش بوو کە لە نێوان ئەو و ئەشکەنجەدەرانیدا دیواری پتەوی بێ ئازاری دەکێشا. لەگەڵ خۆی کەوتە ڕاوێژ، خەو خوشکە بچکۆلەی مەرگە و مەرگیش دایکی خەوەو لە ژیدانی هەردووکیاندا - ئارامش.

لە خەونی نووسەردا هۆڤەکان بە دەور خودای هێمنایەتیدا هەڵدەپەڕین.. هەر بەو نێزە درێژانە و هەر هەمان دەمامکی جەفەنگەوە..

لەگەڵ دەنگی دەهۆڵی تەنەکە، بە دەوریدا دەخولانەوەو لەگەڵ ئاژاوەی دووکەڵ، ئارەق، ئاگر و چاوە خوێن تێژاوەکانیان.. هەڕەشەیان لێ دەکرد و ئەو ئەیناڵاند - هاواری لە نێو ئاژاوەی قوولە و قێڕەو هەرایاندا بزر ببوو، لێك نەئەدرایەوە. لە نێوان هەڵپەڕکێ، هاواری ناڵەجێ و دەمامکی جەفەنگدا چاوی بە خاچێ کەوت و دووپشکێك کە لە خاچەکەوە سەرئەکەوت. دووپشك بە ڕواڵەتە

دۆزەخیەکەیەوە بۆی دەڕوانی. کلکی بەرزکردەوە. لە خاچ هاتە خواری، بەرەو لای ئەم کەوتە ڕێ. دەمامکەکان، دەمامکەکان، ئاگر، ئاگر. ڕوالەتە دۆزەخیەکان. دووپشك لەسەر قامکی پێیەوە وەستا. کلکی هەڵبڕی.

—دووپشکێك لەسەر پێمدایە، یارمەتیم بدەن، یارمەتی.

لە لاقیەوە ڕۆیشتە سەر. چاوە لە ترس دەرپەڕیوەکانی لەسەر دووپشکی ڕەش و زەبەلاح رامابوو. ئێستا دووپشك گەیشتبووە سەر ورگی.

—خودایا، یارمەتی، گەییشتووتە سەر زکم...

دووپشك بەسەر پێستی زکیدا دەسووڕایەوە. دەجوولا. ڕۆیشتە سەرترەوە، گەیشتە سەر دڵی. وەستا. دڵی بە توندی بان و خواری دەکرد، بەلام لێوەکانی نووسەر بێ هیچ ورتەیێك – چاوەکانی دەیپرسی: چیت لێم دەوێ؟ دووپشك بە ڕوانینی نیگای گوتی: بێدەنگی یان مەرگ.

نووسەر بە ڕوانینێکی تێکەڵ بە دڵەڕاوکێیەوە وەلامی داوە. مەرگیش بێدەنگییە و بێدەنگیش مەرگ. دووپشك کەوتووتە باری چز وەشاندنەوە. لەشی نووسەر لە کوڵ و کۆدایە. موغولگەلی دڵەڕاوکێ ئامادەی پەلامار. نووسەر نەعرەتەی کێشا: لەسەر دڵمدایە، یارمەتیم بدەن.

یاریدەدەرێك نەبوو. دووپشك چزی چەقاند. ژاری خۆی ڕژاند. لەشی نووسەر لە ئێشدا سووتا. لەبەر ژان هاواری لێ هەستا.

—هەستە، ڕابە لە خەو...

دەنگی ژنەکەی بوو. نووسەر لە خەو هەستا. خووسا و لە ئارەق. دەتگوت لە یاودا دەسووتێ.

ژن گوتی: یاو وای لێ کردووی کەوتویتە وڕاوەکردن. نووسەر قیڕاندی: خەوتووەکان – خەوتووەکان— سبەی نۆرەی ئێوەیە، چوو بەرەو لای ستادییەکە. والای کرد. ئەیویست هەمدیسان هاوار بکا. بەلام ئەهوەن بوەوە. ئەیویست هەناسە هەڵبڕێ و هەوای خاوێنی بارانەشەو برژێنێتە نێو سیەکانیەوە. ئەیویست لە تەنگایی و تاریکایی ژوورەکە، خۆی ڕزگار بکا. لاقێکی خستە ئەودیوی ستادیەکەوە. ژن بە بڕوای ئەوەی کە ئەیهەوێ خۆی لەناو ببا بە زۆر کێشاندیەوە نێو ژوورەکە. هاواری کرد و یارمەتی خواست. چرای هاوسامالەکان یەك لە دوای یەك هەڵکرا. پاش چەن ساتێك هاوسێیەکان رژانە نێو ژوورەکە؟

—چ رووی داوە؟

—هەمدیسان باسی دووپشك، دووپشکەکان. ئەیویست خۆی بکوژێ، بەلام نەمهێشت...

ژن بە کوڵ ئەگریا. بڕێك لە هاوسێکان بە کەسەرەوە سەریان دەهەژاند.

—بەش خوا شێت بووە.

—خەیاڵ دایگرتووە.

—لەو بەکرێگیراوانەیە.. خۆی داوە لە شێتی.

—ئەمەش جۆرێکە لە خۆ بە ڕووناکبیر نواندنی نووسەرەکان.

—بۆ ئەوەیە کتێبەکانی بفرۆشرێ.

—ڕەنگە بیهەوێ ببێ بە پالێوراو.

نووسەر هەموو ئەو قسانەی بیست، بەلام خەریك بوو بیری لە خەوەکەی دەکردەوە و ئەو دیمەنگەلەی کە لە پێش چاوانیدا هات و چۆی دەکرد. نە ئەدی ولاتی خەویش موغولەکانی دڵەڕاوکێ داگیریان کردبوو.

—دووپشکەکان – دەمامکەکان – هۆڤەکان – خاچی شکاو، هەڵپەرکێ، ئاگر، دووکەڵ، قیڕەو زریکەی منداڵان و ژن و پیاوگەلێك کە لە ئاگردا دەسووتان. دووپشکەکان ئاگریان تێبەردان. دووپشکەکان ئاگریان تێ بەرئەدەن.

ئـــەم دووپشـــکە رەش و نگریســـانەی کـــە لـــە هێلکـــە شـــاراوەکانی ئـــەو دالّـــە پـــیر و زەخمـــارە هاتوونەتە دەر.

دیسان قیراندی: ئاگر، دووکەڵ، دووپشکەکان.

—یارمەتی، یارمەتی.

—چەن کـەس لـە هاوسـێکان ژنـی نووسـەریان بـۆ دیوێکـی دیکـە بـرد و لەگـەڵیدا کەوتنـە وتووێژ.

—خانم، ئەبێ هەر ئەمشەو بیبەستینەوە، نەکا دیسـان بیهـەوێ لـە سـتادیەکەوە خـۆی فـڕێ بداتـە دەرەوە.

وایە، ئەتۆ تاق و تـەنیای، ڕەنگـە نـەتوانی بـە خێرایی خۆتی پێ بگەیێنی.

یەکێ لـە هاوسێیەکان پێشـنیاری دا، ئەمشـەو حەبی خـەوی پـێ بدەن، سبەی بیبـەن بـۆ شـێتخانە ڕەنگە دوکتۆرەکان بتوانن فریای کەون. بێچارە، ئەم دووپشکە خەیاڵییانە ئاخری دەیکوژن!

ژن بـە یارمـەتی هاوسـێکان، بـە تـەقالاییێکی زۆرەوە شووە نووسەرەکەیان بەست بە قەرەوێڵەکەو حەبی خەویان کرد بە قوڕگیدا.

—سبەی، سەر لە بەیانی دێین و بە یارمـەتی دەیبەین بۆ شێتخانە.

—سوپاسی هەموو لایێکتان دەکەم.

ژن بۆ ئارامشی نووسـەر چراکـەی کوژانـدەوە، بـەڵام نووسـەر هێشـتاکە بـە پەشـۆکاوییەوە قسـەی دەکرد: عومرێك چیرۆکم نووسی. یەك عومر.. ئێستا بە قەرەوێڵێکەوە بەستوومیانەتەوە. بڕوا بە قسەکانم ناکەن. چراکەم دەکوژێننەوە.

ژن لەگەڵ پڕمەی گریاندا دەرگاکەی پێـوەدا و ڕۆیشـــــتە ژووری تەنیشـــــتەوە. چۆکـــــی دادا و ئینجیلەکەی بەدڵیەوە نووساند: خودایا هێمنایـەتی پێ ببەخشەوە.

هـاواری نووسـەر بـەرز بـووەوە: دووپشـك – خودایا، دیسانەوە هاتن. هاتە سەر پێم – وا خەریکە لە لاقمەوە دێتەسەر، یارمەتی.

—خودایا لە خەیاڵی پووچەڵ دووری خەوە.

—خەریکە لە زگمەوە سەر ئەکەوێ. بۆ خاتری خودا بگەنە فریام.

—خودایـا ئـارامی کـەو ئـەم شـێتییەی لـێ دوورخەرەوە.

خودایا، گەییشـتووتە سـەر دڵـم، یـەکێ بێـت، دەستەکانم بکاتەوە، یارمەتی، یارمـەتی، و بێدەنگی داسەپا...

ژن ئینجیلەکـــەی مـــاچ کـــردەوە و لەســـەر قەرەوێڵەکە ئامێزی بۆ خەو ئاوەڵا کرد.

بەیانی ژن بە دەنگی دەرگا لـە خـەو بەخەبـەر هـات، هەسـتایە سـەرپێ و دەرگاکـەی کـردەوە. هاوسێکان بوون.

—دوێنێ شەو چلۆن خەوت؟

—لـە پێشـدا زۆری هـاوار کـرد، بـەڵام پاشـان ئارامی گرت.

پیـاو بە چاوی ئاوەڵاوە لـە گوڵدانـی ویشـك و ستادیە بەستراوەکە رامابوو. هاوسێکان بە ئـارامی دەستیان کرد بە کردنـەوەی تەنافەکەی، بەڵام پیـاو جووڵـەی نـەدەکرد. هێمنایـەتی پیـاو ژنـی تۆقـاند. هەراسـان مێردەکەی ڕاژەند. مێردەکەی هیـچ جـم و جووڵێکـی لـە خـۆی پیشـان نەئـەدا. ژن بـە تونـدی شەکاندیەوە و هاواری کێشا.

—کراسـی نووسـەر وەك لاپـەڕەیێك لـە دەفتـەری کتێبێکی تازە چووە لاوە. شوێنی بازنـەیێکی گـەورە بە ڕەنگـی قـاوەیی سـووتاو، ڕاسـت لەسـەر دڵـیەوە کەوتـە پێش چاو. لە نێوەڕاستی بازنەکەدا خوێنی دەرپـەڕیوی قەتماغـەی بەسـتبوو. ژن پـاش چـەن ساتێك نابا وەڕیو بێدەنگی، قیژەیێکی بەرزی کێشاو

لەسەر خۆی چوو. ڕوانینی هاوسێکان ئەتگوت اولاوی ترس دایتەنیوە. لە لەشی نووسەریان ڕوانی.

-وەکوو ئەوەی ویستوویە شتێك بڵێ.

-وایە، وشەییێك لەسەر کراسەکەی دەڵەمەی بەستووە.

ژنیان هێنایەوە سەر خۆ. دەرکەوت، گەڕایەوە. بە دەفتەرێکی نیوە تەواو لە نووسراوەکانی شووە نووسەرەکەی. ژن چەن رستەی لە لاپەڕەییێك خوێندەوە ((دوو ساڵ پاش داڕووخانی دیوارەکە، تەرمێك کە بە قەد دیوارەکە درێژ بوو هەستا. تەرم لە جێگاییێکدا ڕاوەستابوو. جووڵەی نەدەکرد، بەڵام ئەمجارە ئەیبینی و ئەیژنەفت و تەنیا وشەییێکی دووپات دەکردەوە "مشك". ژن دیسان جیقاندی و لەسەرخۆی چوو. هاوسێکان ژنیان گەیاندە خەستەخانە.

دوومانگ پاش ئەم ڕووداوە دووایین نووسراوەکانی نووسەر بوو بە کتێب و بڵاوکرایەوە.

دۆستان و هاوڕێکان و ئەندامانی ئەنجوومەنی ئەدەبیی دەستەی *74* بە هاوفیکری یەکتر کتێبەکەیان ناو لێ نا "شورا ئەمبەر و ئەوبەری هەیە".

هێشتا ساڵێك لە مەرگی نووسەر و بڵاوکردنەوەی کتێبەکەی ڕاینەبواردبوو کە خەڵکی گوندی ئەو مەڵبەندە شاخاوییە بە نیازی تەفرو توونا کردنی دووپشکەکان و لە مشك رزگارکردنی ئەو تەرمەی کە لە پای دیوارەکەدا هەستابوو، هەریەکە بە مۆمێکی هەڵکراوە لە نێو دەست، لە نێو شەقامەکاندا ڕێپێوانێکیان سازکرد و لە ڕیزگەلێکی ڕێك و پێکدا بۆ تاراندنی تووی ڕەشایی و فەوتان وەك لێشاو بەرەو شوێنی تەرمەکە و دیواری نێوەڕاستی گوند لە هەر دوولاوە کەوتنە ڕێ.

ژنی نووسەر لە نێوان هاوسێکان و ئەندامانی ئەنجومەنی دەستەی *74* و دۆستان و خوێنەرە بێ ئەژمارەکانی کتێبی تازە بڵاوە بووی شووەکەی لە کاتێکدا کە لە خۆشیاندا دەگریا و دەسنووسی کتێبی شووە نووسەرەکەی بە سینگیەوە نووساندبوو لە دەوروبەریەکانی دەڕوانی و بە دەنگێکی بەرز و پڕ شکۆوە ئەم رستە پرس بزوێنەی هاوار دەکرد: ڕاستی خەیاڵ یان خەیاڵی ڕاستەقینە.

# دوو کورتە شیعری ئەفلاتۆن*

لە ئیسپانییەوە: حەمەی ئەحمەد ڕەسوڵ

-1-

بۆ ئاگاتۆن

کاتێ هاوڕێکەم، ماچ ئەکەم

وا هەستەکەم

ڕۆح لەسەر لێوانمە و

بە ڕاستی ڕۆحێکی داماوە،

ئەیەوێ ڕۆچێتە دووتوێی جەستەیەوە!!

★ ★ ★

ئەو سێوەت بۆ ئاهاوێژم؛

گەر منت خۆشەوێ بیگرەوە..

دە لێگەڕێ با شیرینی جوانیت بە دڵ بچێژم!!

خۆ گەر خوانەکا، لێم بەگومانی

سێو بە هەوادا فرێدە..

ئیدی بە چاوانی خۆت ئەیبینی؛

کە چەند کورتە عومری جوانی!!

-2-

**بۆ ئەستێر**(**)

یەکەم:

چاوت بڕیوەتە ئەستێران

ئەی ئەستێرەکەم!!

خۆزگە ئەبوومە ئاسمان

تا بتوانم،

بە چاوانی هەزاران ئەستێرەوە لێت بڕوانم!!

دووەم:

ئەی ئەستێرەکەم!

جاران لەنێو زیندووانا

وەك سپێدەی بەیان ئەدرەوشایتەوە..

وا ئەمێساکەش،

ئەستێرەی ئاوابوونی و

لەنێو

مردووانا

ئەدرەوشێیتەوە!!!!

## پەراوێز

* ئەفلاتۆن/ یان پلاتۆ /*427–347* پ.ز/ زانا و فەیلەسووفی بەناوبانگی یۆنانی و سەراپای گەردوون، لە پاڵ ئەوەدا کە خاوەنی چەند شاکار و پەڕاوێکی فەلسەفی جیهانییە، کەچی دەرهەق بە شیعر و هونەر تێڕوانینێکی ڕەشبین و سەیری هێناوەتە ئاراوە، گوایە شیعر کارێکی نەگەتیڤانە و خراپ بەسەر دەروون و ڕەوانی خەڵکیدا جێدێڵێ.. بۆیە ئەفلاتۆن -وەك شاعیرێك- جێی سەرسوڕمانە و هەر لەو پێودانگەوە حەزمان کرد، نموونەی شیعری پلاتۆش بە خوێنەری کوردزمانی ئازیز بناسێنین!!!

** ئەستێر: بە مانای ئەستێرە دێ لە زمانی یۆنانیدا.

# لەژێر ئاسمانی شیعردا

میروسلاڤ هولوب

و. لە عەرەبییەوە: عیسا چیایی

I

**"گەرما. لەگەڵ تۆزێ فێنکایی مرۆڤایەتیدا.."**

.. پارچەیەك
لە جیهان دێنن. و
دەیخەنە مەنجەڵێکەوە.
دەیکوڵێنن.

پێی دەگەیەنن. و
گوێ لە دەنگی کوڵانەکەی دەگرن.
بە درێژایی ژیانیان
چاوەڕوانی گرتکە گۆشتی کوڵاو دەکەن.
بەڵام لەژێر ئەو سەرە مەنجەڵەدا
چەند هاوکێشەیەك هەیە.
بەفر .. و
مەشخەڵ..

II

**"بە شەو لە شەقامەکاندا.."**

.. ئەوان
بۆ باڵندەکان، ستران دەچڕن. و
ماڵەکان گەورە دەبنەوە
لێرەولەوێ
تۆزێك قەرمید لە کڵێساکە هەڵدەکەندرێ
پەڕێك
یان پشیلەیەك
یان سەگێك
لە ئاسمان بەردەبێتەوە.
ئەوان
بۆ باڵندەکان، ستران دەچڕن.
ماڵەکان گەورە دەبن و
شوێنێکی سپی ڕاستەقینە
لە دیوارەکانیدا دێ و دەچێ
لە هەناسەدانی مەلایین کەسدا
مانگ هەڵدێ. و
دڵە فراوانەکان
شەو بەرەو ڕۆژ پاڵ دەنێن
هێندەمان بەسە کە زیندووین

هەناسە دەدەین
لێپرسراوین
لە سووڕانەوەی زەوی..

III
"دەرگا"

.. بڕۆ و دەرگاکە بکەرەوە
ڕەنگە لە دەرەوە. دارێك
یان دارستانێك
باخچەیەك
یان شارێکی ئەفسوناوی هەبێت.
بڕۆ. و. دەرگاکە بکەرەوە
ڕەنگە سەگێك بگەڕێ
ڕەنگە ڕوومەتێ
یان چاوێك
یان وێنەیەك
وێنەیەك، ببینی.
بڕۆ. و. دەرگاکە بکەرەوە.
ئەگەر تەم. و. مژێکیش هەبێت
ئەوا دەڕەوێتەوە.
بڕۆ. و. دەرگاکە بکەرەوە.
ئەگەر هەر هیچیش نەبوو جگە لە
تاریکی
ئەگەر هەرچیش نەبوو جگە لە
-با- یەکی وشك
تەنانەت هەر هیچیش نەبوو
بڕۆ دەرگاکە بکەرەوە.
چونکە لانی کەم
شنەیەك دەبێت..

IIII
"پشیلە"

.. لە دەرەوە
شەو. وەکو
پەڕاوێکی بێ پیت وابوو. و
تاریکییەکی بێ کۆتاییش
لە بێژنگی شارەوە
دەتکایە نێو ئەستێرەکانەوە.
پێم وت: نەڕۆی
بۆ هیچ شتێکت ناوێ؟
بەڵام پەنجەرەکە کرایەوە و
ڕۆیشت.
پشیلەیەکی ڕەش لە شەوێکی ڕەشدا
لەبەرچاو ون بوو.
تەنها پشیلەیەکی ڕەش لە شەوێکی ڕەشدا
لە بەرچاو ون بوو. و
هەر هێندە.
ئیتر بۆ جارێکی تر
کەس نەیبینییەوە
تەنانەت خۆیشی.
بەڵام هەندێ جار
تۆ دەتوانی گوێت لێ بێ
ئەودەمەی
دنیا بێدەنگ دەبێ. و
-با-یەکی باشووری هەڵدەکا. و
تۆ
بە وردی
گوێ لە زاتی خۆت دەگری..

**سەرچاوە**

ژێدەر/ گۆڤاری -الاقلام-ی عێراقی لاپەڕە *51-57* ژمارە "*9-10*"ی ساڵی *1992*

پێشەکی وەرگێڕانی بۆ زمانی عەرەبی: سامی مهدي

# لە زامی دڵی...

ئەحمەد شاملو
لە فارسییەوە: هێرش بێتوشی

لەساڵی *1346*دا گۆڤارێك لە ژێر ناوی "جنگ باران" لە گورگان و دەشتدا بڵاو دەكرایەوە. لە ژمارەی یەكەمی ئەو گۆڤارەدا كە سەرماوەرزی هەمان ساڵ دەرچووە نامەیەكی (ئەحمەد شاملوو)ی تێدا هاتووە كە لەسەر شیعرێكی خۆی وەڵامی یەكێك لە نوسەرانی توركمەنی ئەو گۆڤارەی داوەتەوە. ئەو شیعرەی بەر لە ئاڵوگۆڕی هەوای نوێ، لە ژێر ناوی "لە زامی دڵی ئامان گیان" بڵاوكراوەتەوە و لە بڵاوكراوەكانی نوێدا "لە زامی دڵی ئابائی" لەسەر نوسیوە.

"بەڕێز

بەر لە هەموو شتێك پێویستە ئەوەت پێ ڕابگەیێنم كە بە چاوپێكەوتنی نامەكەتان لە ڕادە بەدەر شاد و كەیف خۆش بووم. هیچ دەزانی كە من ئەو شیعرەم لە زۆربەی شیعرەكانی ترم خۆشتر دەوێ؟ و هیچ دەزانی كە ئەو شیعرە، ڕاستەوخۆ بەشێك لە ژیانی منە؟ من توركمەنەكانم لە هەموو چین و توێژێكی دیكە زیاتر خۆش دەوێ. نازانم بۆ. ماوەیەكی دوور و درێژ لە ناویاندا ژیاوم. لە "بەندەر شا" وە بگرە تا "ئەترەك" زۆر شەوان لە ڕەشماڵەكانی ئێوەدا خەوتووم، زۆر ڕۆژان لە هۆبە و هەواری، لە ناو سەگەل، لای كلاو چەرمیان، لە ژێر نیگا و تێڕوانینە گوماناوییەكان، لە دەشتە پڕ لە هات و هوت و سەوز و بێ كۆتاییەكان، لای ژنەكەم دوور راز هەڵگر و جل و بەرگ و لەچكە ڕەنگ تێرەكان، لە پەنای داشقە و ئەسپە گەردن كێل و غەرەكان بەسەرم بردووە.

كچانی دەشت! كچانی توركەمەن پێوەندیان بە شارەوە نییە. (نازانم ئایا پێویستە ئەو شیعرە بەو شێوەیە شی بكەمەوە؟ هەرچۆنێك بێ ئەو كارە بۆ من وەكو وەردانەوەی بیرەوەریەك وایە). شار، پیس و پڕ لە قسە و باس و بەرەڵلاییە. كیژانی توركمەن لەدایكبووی دەشتن و وەكو دەشت خۆڕاگر و ڕاز هەڵگر و بێ دەنگن.. ئەوان تەنیا كچی دەشت، كچی سەحران. هەروەها شۆڕە كچی چاوەڕوانین. ژیانیان بریتیە لە چاوەڕوانی و بەس. بەڵام چاوەڕوانی چی؟

"چاوەڕوانی بڕان"؟ لە قولایی بیریاندا چاوەڕوانی هیچ شتێك نین. ئەدی چاوەڕوانی بڕان و تێداچوونی خۆیانن؟ لە هەژاری و دان بەخۆداگرتن زیاتر لە سەرانسەری دەشتدا هیچ شتێك فەرمانڕەوایی ناکا. بەلام دەنگ هەر لە بێدەنگیدایە. کیژەکانی ئەو چاوەڕوانییە بێ ئەنجامە، لەو دەشتە کاکی بە کاکیەدا بە هیوای چ شتێکن؟ ئەرێ هیچ هیوایەتێکیان هەیە؟ نەء! دەشت بێ بڕانەوەیە و ئەوان هیوابڕاو. لە خوو خدەی بەرتەسکیاندا گەلێك ئاواتی وەدی نەهاتوو بوونە کۆست، ئاخر ئاوات هەرچەند بێ بایەخیش بێ، ئەگەر وەدی نەیێ، هەر لە بڕان نەهاتوو دەنوێنێ.

هیوایەتیان ڕەشماڵی نوێیە، بەلام لەگەڵ ئەو ئاواتەشدا لە کۆنە ڕەشماڵی ئەوتۆدا دەژین کە سەدان ساڵیان بەخۆوە دیوە.. وەکو چوزەرەیەکی تازە پشکوتوو دەچن کە لە ژێر تیرێژی بەتینی بیرکورتیدا گیریان خواردوە. ئەگەر ئەو تیرێژەیان لەسەر نەمێنێ، هەموو هیوا و ئاواتێکیان وەدی دێ. هەروەکو یالی درێژی ئەسپێکی کێوی کە بە پشوە بای بەهێز پەرێشان دەبێ.

مەبەستم تەنیا وریاکردنەوەی ئەوانە:
وەك خونچە ئەگەر لەو بەرگە سەر دەربێنن
بای بەهێز
یالی درێژی ئەسپی کرنۆش ئالۆز دەکا.

لە دونیادا هیچ شتێك لەوە بۆ من خەیاڵ لاوێنتر نەبوە کە لە دورەوە، سەیری دیمەنی ئێوارانەی هۆبەیەك بکەم. ئەو ئاگرانەی لە دەرکی هەموو ڕەشماڵێك بۆ ڕەتاندنی تەپۆ مێشولە دەکرێتەوە. ئەو بڵێسە باریك و بەرزانەی لە ئاگرەکە هەڵدەستێت و دووکەڵەکەی لە سەروی ڕەشمالان ئامێز بە یەکتردا دەکات و بەرەو ئاسمان هەڵدەکشێت.. دەڵێی لەسەر ئەستوندەکی بڵێسە ئاگرەکان، تاقێکیان بە دوکەڵ لێداوە!

ئەوان کچی مەڵبەندێکی ئەوتۆ و سروشتێکی ئەوتۆن. ئەوین و خۆشەویستیان لێ نامۆیە. ئەوان کچی عشق و ئەوینی دورن. لە مەڵبەندی ئێوە، واتای "ڕۆژ" کار و بێدەنگیە. ئەوان کیژی ڕۆژی بێدەنگی و کارن. لە مەڵبەندی ئێوە واتای "شەو" ماندوییە. ئەوان کیژی شەوانێکی ماندویین. ئەوان کچی ڕۆژ تا ئێوارە ڕاکردنی بێ ماندویین. ئەوان کیژی شەوی هەموو شەوێك بە خۆداشکانەوە و لە کونجی بێ مافی خزێنن.

ئەگەر هەڵپەڕن، شان و پیلیان لە شۆڕی و جوانی شەلال دەکا، بەلام تاقگە لە باغی چۆلی کام ئەویندا وەسەما دەکەوێ؟ ئەگەر کچانی هیندوو بەپێی داب و نەریتی باویان لە خۆشی سەرکەوتنێك و بۆ ڕێز لە خواکانیان، لە پەرستگاکانیاندا هەڵدەپەڕن، کچانی تورکمەن لە خۆشی کام ئاوی ئاگر دامرکێنی ئاواتیاندا کۆڕی هەڵپەڕکێ ببەستن؟ هەتا ئێرە لەسەر یەك باس لەسەر ئاواتە کپکراوەکان بوو.. بەلام بێ سودە کە شاعر عەتری وشەکانی بە لێدوانێك لەسەر ئەگریجە و نیگایان لێڵ بکا. ڕاستیەکەی لێرەوەیە کە دەست پێدەکا: ژیانی کچانی تورکمەن بریتیە لە هاتووچۆ لە دەرودەشتی مژ گرتوودا، بریتیە لە بەخۆداشکانەوەی "ژن بوون"، شەرم لە سروشت و مێگەل و شەرم لە ژێردەستی لایەنی جنسی خۆیان...

ئامان گیان، گیانی خۆی لەسەر ئەوە دانا کە سەحرا، لە هەژاری و کپیدا نەمێنێ. کیژی تورکمەن بەرگی بە خۆداشکانەوە لەبەر خۆیدا ڕنی، شان بە شانی پیاوی خۆی بژیەت و دەست و مەچەکی شەلال ئاسای لە خۆشی وەدی هاتنی ئاواتەکانی هەڵێنێ..

پرسیاری من ئەوەیە: کچانی دەشت لە سوێی زامی گوللەیەك کە سنگی ئامان گیانی پێکا، دڵی کامتان دڵۆپێك خوێنی لێ تکا؟ لە ئێوە کامتان ئەوینی ئەو بوون؟ مەمکی کامتان لە بەهاری ژیانی ئەودا چرۆی دەردا؟ لێوی کامتان عەتری ماچێکی نەهێنی لە ئاواتی ئەو رشاند؟

و ئێستاش کە ئامان گیان، بە جەرگی بە گوللە سمراوییەوە لە ناو دڵی گڵی فێنکدا خەوتوە، ئاخۆ خۆشەویستەکەی هەر لە فکریدایە؟ ئاخۆ هێشتاش گراویلکەکەی بیر و بۆچوون و بڕوای ئەوی لە دڵدا ماوە؟

لە تاریکی شەوانێکدا کە بە هۆی باران دەست لە کار هەڵدەگرن و سەر بە ڕەشماڵەکانیاندا دەکەنەوە، لە ئێوە کچانی دەشت کەس هەڵکەوتوە بە یادی پیاوێك کە لە ڕێگای ئێوەدا سەری نایەوە لە ناو نوێن و بالیفی تەنگ و دزێو و خەو لێ ڕەوێن، لە ناو نوێنی پڕ لە دەرد و ژان و بێمرادی خۆیدا تا بەیانی نەخەوتبێ؟ ئاخۆ بە رادەیەکی ئەوتۆ بیرتان لێ کردوەتەوە کە خەو لە چاوتان نەکەوێ؟ ئاخۆ بەو ڕادەیە لە فکر و بیریدا هەن کە هەتا درەنگانێك چاو لێك نەنێن و بڵێسەی ئاگری ناو کوانووی ڕەشماڵەکە لە ئاست چاوتاندا شەبەق بداتەوە؟

لە ناو ئێوەدا کامتان مشت و ماڵی دەدەن.

چەکی ئامان گیان

بۆ

ڕۆژی

تۆڵە؟

شیعرەکە تا ڕادەیەك لێك هاڵاوە، دەیسەلمێنم.. ڕەنگە پێتان سەیر بێ ئەگەر بڵێم بە چەند مانگ لە "قەرەتەپە" و "قوم چلی" و "قەرەداش" کۆمباین و تراکتۆرم لێخوڕیوە.. لە خانوە خشتکار و قوڕەکان بێزارم و دەشتە کاکی بە کاکی و کلاو چەرمیەکان و ڕەشماڵەکانی تورکمەن و سەحرام قەت لە بیر ناچنەوە."

شاعیر لە بیرەوەریەکی تریدا دەنووسێت:

"ئابائی مامۆستایەکی تورکمەن بوو کە لە بیستەکاندا لە گورگان بە زەبری گوللە کوژرا.. لە بڵاوکراوەکانی زەمانی شادا لە ترسی هەڵپەرداوتن و لق و پۆ تێککردنەوە، ناوی ئەو شێعرە لە ئابائیەوە بە ئامان گیان گۆڕدرا و ئەویش" بە پاڵەوانی یەکێك لە ئەفسانە تورکمەنیەکان" ناسێندرا..

شەوێکی زۆر درەنگ (لەناو یەکێك لە ڕەشماڵەکانی تورکمەندا) وام هەست پێ کرد کە لە ژێر پێلوە بەستراوەکانی چاومدا هەروا بەخەبەرم. هەوڵمدا بخەوم، نەکرا. لە ئەنجامدا چاوم هەڵێنان. لە بەر شەبەقی زەرد و سووری سکڵی ناو کوانوەکە یان ڕەنگە تروسکایی فانۆسێك کە بۆ ڕێزگرتن لە میوانان لە گوێی ئاگردانەکە داندرا بوو، هەمبەر بە خۆم، بەوبەری قوڵکاورەکەوە دەم و چاوی خرپنی کچی خاوەن ماڵەکەم بەرچاو کەوت کە لە گێژاوی بیرێکی قوڵ و بەریندا هەروا بەخەبەرە و چاوی لە تروسکە تروسکی ئاگرەکەوە بریوە.

ئەو غەمەی لەو چاوە بە مۆلەق ویستاوانەدا دیتم، قەت لە بیرم ناچێتەوە. بەر لە خەوتنمان باسی ئابائی کرا. پرسیارم لە کچەش کردبوو کە ناسیویەتی؟ وەڵامی نەدابۆوە. کاتێك کە ئاوەها درەنگ دیتم هەر نەخەوتوە، لەبەر خۆمەوە گوتم:

بیر لە ئابائی دەکاتەوە.

لە دەرەوە تریەی یەك هەوا بارین و نووزەی سەگێکی دوور و تەنیا بەر گوێ دەکەوت. حەوتوویەك دواتر شێعرەکەم نووسی."

## ڕۆمانی "شاری دڕندەکان" لە عەرەبییەوە: ڕەووف بێگەرد

### سەرکێشیی ئیزابیل ئەلیندی لە جەنگەڵەکانی ئەمازۆندا



ئیزابیل ئەلیندی

هەموو ساڵێك، لە هەشتی کانونی یەکدا، ئیزابیل ئەلیندی وشە سەرەتاییەکانی هەر ڕۆمانێکی نوێی کە لە سەروبەندی نووسینیدا بێت دادەڕێژێ، لە ساڵی *1982* وە کە هەواڵی مەرگی باپیری بیست ئەمەی لێ بووەتە نەریت و پەیڕەویی لێ دەکات، لەو ڕۆژەوە ئەلیندی بوو بە ڕۆماننووس، کەوتە نووسینی نامەیەکی درێژ بۆ باپیرە تازە مردووەکەی، کە پاشان نامەکە بوو بە ڕۆمانی "خانەی تارماییەکان" کە یەکێکە لە ڕۆمانە جوانەکانی و دەرگای بۆ خستە سەرپشت بە ئاسانی بڕواتە ناو دنیای ڕۆماننوسییەوە دوای ئەوەی سەرکەوتنێکی لە ڕادەبەدەری بەدەست هێنا. لێرەوە قەناعەتێك یان خورافەیەکی چکۆڵە لای نووسەر دروست بوو کە هەموو جارێك، لە هەمان ڕۆژدا کارە ڕۆماننووسیە تازەکانی دەست پێ بکات.

ڕۆمانەکانی ئەلیندی زیاد لە *35* ملیۆنیان لێ چاپ کراوە و بۆ سەر بیست زمان زیاتریش وەرگێڕاون، هەموویش کراونەتە فیلم، بە ڕاستیی ئەلیندی "کچی بەخت"ە، کچی بەخت ناونیشانی یەکێك لە ڕۆمانەکانییەتی.

### ڕۆمانی مێردمنداڵ

ئەلیندی دوای چەند مانگێك لە ئاهەنگی شەست ساڵەی لەدایکبوونی، لە مانگی ئەیلولی ڕابوردوودا، ئامادەی ئاهەنگی پەیماننامەی ڕۆمانە تازەکەی بوو کە ناوی "شاری دڕندەکان" (مدینة الوحوش)ە، ئەم ڕۆمانە لە یەك کاتدا لە *15* وڵاتی ئەورووپا و ئەمریکا و ئەمریکای لاتیندا چاپ کرا. وەرگێڕانە عەرەبییەکەیشی خێرا لە لایەن ساڵح عیلمانییەوە کرا و لە بنکەی بڵاوکردنەوەی - دار البلد- لە دیمەشق بڵاوبووەوە.

"شاری دڕندەکان" ڕۆمانێکە بۆ مێردمنداڵان نووسراوە، ئەمە بەشی یەکەمی سیانەیەکە کە نووسەر دەیەوێت بەرودوا بیان نووسێت، ئەلیندی ڕۆمانەکەی پێشکەش هەرسێ نەوەکەی کردووە کە خۆیان خاوەنی بیرۆکەکەن و هەر خۆیشیان داوای نووسینیان لێکردووە. خۆی وا باس لە ڕۆمانەکە دەکات:

"ویستوومە ڕواڵ (موراهق)ێك لە دنیا هێور و سەقامگیرەکەی کالیفۆرنیا دەربکەم و بیخەمە ناو گێژەنی ژیانەوە، بەوەی بەرەو ئەمازۆن کۆچی پێ بکەم.. چونکە تۆ توانای ڕاستەقینەی خۆت نازانیت ئەوکاتە نەبێت کە ژیان لە ڕووتا تەنگ و ناخۆش دەبێت" هەروەها دەڵێت: گرنگ ئەوەیە لە ترس نەترسیت، ئەمەیش بنەمای سەرەکی ڕۆمانەکەیە کە چوونە ناو جەنگەڵەکانی ئەمازۆنە، ئەو جێگایەی لە هەموو چرکەساتێکدا و لەناو ئەو سروشتە پڕ لە ترس و سامناك و نهێنییەدا ترسی هەموو گیانی مرۆڤ دادەگرێت.

"شاری دڕندەکان" چیرۆکی مێردمنداڵێکی تەمەن پانزە ساڵە بە ناوی -ئەلیکس کولد- کە

لەگەڵ باوکی و دایکی و هەردوو خوشکیدا، لە شارێکی کەناری کالیفۆرنیای ئەمریکادا ژیانێکی خۆش بەسەردەبات. باوکی بڕیار دەدات بینرێتە ماڵی نەنکی لە نیویورک، چونکە دایکی منداڵەکە تووشی نەخۆشیی شێرپەنجە هاتووە و پێویستیی بە چارەسەری زۆر خایەنە و ناتوانێت بەو نەخۆشییەوە ئاگاداری خێزانەکە بێت، ئەگەرچی ئەلیکس نایەوێت بڕواتە لای نەنکە دڵڕەق و بەدەسەڵاتەکەی، بەڵام لە دواییدا بە ناچاری سەر بۆ فەرمانەکە دادەنەوێنێت پاش ئەوەی قەناعەت دەکات کە هیچ ڕێگایەکی بێجگە لەمە نییە بۆچوونە ناو ئەزموونێکەوە کە لە خەون دەچێت.

لە نیویورک -کاتی کولد-ی نەنکی کە وەك ڕۆژنامەنووسێك لە گۆڤارێکی زانستیدا کاردەکات هەواڵێکی کتوپڕی بۆ کوڕەزاکەی ئامادە کردووە کە چاوەڕوان نەکراوە، ئەویش ئەوەیە هەردووکیان بەرەو دارستانەکانی ئەمازۆن سەفەر دەکەن لە چوارچێوەی گەشتێکی زانستیدا کە گۆڤارەکە ڕایدەپەڕێنێت، بۆ گەڕان بەناو ئەو جەنگەڵ و دارستانە چڕەدا بە دوای دڕندەیەکی خەیاڵیدا کە بۆنێکی تیژ و ناخۆش بڵاودەکاتەوە هەرکەسێکی لێ نزیك بێت دەیخات. ئەو دڕندەیە وەك نەنکەکە بە کوڕەکە دەڵێت هاوتایەکی ئیستواییە بۆ ئەو پیاوە بەفرینەی لە هیمالایەدا هەیە. ئیتر چەندە توانای ئەلیکس لەسەر پێشهات و ئایندەبینی تیژ و ورد بێت، هێشتا کەمبینە لەوەی بزانێت لەسەر ئەو زەوییە دوورەدا چی بەسەر دێت، بێگومان کە خۆی دەکەوێتە ناو ئەزموونەکەوە لەسەر زەمینەی واقیع بەو ڕاستییانە دەگات.

دوای ئەوەی هەموو ئەوانەی بەشدارن لەو سەفەرەدا پێك دەگەن (ئەنتەرناسیونال جیوگرافیك) کە بریتین لە وێنەگر، سەرباز، توێژەرەوەی ئەنترۆپۆلۆجی، پرۆفیسور لیبلانك، ژنە پزیشك ئومایرا توریس، چاوساغەکەیان سیسر سانتوس و نادیای کچی، لەگەڵ نەنك و کوڕەزاکەیدا گەشتەکە دەست پێ دەکات، گەشتەکە لەناو سروشتێکی پڕ لە مەترسی و سام و سەرچڵیدا دەست پێ دەکات کە لێوانلێوە لە دڕندە و زیانەخۆر و مارو تیمساح و شێر و پڵنگ و باڵندەی ڕاوکەری جۆراوجۆر و گیانداری پەلاماردەر و ڕووەکی سەیر و درەختی مەزن کە تیرەی قەدی هەندێکیان دە مەتر دەبێت.

لەو دنیایەدا کە ئەلیکس وێنەی نەدیوە تەنیا لە حیکایەت و سینەمادا نەبێت، دەبێتە هاوڕێی کچی چاوساغەکە کە کیژۆڵەیەکە، پەیوەندییەکی پتەو لە نێوانیاندا دروست دەبێت، ئەو کارەساتانەی پێکەوە لەو وڵاتە سەیرەدا تووشی دێن زیاتر هاوڕێیەتیەکەیان بەهێز دەکات، بە تایبەت ئەو پێشهاتە سەیر و ئەفسووناوییانەی لە کاتی ونبوونیاندا لەناو جەنگەڵستانەکەدا تووشیان دێت و ناتوانن بگەڕێنەوە، لێرەوە گەشتە خەیاڵییەکە دەست پێ دەکات کە ئەلیندی بە خەیاڵە دەوڵەمەند و بەپیتەکەی وردەکارییەکانی دەچنێت. ئەلیکس و نادیا حەقیقەت و وەهمیان لێ ئاوەژوو دەبێت، وەك پێکەوە لە شارێکی خەیاڵیدابن، گەلێك لەو شارەدا نیشتەجێیە بە ناوی "گەلی تەمتومان"، کە بە پێچەوانەی نەریتی خۆیان، هەردوو تازە هاتووەکە دڵنیا دەکەن، نهێنییەکانی سروشتی ئەوێیان بۆ ئاشکرا دەکەن، ئەمەیش بە هۆی ئەو گەشتانەوە کە بۆ ئەلیکس و نادیای

سازدەکەن و شارەزای خوو ڕەوشت و نەریتە کۆنەکانی ئەو گەلە دەبن کە هەزاران ساڵە بۆیان ماوەتەوە و بە هیچ جۆرێك لە ڕێورەسمی ئەو وڵاتە ناچێت کە لێوەی هاتوون.

### خەیاڵ و هەندێك ئامۆژگاری

لەگەڵ ئەوەدا کە مۆرکێکی حیکایەتخوانی بە ئامانجی کات بەسەربردنی تیایە، بەڵام ڕۆماننووسی لایەنێکی ئامۆژگاری و ئاکاریش لەبەر دەگرێت کە بۆ مێردمنداڵەکانە، بۆیە ئەو سەرچڵی و مەترسیانەی لە خەیاڵ بەدەرن و ئەلیکسی تیایاندا دەژی هێشتا نەخۆشیی دایکی لەبیر نابەنەوە.

لەناو جەنگەی ئەو شەخەڵ و دارستان و ئەشکەوتە تاریکانەدا ئەلیکسی ئەوەی لەبیر ناچێت کە ئاوی ژیان بۆ دایکە نەخۆشەکەی پەیدا بکات، بە کردەیش بەو ئامانجە دەگات. بەمجۆرە نووسەر گەلێك هەڵوێستی ئینسانی پڕ لە سۆز و نموونە ئاکارییەکان دەخاتەڕوو کە شکۆمەندیی بەهای وەفاداری و لێبووردن و ئازایەتی و دادپەروەری و هەقیان تیا دەردەکەوێت، گەلێك جاریش ململانێی نێوان چاکە و خراپە دەبینین کە وەك ئەنجام چاکە بەسەر خراپەدا سەردەکەوێت.

دوای ئەم گەشتە ئەلیکس و نادیا سەرلەنوێ ئەندامەکانی تری سەفەرەکەیان دەدۆزنەوە کە چاك و خراپیان تیایە، دیارە ژیان لەو سروشتە دڵڕەق و بێبەزەییەدا پەردە لەسەر نیەتە چاك و خراپەکانی مرۆڤ لادەدات، چونکە ئەو پیلانە ترسناکەی ماوروکاریاسی دەوڵەمەند دەردەکەوێت کە دەیەوێت "گەلی تەمتومان" لەناوبەرێت و دەست بەسەر زێڕ و ئەڵماس و پێستەی ئاژەڵەکانیان و شتی تری وەك سامانەکانی زەوی ئەو گەلەدا بگرێت. ڕۆمانەکە بانگەوازە بۆ پاراستنی بێگەردی و پاکژی و بێوەیی سروشت لە چاوچنۆکی مرۆڤ و پارێزگاریکردنی ژینگە.

ئیزابیل ئەلیندی ڕۆمانەکەی لەسەر زمانی کەسی نادیار بە شێوازە ڕەوانەکەی دەگێڕێتەوە، بەڵام تایبەتمەندییەتی ئەم ڕۆمانە، وەك خۆیشی دەڵێت لەوەدایە کە "دیمەنی ئیرۆسی و هەستیەکانی پشتگوێ خستووە" کە لە ڕۆمانەکانی تریدا زۆری بەکارهێناوە، هەروەها ڕۆمانەکەی بە شێوازێکی ئاکاریانەی قوتابخانەیی دوور لە هەڵچوون داڕشتووە. نووسەر ئاسایی کات و بێدەنگی بە خۆی دەبەخشێت بۆ گوێگرتن لە کاراکتەرەکانی و، هەوڵدان بۆ دۆزینەوەی بێوەیی (بەرائەت)ەکان وەك لەم ڕۆمانەدا لەگەڵ ئەلیکس و نادیادا کردوویەتی. هەروەها لەم ڕۆمانە و لەوانی تریشیدا پشتی بەو کلتوورەی ئەدەبی ئەمریکای لاتین بەستووە کە قوتابخانەی ڕیالیزمی جادووییە، بە تایبەتی شێوازی گابریل گارسیا مارکیز کە کەم تا زۆرێك جێپەنجەی بە نووسینی ئەلیندیەوە دیارە، ئەو نووسینانەی خەیاڵی خوێنەر دادەگیرسێنێت بە کەسایەتی و کارەسات و ڕووداوەکانی و، چی تری بۆ نامێنێتەوە بێجگە لەوەی زۆر بە بێدەنگی گوێ لە گێڕانەوەکەی بگرێت.

**سەرچاوە**

الحیاة- آفاق- ژمارە *1456* ڕۆژی *18*ی ك*1* *2002*



## ئاهەنگی ماڵاوایی
## میلان کۆندێرا

**رۆمانێکی پێنج بەشییە، لەساڵی *1976*دا، بەزمانی چیکی نوسراوە، لە فەرەنسا چاپ کراوە. پیتەر کوسی کردوویەتی بەئینگلیزیی.**

**نوسینی: ساوڵ مالۆف**
**لە ئینگلیزییەوە: ئاوات ئەحمەد**

کۆندێرا یەکێکە لەو نوسەرو رۆشنبیرانەی بە هێمنی لە بەهارە کورتەکەی پراگدا، گەشەیان کرد، هەوڵە شوومەکەی ئەلەکساندەر دۆبسێك بۆ خولقاندنی ناوچەیەك بۆ "سوسیالیزمێکی سیما مرۆییانە" کە پێش ئەوەی دەستپێبکات، لە ژێر زنجیری تانکەکانی سۆڤێتدا، لە هاوینە ساردەکەی ساڵی *1968* دا، بە شێوەیەکی زۆر کارەساتاوییانە کۆتایی پێهات. کۆندێرای شاعیرو شانۆنامەنوس و مۆسیقازان، هەروەها رۆماننوس و کورتە چیرۆکنووسیش.. لەبەرئەوەی رازیی نەبوو پەشیمان ببێتەوە، تووشی زەحمەت و ئازارێکی زۆر بوو، لە یەکێتی نوسەران دەرکرا، پۆستی وانەوتنەوەی لە قوتابخانەی فلیمسازیی پراگ لەدەستچوو، پاسپۆرتەکەی لێ ستێندرایەوە، شانۆنامەکانی قەدەغە کران، دەوڵەت زۆر بە قورسی تۆڵەی لێکردەوە. بوو بە نەفرەتلێکراوێکی رەسمیی، بەلام رازیی نەبوو بەو شێوەیە رەفتار بکات کە ئیزاك بابێل ناوی لێنابوو "ئیستاتیکای بێدەنگیی"، ئەم لەسەر نوسین بەردەوام بوو، وردە وردە لە ئەوروپای خۆرهەلاتدا شۆرەتی پەیدا کرد، لە ساڵی *1973* دا، رۆمانی ژیان لە شوێنێکی دیکەیە، خەلاتی پری مێدیس ئێترانگەری پێ برا. ئەم رۆمانەو رۆمانی گاڵتەش، پێکەوە لەگەڵ کۆمەڵە چیرۆکێکدا بە ناونیشانی "ئەڤینە پێکەنیناوییەکان" لەم ولاتە چاپ کران. بۆیە ئەوە شتێکی ئاسایی نیە، کە لێرە ناسراو نیە. جێگای بەزەییە، لەوکاتەوەی گەیشتۆتە ئێرە، نەك وەکو کەسێکی بێدەرەتانی شایستەی بەزەیی پێدا هاتنەوە، بەڵکو وەکو نوسەرێکی درەوشاوەی هەمیشە نیگەران گەیشتۆتە جێ.

کۆندێرا وەکو بەشی زۆری کارەکانی پێشووی، مێژووی نزیکی خۆی بەخشیوە بە رۆمانە نوێیەکەی و، دیسان و دیسان پێچەوانەی دەکاتەوە، هەتا ئەو ساتەی دەبینین زاراوە بالادەستەکانی تێگەیشتن بە تەنیا لەمۆرکە باش دیاریکراوەکەدا بوون، لە کاتێکدا وریایی ئێمە بەشێوەیەکی دزێوانە، بەرەو شوێنێکی تر لاتریسکەی دەبەست. کێ ئەتموسفیری گاڵتەجاریی سێکسیی لە رۆمانێکی چیکیی هاوچەرخ چاوەڕێ دەکات، بەجۆرێکی وەها کە هەموو مەسەلەکە قلپ بکاتەوە؟

"ئاهەنگی ماڵاوایی" وادەردەکەوێت لە رووناکیدا شۆردرابێتەوە. عەیادەی بەپیتکردنی کانزایی و منداڵبوون تەنیا چوار سەعات ئوتومبیل لێخوڕین لە پایتەختە ناونەنراوەکەوە دوورە، بەلام لەوانەشە لە جیهانێکی تریشدا بێت لە دەرەوەی کات. خانمە نەزۆکەکان، کۆرسێکی نامۆن، لەو دەوروبەرەدا لەناو ئاوی کانزاییدا شلپەشلپیان دێت، بە هیوای ئەوەی بەهۆی خۆنوقمکردنێکی پەرجودارانەوە، گوڵ لە بیاباندا بگەشێتەوە. هەرواش دەبوو، گوڵ دەگەشایەوە، خانمەکان کەمێك گومانیان لەوە هەبوو کە رەنگە سەرچاوەی پیتێنرانەکەیان بریتی بێت لەو دەرزییە راستەوخۆیەی کە لە لایەنی

زانایەکی شێتەوە لێیان دەدرا، ناوی دکتۆر سکرێتا بوو، سپێرمەکانی خۆی بەسرنج لێدەدان. چ حاڵەتێکی لەمە قۆشمەترو ئیرۆتیانەترو ئاڵووالاترە، لەو گەمەو رابواردنەدا کە بەروکەش هیچ مەبەستێکی تری نیە؟

هەموو کاراکتەرەکان و بارودۆخەکان، جەخت لەمە دەکەن، بۆ نمونە، رۆزینای سستەر (نمونەی یاریدەدەرێکی شیك)، تازە ئاوس، کە دەشێت بەرەنجامی "دوو سەعاتە شوومەکە" بێت لە ژوورەکەی ئەپارتمانی کارل مارکس لەگەڵ کلیمادا، مێردە مێبازەکەی کامیلیا، هاوسەرە خیانەت لێکراوەکەش لە بەرامبەردا تووشی شۆکی فانتاسیای سێکسیی دەبێت. کاراکتەرەکان سەرەخولێیانە، رەوشە پڕوپووچەکە لە هەرایەکی دۆزەخییانە دەچێت. کاراکتەرێکی نوێ دێتە ژوورەوەو ئەتمۆسفیرەکە ناسك دەبێتەوە، ئەوە جەیکۆبە، قوربانییەکی سەرلەنوێ راهێنراوەی پاکژکردنەوەی ستالینیزمە، لە ماڵی مردووانەوە گەڕاوەتەوە، لە لایەنی هاوڕێیەکی دێرینیەوە خیانەتی لێکرابوو، هەوڕێکەی فەرمانبەرێکی رەسمیی قۆز بوو، دواتر خۆشی لە لایەنی سەرۆکەکانییەوە کوژرا. دواتر گەرچی جەیکۆب بەڕێوە بوو بەرەو ژیانێکی نوێ لە وڵاتێکی تر، وادیاربوو چارەنوسی وابوو ببێت بە سیمایەکی تری شێوازی پانتۆمایم.

کەواتە لەوێ لاسایی کۆمیدیای سێکس دەکرایەوە، یان وادیار بوو. لە توێی ئەو تۆنە زوقماوییەوە، بۆ ئەو کۆمیدیا باڵاو شیك و دونیاییە، رێك وەك گێڕانەوەکە بە جوانی لە نمونەکانیدا دەیچنێت، هەتا دیزاینە حەتمییەکە بە تەواویی بەرهەم دەهێنرێت. بەڵام کارەکەی کۆندێرا کۆمیدیاو گاڵتەجاڕییە، گەرچی لە تێڕوانینی ئەودا بۆ ژین و مەشقی هونەریش، بەرەنگارییەکە کە هەمیشە لە لایەنی تۆنە تاریك و تەژمەکانەوە وێران دەکرێت و دەگۆڕدرێت.

لە روناکییەکدا کە لە سێبەردا کۆتایی دێت، چی دەستپێدەکات. باوکی رۆزینای سستەر، داکۆکیکەرێکی کەللەرەق لە باوەڕ، پێی وایە سەگە خوێڕییەکان دژێوترین دوژمنی خەڵکن. لەگەڵ هاوڕێکەیدا.. کە پاسەوانێکی سوری ئایدیۆلۆجیای سەگ راوکردنە، بە شێوەیەکی سەمەرە، بە جلەشڕێکی سەربازییەوە، بە تورەیی و شانازییەوە سۆندەیەك بادەدات و خۆی بە قامچی ئەوان دادەنێت.

بە شێوەیەکی چاوەڕواننەکراو، رۆزیناو جەیکۆب پێکدەگەن، هەردوکیان بە یەکتریی بیانین. شتێك لەسیمای جەیکۆبدایە... زرنگییەکی مەتەڵاویی.. رۆزینا هەراسان دەکات، بۆیە دەست دەکات بەخۆبادان و خۆدەرخستن. ئەویش دڵی دەست دەکات بە تەپەتەپ "دێڵە سەگێك سیمای مرۆڤی پێوەیە" سەگکوژەکان دەیانەوێت سەیری ناو تانکیەکانیش بکەن. ساتێك لەمەو بەر رۆزینا گاڵتەی بەو "دەمارگیرییە گەمژەیانە" دەهات، ئێستا خۆشی دەبێت بە یەکێك لەوان و لە ترسی رۆحی خۆی بەسەر جەیکۆبدا هاوار دەکات:"گرەو دەکەم تۆ لەو جۆرانەی کە عەرەبانەی ساواش پڕ دەکەن لە سەگ". چاوەکانیان لە" بەریەککەوتنێکی رقاویدا" پێك دەگەن".

ساتێکی پڕوپووچ بوو، مشتومڕ لەسەر سەگێکی زلەی خوێڕیی و هەندێك شتی تر، بەڵام جەیکۆب لە هەڵاوسانی بێمانای

سـيماى ئـەودا هـەموو شـێت و وێتییـەكی وڵاتەكـەی خـۆی دەبینییـەوە، لـە كـاتێكدا رۆزینـا هەسـتی دەكـرد زرنگییـە زبـرو ناقۆڵاكـەی جـەیكۆب "ئایرۆنییـە بێزراوەكـەی" تێـی هەڵدەداتـەوە بەرەو ئەوشوێنەی بە وروژاویی و جۆشاوییەوە لێوەی هاتبوو، ئەو شـوێنەی نەیدەویسـت لێـی بمێنێتـەوە، پـاڵی پێـوە دەنێـت بـەرەو ژیـانێكی قـێزەوون لـە شارۆچكەیەكی لادێییانەدا، وەكو سستەرێك كە خاولی خاولی و كەل و پـەل بـدات بـە ژنـە نەزۆكـە داتەپیوەكان. جەیكۆبی پیاوچاك، بە ئەزمونەكەی خۆیەوە، لەناكاو دەیـەوێت بەشـێوەیەكی ئـەدەبیی لـەناوی ببـات، كـەچی هیشـتاش خـۆی لـە حوكمەكـەی خـۆی ناوەرتە دەكات كە دەڵێت پیاوان هــەر هــەموویان بكــوژن و پێویستییان بە هەڵێكە.

دیمەنەكە كورتـە، راڕەوێكـی پشێو لە جەرگەی گێڕانەوەكەدا، بـەڵام دیمـەنێكی بنەڕەتییـەو سـتراتیجی نوسـەرەكەی دەردەبڕێـت. كـە شـتێكی ئـەوتۆ روو نـادات، كۆندێـرا شـوێنی هەڵچوونەكـەی خـۆی دەكـەوێت دەنگەكەی زیاتر هێـور و بـەرێزو لێـهاتووەو قۆشمەییـەكی نەشتەرگەرانەی پێوە دیارە. بەڵام شـتێك روویـداو رۆشـنایيە دڵتەنگەكەی خۆی بڵاو دەكاتەوەو دەگاتە سەرەنجامەكان: كچەكە بە راستیی دەمرێت بە لامسەلایی و نائەنقەست دەكوژرێت. مەرگێكی بچـووك، راوەسـتانێكی كـورت، هــەرزوو لــە لایــەنی زۆربــەی كاراكتەرەكانەوە لەبیر دەكرێت و بـە لافـاوی ژیانـەكانی ئـەوان دەشـوۆرێتەوە. جـەیكۆب روو دەكاتـە هـەندەران و تاراوگـە هەڵبژاردەكـەی خـۆی، كەللـەی بـە لـق و گـەڵاكانی ئەندێشـە دادەگیرسـێت، مردنـی قەشـەنگی دیمـەنی سروشـتیی وڵاتەكـەی خـۆی لـەناو لـە دەسـتدانی نیشـتمانەكەیدا دەتوێتەوە.

كۆندێـرا خۆشـی دوورخراوەیـەكی ناوخۆییـە لـە چیكۆسـلۆڤاكیا، ئـەو چەشـنە رۆمانەی كردووە بە مۆدێلی خۆی كـە تـا ئێسـتاش بـۆ نوسـەری ئـەوروپای خـۆراوا دەشـێت، كـە نایـەوێت دان بـە سـزا تێكشێكێنەرەكاندا بنێت. گومـان لەوەدا نیە، كە هێشتا بەدڵسۆزیی ماوەتـەوە بـۆ بـەهرە ناسـك و زۆرزان و سـركەكەی دەربـارەی شـێمانە ئیرۆتییـەكان.. لەگـەڵ سـەرچڵییەكاندا (ئەمـە وتـەی فیلیپ رۆسە لە پێشـەكییەكەیدا بـۆ چاپـە ئەمریكییەكـەی چیرۆكـەكانی كۆندێـرا) لـە مانـەوەیدا لـە پشـتی دادپەروەرییـەوە. لـە روكـاری پێشـەوەش، ژن و پیاوەكـانی پیلانە ئاڵۆزەكانیان دادەڕێژن، لە كاتێكدا موهـەریجی نـاو رەفتـارە پێكەنیناوییـەكانیان بازبـازێن دەكات و پڕە لە پیلانی ئاڵۆز بۆ راوكردنـی توتكـە خەمناكـەكان، هەروەها لە دەوری یاساو ئۆردەر دەبـن بـە بلـق. سـەرمایەش لـە باكگراوندەكەیدایـە، كـە لێـوەی دەسـەڵات دەڕژێـت. ئاهـەنگی مـاڵاوایی بریتیـە لـە چەشـنە رۆمانێكی سیاسیی، نوسـەرێكی زۆرزان و چوسـت لـە كـاتێكدا دەینوسـێت كـە چیـتر شـێمانەی نوسـینی رۆمـانی سیاسـیی نەماوە.

**سەرچاوە**

*info@kundera.de*

**سەرنج:**

مایەی خۆشحاڵییە كە هاوڕێی ئازیز "رەئوف بێگەرد" ئەم رۆمانەی كـردووە بـە كـوردی و لـە شـوباتی ئەمسـاڵدا كەوتـە بـەردیدەی خوێنـەران، كـاك رەئـوف لـە زمـانی فارسییەوە وەریگێڕاوەتە سەر زمانی كوردی.

## "مارتن هایدگەر"
## و
## "هانا ئارنت"
## لە عەرەبییەوە: شاد



هایدگەر

نێوەندە فیکریەکانی پاریس زۆر بە تاسەوە چاوەڕوانی دەرچوونی چاپی فەرەنسی ئەو نامانە دەکەن کە باس لە پەیوەندی خۆشەویستی هەردوو فەیلەسوف "مارتن هایدگەر" و "هانائارنت" دەکات، شایەنی باسە بەم دواییانە چاپی ئەڵمانیەکەی ئەم کتێبە کەوتە بەردەستی خوێنەران.

شتێکی سەیر نیە کە یەکێك لە مەزنترین فەیلەسوفە هاوچەرخەکان بە داوی عەشقی خوێندکارێکی ژیکەڵەی خۆیەوە بوبێت، بەڵام ئەوەی جێی سەرنجە ئەوەیە کە بە درێژایی نیو سەدە نامەی لەگەڵدا گۆڕیوەتەوە، هەر لە ناوەڕاستی سالآنی بیستەوە تا مردنی هەردووکیان لە ناوەڕاستی حەفتاکاندا.

ڕێگەدان بە توێژەرەوەکان تا لاپەڕە تایبەتیەکانی ژیانی "هایدگەر" (*1889–1976*) هەڵبەنەوە، دەرفەتێك بوو بۆ خستنەڕوی ئەو نامانەی ناوەڕۆکی ئەو پەیوەندیە ئاشکرا دەکەن کە لە نێوان ئەو و "هانا ئارنت"دا (*1906–1975*) هەبوە.

هەرچەندە "ئارنت" ئەو خۆشەویستیەی بۆ هاوڕێی فەیلەسوف و دەروونناسی ئەڵەمانی "کارل یاسبەرز" درکاندوەو لەو نامانەشدا کە بۆ "ماری مەکارسی" هاوڕێی نوسیویەتی باسیکردوە، بەلآم کەس باوەڕی نەکردوە ئەو پەیوەندیە تا دوا ساتەکانی ژیانیان بەردەوام بووبێت، بە تایبەت دوای ئەوەی بۆ ماوەیەکی دورو درێژ لە یەکتری دابڕان و هەریەك کەوتنە کیشوەرێکەوە. ئەو نامانەی نێوانیان (سەرەڕای زۆری نامەکانی هایدگەر لە چاو ئەوانەی ئارنت)دا، بەڵگەی ئەوەن کە "هایدگەر" بۆ "هانا ئارنت" هەر بە تەنها خۆشەویستێك نەبوە، بەڵکو مامۆستا و قەڵغان و هاوڕێشی بوە.

"هانا ئارنت" لە تەمەنی هەژدە ساڵاندا بوو کاتێك لە ماربۆرگ چاوی بە "هایدگەر" کەوت، (هایدگەر لە سەرەتای بیستەکانەوە لەوێدا خەریکی وانەوتنەوە بوو). ئەودەمە "هایدگەر" لە تەمەنی سیو پێنج ساڵیدا بوو، لە نێوەندی زانکۆدا نازناوی (جادوبازەکەی میسکەرش)* بوو. ئەوەی ڕاستی بێت ئەو شتانەی "هایدگەر" و "ئارنت"ی لێك دوور دەخستەوە، بەهێزتر بوون لەو شتانەی کۆی دەکردنەوەو پێکیەوە دەبەستنەوە.. جگە لە جیاوازی تەمەن، جیاوازی دیکەش لە نێوانیاندا هەبوو. "هایدگەر" کاتۆلیکی و "ئارنت" لە خانەوادەیەکی یەهودی موحافیزەکار بوو. "هایدگەر" لە لادێیەکی باشوری ئەڵەمانیاو ئەویش خەڵکی شارۆچکەیەکی باکور بوو. "هایدگەر" پیاوێکی هێمن و لەسەرخۆ بوو، بەلآم "ئارنت" شپرزە بوو (شپرزەییەکەی لەوکاتەوە دەستی پێکرد کە باوکی مردو ئەم تەمەنی حەوت ساڵان بوو).

دواجار "هایدگەر" پیاوێکی خاوەن ماڵ و خێزاندار بوو، ئەمە لە کاتێکدا "هانا ئارنت" پێشتر خۆشەویستێکی کەی نەناسی

بوو.. سەرەڕای ئەوەش "هایدگەر" لە "ئارنت"ەوە فێربوو کە چۆن خۆشەویستی دەبێتە ئاگرێکی بە جۆش. بۆ یەکەمجار نامەگۆڕینەوەی نێوانیان لە ماربۆرگ دەستی پێکرد، ئەوکاتە هەردووکیان لەو شارەدا بوون. دواتر لە دوو شاری دوور لە یەك کەوتنە نامەگۆڕینەوە.. دوای ئەوەی ساڵی *1926* مامۆستای عاشق قوتابیەکەی ناچار کرد ڕووبکاتە هایدبێرگ، نەکا هاوسەرەکەی بە پەیوەندیەکەیان بزانێت.

"هایدگەر" یەکەمین نامەی بە تەحەفوزەوە بۆ نوسی و بەم دەستەواژەیە دەستی پێکردبوو: (ئازیزەکەم خاتوو ئارنت..)، بەڵام هەر زوو وازی لەم تەحەفوزەی هێناو نامەکەی بە (مارتن هایدگەری تایبەت بە تۆ) بۆ ئیمزا دەکات، ئەمە لە بەرواری *1925/2/10*دا بوو.

لە ڕۆژی *21*ی هەمان مانگدا نامەکانی بە (ئازیزەکەم هانا..) دەستپێدەکات و بە ئیمزای (مارتن–ی خۆت) کۆتایی پێدێنێت.. لە کۆتایی ئەم مانگەدا (کە زیاد لە پێویست نامەی بۆ ناردوە!)، بۆی دەنوسێت و دەڵێت: (ئەهریمەنی تۆ داگیری کردوم و لە داڵغەی داوم). لە بەرامبەر ئەمەدا "ئارنت" بە دەقێکی ئەدەبی لەژێر ناونیشانی (تارمایی)دا وەڵامی دەداتەوە، تیایدا بەشێك لە سەربوردەی تایبەتی خۆی و ئەو ترس و دڵەڕاوکێیەی بۆ باس دەکات کە لە سەردەمی منداڵیەوە دوچاری بوە.

ئەم دوو عاشقە تەقەلایەکی زۆریان دا بۆئەوەی پەیوەندیەکەیان لە خەڵك بشارنەوەو ئاشکرا نەبێت. لەبەرئەوەی "هایدگەر" ژن و منداڵی هەبوو، "هانا ئارنت"یش لە ژورێکدا بوو لەو ژورانەی تایبەت بوو بە خزمەتکاران، ئەوا دیدار و یەکتر بینینیان لەسەر کورسی باخچە گشتیەکان یان لە ژوری میوانخانە دورەکاندا بوو.

ئەو دیدارانە بە تەنها بۆ گۆڕینەوەی حەزو ئارەزوو نەبوو، بەڵکو هاوڕێیەتیەکی فیکری و فەلسەفیشی لێکەوتەوەو درێژ بوەوە ناو ئەو نامانەی بۆ یەکتریان دەنارد.. هاوکات دەسپێکێکیش بوو بۆ ئەو نوسینانەی کە دواتر "هایدگەر" بڵاوی کردنەوە، وەکی کتێبی (بوون و زەمەن). لەم پرۆسەیەشدا هیچ کەس هێندەی ئەو خوێندکاری فەلسەفەیە بەختەوەر نەبوو، کە بووبوە نیگابەخشی مامۆستاکەی.

لەگەڵ هاتنی وەرزی بەهاردا، "هایدگەر"ی عاشق نامەکانی بە دەستەواژەی (خۆشەویستەکەم) دەستپێدەکات و ئەوەشی لەبیر ناچێت نامەکەی بە ڕستەگەلێکی وەك: (سوپاسی ئەم خۆشەویستیەت دەکەم.. یاخود هیچ شتێك نیە بتوانێت من و تۆ لێك بکات) بڕازێنێتەوە.

پاشان ئەو سەفەرە ناچاریەی "ئارنت" بۆ هایدبێرگ دێتە پێشێ و نامەکان دەگۆڕێن بۆ جۆرێك لە بروسکەی تازەو بە پەلە، بە مەبەستی دیاریکردنی کات و شوێنی یەکتر بینین.. "هایدگەر" ئاوەهای بۆ دەنوسێت: (داوات لێدەکەم ڕۆژی یەکشەممە *28* حوزەیران دوای سەعات نۆ بێیت بۆ دیدەنیم، لەگەڵ هەزار ماچدا). ئەوە "هایدگەر"ە کە شوێنکاتی یەکتر بینینەکان دیاری دەکات، لە هەموو نامەیەکیشیدا بیری ناچێت ئەوە بۆ خۆشەویستیەکەی دوپات کاتەوە کە ئەو پێشوەخت و لە خۆشی نزیك بوونەوەی دیدەنیەکەیان، سەرمەست و خۆشحاڵە.

هەرچەندە "ئارنت" لە شوێنێك دەژیا زۆر دوور بوو،

بەڵام "هایدگەر" بۆی دەنوسێت و دەڵێت: (تا ئێستاش لە تۆدا دەژیم..). کاتێك "هایدگەر" بە ڕێکەوت و بە مەبەستی پشودان رووەدکاتە کوختەکەی خۆی لەناو دارستانی ڕەشدا، نامەیەك بۆ "ئارنت" دەنێرێت و بە حەسرەتەوە دەڵێت: (دەستەکانت لەنێو دەستمدا دەگوشم و لە ناخەوە ڕاتدەموسم). ئەویش لە یەکێك لە نامە دەگمەنەکانیدا وەڵامی دەداتەوەو دەڵێت: (تەوێڵ و چاوەکانت ماچ دەکەم).

"هانا ئارنت" هێندەی بەس بوو خۆشەویست و نیگابەخشی "هایدگەر" بێت و هەرگیز ئەوەی لێ نەویستوە هاوسەرەکەی تەلاق بدات و لێی جیابێتەوە. ڕەنگە پێشبینی ئەوەی کردبێت "هایدگەر" خۆی دەستپێشخەریەکی وا بکات، بەڵام نەیکرد. لەگەڵ ئەوەشدا "ئارنت" هەر دڵسۆز و بەوەفا بوو بۆی، سەرەڕای ئەوەی چەند هاوڕێیەکی لە بەدیارکەوتنی تۆوی دژ بە ڕەگەزی سامی لای "هایدگەر" وریایان کردەوە، بەڵام ئەوانە لەو پەیوەندیە قوڵەی نێوانیان بێئاگا بوون. ساڵی *1933* "ئارنت" بە چاوی خۆی پەیوەندیکردنی مامۆستا خۆشەویستەکەی بە حیزبی نازیەوە بینی، لەوکاتەدا ئەو ئەڵەمانیای بەجێهێشت و ڕوی کردە پاریس، تا ئەوکاتەی سوپای ئەڵەمانیا گەیشتە ئەوێ لەو شارەدا مایەوەو دواتر بەرەو وڵاتە یەکگرتوەکان هەڵهات. لەوێوە دوراو دوور چاودێری لێکچەرەکانی مامۆستاکەی دەکرد کە چۆن تیایاندا بڕوای خۆی بە پرانسیپەکانی نازیزم ئاشکرا دەکرد، هاوکات هەواڵی ئەوەشی پێگەیشت کە ساڵی *1938* ئامادەی بەڕێکردنی تەرمی "ئەدمۆند" هۆسێرل"ی هاوڕێ و مامۆستای نەبوە کە جولەکە بوو، نەبادا ئەوە ببێتە مایەی ئەوەی نازیەکان تورە بکات. لێرەدا جێی خۆیەتی بڵێین "هایدگەر" لە ساڵی *1937* بەدواوە هێدی هێدی لە سیاسەت کشایەوەو دەستی دایە خۆئامادەکردن بۆ توێژینەوە ئەکادیمیەکان. ئەمەش وایکرد دەسەڵاتدارانی ئەوسای ئەڵەمانیا بۆ ماوەی پێنج ساڵ ڕێی وانە وتنەوەی لێبگرن، هەرچەندە "ئەلفرید بیتری" خێزانی تێکۆشەرێکی نازی و هیتلەریەکی ناسراو بوو.

پێدەچێت ئەم دورکەوتنەوەیەی لە بیروباوەڕی نازیزم وای لە "هانا ئارنت" کردبێت ساڵی *1950* لە کاتی گەڕانەوەیدا بۆ ئەڵمانیا، هەوڵی بینینی "هایدگەر" بدات و دەرباسی تازەکردنەوەی ئەو پەیوەندیە هاوڕێیەتیە گەرموگوڕەی نێوانیان بوبێت.

ئەوەی مایەی سەرسوڕمانە ئەوەیە "هانا ئارنت" قەناعەتی وەها بوو کە "هایدگەر" هەرگیز نازی نەبوەو باوەڕی بە هەموو ئەو قسانەش هێنا کە "هایدگەر" لەو سەفەرەیدا دابووی بە گوێیدا.

هەر لە ڕێی "ئارنت"یشەوە بوو نوسینەکانی لە ئەمریکادا بۆ بڵاوکرایەوەو بۆ دورخستنەوەی تۆمەتی نازیزمیش لەسەری شەڕی بێئامانی لە پێناودا کرد.. لەسەر نامە بۆ نوسینی بەردەوام بوو، هەرچیەکیشی نوسی بوو بە فەرزڵی "هایدگەر"ی دەزانی. ساڵێك بەر لە مردنی "هایدگەر" لە نامەیەکیدا دەنووسێت و دەڵێت: (هیچ کەس بە وێنەی تۆ شێوەی ئەو وانەوتنەوەیەی نەوتۆتەوە کە تۆ دەیڵێیتەوە).

هەنووکە نامەکانی نێوان ئەم دوو مرۆڤە لە تاریکی نێو سندوقەکانەوە دێنە دەرێ و بەر ڕۆشنایی چاوەکان دەکەون، ئەمەش وا دەکات سەرلەنوێ وێنەی هەریەکەیان لە خەیاڵدانی خوێنەراندا بکێشرێتەوە. ڕەنگە ئەمە بتوانێت جۆرە گەرموگوڕیەك

بەو بۆچوونە بدات کە دەڵێت "هایدگەر" فەیلەسوفێکی بە ویقار و لوت بەرزو خۆبەزلزان بوە.

نامەکانی "هانا ئارنت" بە بەراورد لەگەڵ نامە لە ژمارە نەهاتوەکانی "هایدگەر"دا، زۆر کەمن. ئاخۆ بلێی کەمییان لەبەرئەوە بیت کە بە هۆی کەمتەرخەمییەوە ون بووبن یاخود کەسانیك هەن بەشیکی نامەکانی ئەو کچە فەیلەسوفەیان شاردۆتەوە.. ئەو کچەی لە ئەلەمانیادا چاوی بە دنیا هەڵهیناو هەر لەویشدا عاشق بوو، تا دواتر لە شاری نیویۆرکدا ماڵئاوایی لە دنیا کرد و یەکیك بوو لە بەتواناترین ئەو کەسانەی کە سەرقاڵی لیکۆڵینەوەی دیاردەی سستەمە تۆتالیتاریەکان بوو لە جیهانی ئەمرۆماندا؟

### پەراویز

*"میسکەرش: گوندیکی بچوکی ئەلمانیایەو زیدی لەدایکبوونی "هایدگەر"ە.

### سەرچاوە

الشرق الاوسط، *1999/2/16*

## "جان بۆدریار" و کۆمەڵگەی بەرخۆری

حەسونە ئەلمسباحی
لە عەرەبییەوە: سەردەم


بۆدریار

ساڵی *1968* بیریار و سۆسیۆلۆژستی فەرەنسی "جان بۆدریار" لە تەمەنی چل ساڵیدا، یەکەمین کتیبی خۆی بە ناوی (سستمی شتەکان)ەوە بڵاوکردەوە. بە هۆی ئەم کتیبەشیەوە، بوو بە یەکیك لە گەورەترین و قووڵترین لیکۆڵیارەکانی کۆمەڵگەی بەرخۆری. لەم کتیبەیدا "بۆدریار" دەیویست نیشانی بدات کە شتەکان لەناو سستمیکی رەمزی و نیشانەسازی پڕ لە هارمۆنیدا ریکدەخرین و لە ریی ئەوەشەوە دەتوانین لەو بەرخۆریە بگەین کە بۆتە ئاکاری ئەم سەردەمەی ئەمرۆمان.. ئەو پیی وایە بەرخۆری بەشدارە لە ویرانکردن و تیکوپیکدانی بنەما سەرەکییەکانی مرۆڤ، مەبەستیشی لەو بنەما سەرەکیانە ئەو هاوسەنگیەیە کە فیکری ئەورووپی لە یۆنانەوە لە نیوان رەگوڕیشە میتۆلۆژییەکان و جیهانی لۆگۆسدا دروستی کردووە و دەستبەرداریشی نەبووە. "بۆدریار" دەڵیت: (سەدەکانی ناوەڕاست هاوسەنگی خۆی لەسەر بەرخۆری و ئەهریمەنە بەرقەرار کردبوو، بەڵام سەردەمی ئیستامان هاوسەنگی خۆی لەسەر بەرخۆری و ئیدانەکردنی بەرخۆری راگرتووە). لیرەوە ئەو پیی وایە کە بەرخۆری بۆتە میتۆلۆژیایەکی راستەقینە. بۆ زیاتر روونکردنەوەی ئەم مەسەلەیە دەڵیت: (ئامیری شۆرین وەك ئامیریك بەکاردەهینریت و لە هەمان کاتیشدا رۆڵی خۆشگوزەرانی و شکۆمەندیش دەگیریت، مەبەستی سەرەکیش لە بەرخۆری ئەمەیە).. وەك دالیك زۆر شت هەن دەتوانن جیگای

ئامێری شۆڕین بگرنەوە، بەڵام لە لۆژیکی نیشانەکان و لە لۆژیکی ڕەمزدا شتەکان یەك ئەرك و یەك پێداویستی دیاریکراویان نییە، بەڵکو دەکرێت بە چەند خواست و ویستێکی دیکە بارگاوی بکرێن کە ڕەنگە خواستی لۆژیکی کۆمەڵایەتی بن یاخود لۆژیکی حەز و ئارەزوو بن.

لە کتێبەکانی دیکەیدا "بۆدریار" هێرش دەکاتە سەر تەلەفزیۆن و پێی وایە ئامێرێکە بۆ دەستەمۆکردن و لەخشتەبردنی جەماوەر و ئیفلیجکردنی تواناکانی لەوەی بتوانیت بیربکاتەوە و رابمینیت و داهینان بکات. هەروەها رەخنە لە رۆشنبیران دەگریت و دەلیت: (ئەوانە بەردەوام خەریکی وتنەوەی وتەزاکانی بیکیت و سیوران و سارتۆ و هەموو ئەو چەمکانەن کە لەمرۆدا جگە لە عەدەمییەت و خۆپەرستی و بیویژدانی هیچ مانایەکی تریان نییە، راستییەکەشی ئەمە بۆ ئەوە دەکەن تا خۆیان لە تاوتویکردنی شیوەکانی رەشبینیو نائومیدی لە ساتەوەختی ئیستادا بدزنەوە). هەر لە دریژی قسەکانیدا دەلیت: (لە راستیدا دنیای ئەمرۆمان بە گۆرستانیکی گەورەی یۆتۆپیاکان دەچیت).

ئەمەش وام لێدەکات لە بەرامبەر سیستمی نوێی جیهانی و وێرانبوونی مانا و زماندا، لەناو تەنز و گاڵتەجاڕیدا بۆ ڕزگاربوون بگەڕێم.

بێنەوایی دنیای ئەمڕۆ بە ئاشکرا بە سیمای ئەو خانمانەوە دیارە کە نمایشی جلوبەرگ دەکەن، نەك بە جەستەی ڕەق و تەقی ئەو مرۆڤە ئەفریقاییەوە دیاربێت کە لە برسیەتی و نەداریدا نغرۆ بووە.. دڵرەقی و خەمساردی بە هەموو شوێنێکەوە دیارە و ئێمەش دەزانین چۆنی دەبینین.

**سەرچاوە**

الشرق الاوسط– *2002/2/13*.

## خستنەڕووی کتێبی گیرفان
## مرۆڤ لە ڕوانگەی فرۆیدەوە




خستنەڕووی: مەم بورهان قانع

نووسینی: قاسم حسێن ساڵح

وەرگێڕانی: عەبدولموتەلیب عەبدوڵڵا

لە بڵاوکراوەکانی دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم

پرۆژەی گیرفان – زنجیرە *24*

تیراژ: *500* دانە

چاپی یەکەم ساڵی *2002*

*77* لاپەڕەی قەبارە بچووك

یەکەمین بابەتی ئەم کتێبی گیرفانە بە ناونیشانی "گفتوگۆ لەگەڵ فرۆید"دایە کە تیایدا نووسەر لە میانەی چەند پرسیارێکەوە قسە لە بارەی چەند چەمك و تێڕوانینێك لە ڕوانگەی فرۆیدەوە دەکا و نووسەر لە زیهنی خۆیدا پرسیار دروست دەکا و هەر خۆیشی وەڵامی پرسیارەکان دەداتەوە و ئەم وەڵامانەیشی لەوێوە سەرچاوەیان گرتووە کە نووسەر شارەزایی و زانیاری سەبارەت بە هەریەك لەو چەمکانە هەیە کە فرۆید بەکاری هێناون و لێرەدا بوونەتە جێگای پرسیار و لە ڕێی هەریەکە لە وەڵامەکانیشەوە، نووسەر خوێنەر بە ئەو چەمك و تێزانە ئاشنا دەکا کە دەروونناسی نەمساوی "سیگمۆند فرۆید" بەکاری هێناون و کاری لەسەر کردوون و لە ڕێیانەوە خوێندنەوەی بۆ

مـــرۆڤ و حاڵـــەت و قۆناغـــە جیاجیاکانی کردووە..

لـە سـەرەتای ئـەم باتــەدا، نووسەر باس لەوە دەکا کە دید و بۆچوونی ئەوتۆ هەیە کەوا فرۆید بـەو کەسـە دادەنێـن کـە گـورزی کوشـــندەی لـــە مارکســـییەت وەشاندووە و هـەندێکی دیکـەیان فرۆیـد بـە ڕەخنــەگری بوێــری ئـەخلاقی بۆرژوازی دادەنێـن؛ کـە لـە پێنـاو ئـەخلاقی نوێـدا هـەوڵی داوە، ئەمــە ســەرباری ئــەوەی هــەندێکی دیکــە فرۆیــد بــە گوزارشــتکەری بۆرژوازییـــەتی ڤیـەنناى سـەدەى بیستەم وەسـف دەکـەن و کەسـانێکی تریـش وەك خوانەناسـێك لـەم دەروونناسـە دەڕوانـن کـە گوایـە ئامـانجی لەناوبردنی ئاین و ئەخلاق بووە و چـەندین بۆچوونـی تـر.. ئەمـە سـەرباری ئـەوەی کـە هـەندێك لـە ڕەخنـەگران هاوڕان سـەبارەت بـە ئـەوەی کـە هـەر لـە سـەردەمی ئەرستۆوە هەتا ئێستا بیرمەندێك نـــەیتوانیوە وەك فرۆیـــد لـــە سروشتی مرۆڤایەتی بگات..

هەر لە سەرەتای ئەم وتارەی نـاو ئـەم کتێبـەدا، نووسـەر لـە خستنەڕووی دیدە جیاوازەکـاندا سـەبارەت بـە فرۆید، ئاماژە بـەوە دەکـات کـە لایەنـە نەیارەکـەی فرۆید وای دەبینن: ئەوەی فرۆید بەدەستی هێناوە، شـێوەیەکە لـە شـێوەکانی تـــەعبیرکردن لـــە نائەقڵانییـــەت و لـــەم بارەیـــەوە فرۆیدییەت بە ناحەزی مرۆڤایەتی لە قەڵەم دەدەن، چونکە گوایە لای فرۆید شەڕی کۆمەڵایەتی شتێکی گومـــانلێکراوە.. لـــەناو ئـــەم گفتوگۆیەیشـــدا کـــە ســـەرەتای پرسیارەکانە، نووسـەر کورتەیـەك لە ژیاننامـەی فرۆید دەخاتـە ڕوو کە لە "*6*"ی مایسـی سـاڵی *1856* لـە "ڤریبرگ"ی شـاری "مۆرافیـا" لەدایك بووە و لـە تەمـەنی چـوار ســاڵییەوە دەچێتــە ڤیــەنناى پایتــەختی نەمسـا و تیۆرەکــەی "داروین" ڕەسەنایەتیی جۆرەکان (اصل الانـواع) کاریگـەریی زۆری دەبـێ بەســـەریەوە و هـــەروەك نووسـەر باسـی دەکا: ئـەو تـێزەی "داروین" مـژدەی لـە گـەردوون گەیشـتنی پـێ بەخشـیووە و لـە ساڵی *1881*دا فرۆید پلەی دکتۆرا بەدەست دەهێنێ.

سەبارەت بە "چەپاندن" کە یەکێکە لەو چەمکانەی فرۆید لە کارکردندا بەکاریهێناوە، هـەر لـە سـەرەتاکانی ئـەم گفتوگۆیـەدا و لەسـەر زاری فرۆیـدەوە، نووسـەر دەنووسـێ: "پرۆسـەی چـەپاندن داهێنانێکە پێشتر بـەم جـۆرە لـە ژیـــانی دەروونـــی قســـەی لێ نـــەکراوە. بـــە بۆچوونـــی مـــن، تیـــۆرەی چـــەپاندن بـــە وردی بناغـــــەی نەخۆشـــــییە دەمارییەکانە".

هـەروەها سـەبارەت بـە ئـەو هەڵـە تێگەیشـتنەی بەرانبـەر بـە فرۆیـد هەیـە؛ کـە گوایـە وتوویـە هونەرمـەند کەسـێکی دەمارگـیرە، لەم گفتوگۆیەدا، نووسەر لـە زاری فرۆیدەوە دەنووسێ: "هونەرمەند لـەو واقیعـە ڕازی نییـە و بـەرەو دنیای خەیاڵ هەنگاو دەنێ، بەڵام لەگەڵ کەسی دەمارگیر جیاوازە".

لـــە یـــەکێکی تـــر لـــە پرســـیارەکانی نـــاو ئـــەم گفتوگۆیـەدا، نووسـەر پرسـیاری ئـــەوە دەوروژێنـــێ کـــە هـــەندێ تیۆرەکـــەی فرۆیـــد وا وەســـف دەکـەن وەك ئـەوەی مـاڵێك بـێ و لێی نووسرابێ: "هەرکەسێ دێتە ژوورەوە، بـــا هـــەموو لۆژیکـــی بەجێبـــهێڵێ". واتـــا پێوانـــە زانستییەکان لەگەڵ شیکردنەوەی دەروونیـــی فرۆیدییـــەتدا یـــەك ناگرنەوە.

لـە وەڵامـی ئـەو پرسـیارە و ڕای ئەو کەسانەی کە بەم جۆرە لە تیۆرەکـــەی فرۆیـــد دەڕوانـــن، نووسـەر لەسـەر زاری فرۆیـدەوە بەم جۆرە وەڵامـی ئـەم بۆچوونـە دەداتـەوە: "وا دیـارە ناحـەزەکانم لـە شـیکردنەوەی دەروونیـی بـە دەرئەنجامی وڕێنـە و خەیاڵـەکانم

دادەنین، سوورن لەسەر ئەوەی بروا بە کاری دریژخایەن و بەردەوام و بیلایەن نەهینن کە من پیی گەیشتووم، وەك ئەوەی کە شیکردنەوەی دەروونیی کاری بەوەدا نابێ بە تیبینی و ئەزموونەکانی خۆی دەستیان بگرێ، بیئەوەی بەو تاقیکردنەوەیەدا بچن رەتی دەکەنەوە".

هەر لەم گفتوگۆیەدا، کە گفتوگۆکردنە سەبارەت بە بنەماکانی هەندێ لە چەمکەکانی سیگمۆند فرۆید دەروونناس و خستنەروویان، نووسەر کۆمەلێ پرسیاری سەبارەت بە ئەو لایەنانە خستووەتە روو و هەر خۆیشی لە زاری فرۆیدەوە وەلامیان دەداتەوە؛ کە ئەمەیش ریگایەکی ئاسان و یارمەتیدەرە بۆ تیگەیشتن لە هەندێ لە چەمك و تیزەکانی فرۆید، چونکە نابێ ئەوەیش فەرامۆش بکەین کە گفتوگۆ، وەك یەکێك لە هونەرەکانی کاری رۆژنامەنووس، بواریکی گونجاو و لەبارە بۆ خستنەرووی ئەو بابەتانەی کە دەمانەوێ لە رییەوە زانیاری ببەخشینە وەرگر (خوینەر-گویگر).

* * *

دووەمین وتاری ناو ئەم کتیبی گیرفانە سەبارەت بە "ئەقل و کەسیتی"یە؛ کە تیایدا نووسەر باس لە ئەقل و کەسیتی دەکا لە روانگەی فرۆیدەوە کە بەسەر سێ بەشدا دابەش دەکرێ؛ کە ئەوانیش: شعور، لاشعور و بەر لە شعورن، کە تیایدا نووسەر ئەوە دەخاتە روو، لاشعور کۆگای هەموو ئەو پالنەرە سەرەکیانەیە کە فرۆید پیی باشە بە لاشعور (نائاگایی) ناوی ببات؛ وەك: برسیەتی، تینویەتی و سیکس.

سەبارەت بە شعور (ئاگایی)ش؛ کە بەشی دووەمی ئەقلە لە روانگەی فرۆیدەوە، نووسەر باس لەوە دەکا کە شعور لای فرۆید ئەو بەشەیە لە ئەقل کە گەشە دەکا و پیشدەکەوێ تا خزمەت بە پەیوەندییەکانی تاك و واقیعی بابەتی (دنیای دەرەوە) پیشکەش بکات، هەروەها نوینەرایەتی بەر لە شعوریش دەکا کە سییەم بەشی ئەقلە لەلای فرۆید، واتا ئەو پانتاییەیە کە دەکەویتە نیوان شعور و یادگارییەکانی لەخۆ گرتووە.

سەبارەت بە کەسیتی لە روانگەی فرۆیدەوە، لەم وتارەدا نووسەر ئاماژە بەوە دەکا کە کەسیتیش لەلای فرۆید لە سێ بەشی سەرەکی پیکهاتووە کە ئەوانیش: ئید، ئیگۆ و سوپەر ئیگۆن و دەربارەی هەریەك لەو بەشانە و ئەرکەکانیان لە دیدی فرۆیدەوە، نووسەر باس لەوە دەکا کە "ئید" وەك یەکەمین بەشی کەسێتی لای فرۆید، تەوەرەی بوونی تاك دیاری دەکا و پرەنسیپی چێژیش حوکمی بەسەردا دەکا و ئامانجیشی تێرکردنی غەریزەکانە لە رێگای کرداری ئەقڵییەوە کە ملکەچی یاسا و مەنتیق دەبێ.

دەربارەی بەشی دووەمی کەسێتی لە لای فرۆید؛ کە ئیگۆیە، نووسەر لەم وتارەدا ئاماژە بەوە دەکا فرۆید گریمانەی ئەوە دەکا کە ئیگۆ کۆنترین بەشی کەسێتییە و هەموو شتە بە میرات بۆماوەکانی هەر لە منالییەوە تاوەکو ئەو لەحزەیەی تێیدا دەژی، لە خۆیدا هەڵدەگرێ و ئەو لایەنەی کەسێتییە کە لە دەرەوەی چینی "ئید" کە بەشی یەکەمی کەسێتییە، گەشە دەکا و خۆی لەگەڵ وەرگرتن و ناردنی وروژێنەرەکان دەگونجێنێ.

هەر لەم بارەیەوە و سەبارەت بە وەزیفەی "ئیگۆ" کە دووەمین بەشی کەسێتییە لە لای فرۆید، نووسەر باس لەوە دەکا: ئەگەر داواکانی "ئید"، واتا یەکەمین بەشی کەسێتی لە لای

فرۆید، لەگەڵ واقیعدا نەگونجێ، ئەوا ئیگۆ بە چەپاندن (کبت) یان هەڵدەسێ. بە واتایەکی ڕوونتر، وەزیفەی سەرەکی ئیگۆ بەرگریکردنە لە کار و کەسێتی و گونجاندنیەتی لەگەڵ دەوروبەر، واتا ئەو ژینگەیەی کەسەکەی تێدا دەژی.

سەبارەت بە سێیەمین بەشی کەسێتی، کە دوایەمین بەشە لە لای فرۆید و "سوپەر ئیگۆ"ی پێ دەوترێ، نووسەر لەم وتارەدا ئاماژە بەوە دەکا ئەم بەشە (واتا سوپەرئیگۆ) ئەو بەشەیە لە کەسێتی کە نوێنەرایەتی لایەنە ئەخلاقی و داوەرییەکانی مرۆڤ دەکا و بە چاودێریکردنی "ئیگۆ" هەڵدەسێ، هەروەها فەرمانی پێدەکا و ڕاستی دەکاتەوە و هەروەك باوك هەڕەشەی سزادانی دەکا.. بە مانایەکی ڕوونتر، نووسەر لە باسکردنیدا بۆ ئەم بەشەی کەسێتی لە لای فرۆید، وای دەشوبهێنێ کە "سوپەرئیگۆ" نوێنەرایەتی دابونەریت و نموونەی باڵای ڕەفتاری کۆمەڵایەتی دەکا، واتا "سوپەر ئیگۆ" دەشێ بە پارەیەکی دوو دیو بشوبهێنرێ کە ڕوویەکیان ویژدانە و ڕووەکەی دیکەیش منی باڵایە، هەروەك چۆن نووسەر باسی دەکا.

هەر لەم وتارەدا و سەبارەت بە بایەخی ئەو تیۆرەی فرۆید کە ئەو دابەشکارییە بۆ کەسێتی مرۆڤ دەکا، نووسەر پێی وایە: هەریەکە لەو سێ چەمکە (ئید، ئیگۆ و سوپەر ئیگۆ) کۆمەڵە چەمکێکی سەرەکی و یەکلاکەرەوەن لە تیۆری شیکردنەوەی دەروونیدا و ئەو پێکهاتەیە کە بە بناغە و ئامانجی شیکردنەوەی دەروونی دەژمێردرێ.

هەر لەم وتارەدا کە بۆ ئەقڵ و کەسێتی تەرخانکراوە، نووسەر ئاماژەیەکی خێرا بە "گرێی ئۆدیب" دەکا، کە لە تێکستێکی شانۆیی "سۆفۆکلیس"ەوە وەرگیراوە بە ناوی "ئۆدیبی پاشا" کە یەکێکە لە مەرگەساتەکانی سۆفۆکلیس و بە چەند سەدەیەك بەر لە زایین نووسراوە، کە ئۆدیب هەر لە ساتی لەدایکبوونییەوە ڕادەگەیەنرێ کە ئەو منالە کە گەورە بوو باوکی خۆی دەکوژێ و دایکی دەهێنێتەوە و دەیکاتە خێزانی، بۆئەوەی ئەوە ڕوو نەدا باوکی ئۆدیب کە پاشا دەبێ دوو داردەستی ڕادەسپێرێ کە ئۆدیبی منال لە چیایەکی سەختەوە فڕێ بدەنە خوارێ بۆئەوەی بمرێ نەوەك گەورە بێ باوکی بکوژێ.. ئیتر ئەو ئەفسانەیە بەردەوام دەبێ و ئۆدیب لە چیاکە فڕێ نادرێتە خوارێ و شوانێك لە پەنا بەردێکدا هەڵی دەگرێتەوە و گەورە دەبێ و لە گەورەبوونیدا لە ڕووداوێکدا باوکی خۆی دەکوژێ (بێئەوەی پێ بزانێ) و دواتر دایکی خۆی دەهێنێتەوە (دیسانەوە بێئەوەی پێ بزانێ) و دوای ئەوەی ئەو ڕاستیانەی بۆ ئاشکرا دەبێ، ئۆدیب هەردوو چاوەکانی خۆی کوێر دەکا، ئەمەیش لە تۆڵەی ئەوەی کە چاوەکانی ڕاستی نەدیووە و بەرەو کارەساتی کوشتنی باوك و بە خێزانکردنی دایکی بردووە.

هەڵبەت لێکدانەوەی زۆر بۆ ئەم دەقە و ئەم حاڵەتەی ئۆدیب کراوە؛ کە دووان لەو لێکدانەوە دیارانە بۆچوونی جان پۆڵ سارتەر و ئەوەی تریشیان سیگمۆند فرۆیدە.

سارتەر لە لێکدانەوەیدا پێی وایە کوشتنی باوك لە لای ئۆدیب ئیختیارێکی هۆشیاریانەیە و لە ئیرادەی ئۆدیبەوە سەرچاوەی گرتووە، نەوەك کردارێکی "بێئاگایی" واتا لاشعوری بێ و پێشتر سکێچی ئەو ڕووداوە دیاری کرابێ، لە بەرانبەریشدا فرۆید کوشتنی باوك بە کرداری

(نائاگایی- لاشعور) ناودەبا، بەوەی لە نائاگایی هەر کوڕێکدا ڕق لە باوکی هەیە کە پێدەچێ هەندێ جار بە کوشتنی باوک کۆتایی پێ بێ و هەروەها منالّی کوڕ لە هەمان قۆناغ و حالّەتدا حەزی لە دایکییەتی و بە پێچەوانەیشەوە، منالّی کچ گرێ "ئەلیکترا"ی هەیە، کە ئەوەیش بە هەمان شێوە لە تێکستێکی شانۆیی هەمان نووسەر (واتا سۆفۆکلیس) وەرگیراوە کە منالّی کچ حەز لە باوکی دەکا و ڕقی لە دایکی دەبێتەوە و وا دەزانێ دایکی باوکی لێ داگیرکردووە.

ئینجا سەبارەت بە گرێی ئۆدیب، کە لەم کتێبەدا و لە میانەی وتاری "ئەقلّ و کەسێتی"دا باسی لێوە کراوە، نووسەر ئەوە ڕوون دەکاتەوە کە منالّی کوڕ لە ماوەی پێنج سالّی تەمەنیدا عاشقی دایکی دەبێ و ڕقی لە باوکی دەبێتەوە، چونکە پێی وایە لەسەر دایکی ڕقەبەرایەتی دەکا..

سەبارەت بە بایەخی ئەم تیۆرەی فرۆید، نووسەر لەم وتارەدا ئاماژە بەوە دەکا کە فرۆید دۆزینەوەی ئەم تیۆرە (واتا گرێی ئۆدیب) وەك بەخششێکی گەورە تەماشا دەکا و بە دۆزینەوەی ئۆتۆمبیل و کارەبای دەشوبهێنێ. ئەمە سەرباری ئەوەی هەر لەم وتارەدا نووسەر باس لە تیۆری سێکس دەکا لای فرۆید و هەروەها بایەخی ئەو تیۆرەیش دەخاتەڕوو..

لە ئەنجامی ئەم کتێبەیشدا، نووسەر دەگاتە ئەو بڕوایەی کە لێکچوونێك لە نێوان فەلسەفەی فرۆید و شۆپنهاوەردا هەیە، بۆ نموونە چەمکی لاشعور کە لە لای فرۆید کۆگای وزە سەرەتاییە نامەعقولەکانە، هاوڕێکە بە تیۆرەی ئیرادەی نائاگایی شۆپنهاوەرەوە..

هەر لەم ئەنجامەدا، نووسەر ئاماژە بەوە دەکا: بیرۆکەی مردن کە دید و بۆچوونێکی شۆپنهاوەرییەو وەك تاکە چارەسەرێك بۆ بوونی مرۆیی خراوەتە ڕوو، لای فرۆید غەریزەی مردن دەنگدانەوەی هەیە.

سەرباری هەموو ئەو سەرنجانەی کە سەبارەت بە فرۆید و تیۆرەکەی لە ئارادان، نووسەری ئەم کتێبە لە ئەنجامەکەیدا و لە لاپەڕەکانی کۆتاییدا، ئاماژە بەوە دەکا لای سوریالییەکان فرۆید مەزن بوو، هەوشانی مارکس و ڕامبۆی شاعیر و مارکیز دی ساد سەیر دەکرا. هەر بۆیە لەم مەزنییەی فرۆیدەوە لە دیدی سوریالییەکان، نووسەر دەنووسێ: "ئەگەر مارکس چوارچێوەیەکی گشتی بۆ شۆڕش دانابێ، ئەوا فرۆید بە نیسبەت سوریالیەکان چوارچێوەیەکی گشتی بۆ ئازادی داڕشتووە".

## شانۆی ئەزموونگەری و میتۆدی جووڵە لە هونەری نواندندا

د. فاضل جاف
و. عەبدوللا مەحموود زەنگەنە



لە مانگی شوباتی سالّی *1981*دا، لە شاری ستۆکهۆلّم سیمینارێکی زانستی سازدرا لەژێر ناونیشانی "مایرهۆلّد" کە

تیایدا یانزە لێکۆڵینەوە پیشکەش کرا.. لەوانەش:

1)موزیك و ئەدای نواندن لە شانۆی مایيرهۆڵدا- لە لایەن "فالی ب. ثالین لە فەرەنساوە.

2)بایۆمیکانیك- أ. لوی لە ولایەتە یەکگرتووەکان.

3)مايیرهۆڵدو بایۆمیکانیك و بونیادگەری (کۆنستروکتفیزم"، - لەلایەن ك. أمون لە فەرەنساوە.

4)لێکۆڵینەوە بیانییە بەراوردکارەکان بۆ تیۆر و ئیشە سەرەتاکانی مایيرهۆڵد- أ. براون لە ئینگلتراوە.

5)ماییرهۆڵد و سینەما- ك مابلاند هاریسۆن- دانیمارك.

6)شانۆ و ڕوئیاکانی مایيرهۆڵد- ل. کلوبیرج- سوید.

پێنج لێکۆڵینەوەکەی دی لە لایەن مامۆستایانی بواری شانۆ لە فەرەنسا و ئیتالیا و پۆڵۆنیا و یەکێتی سۆڤێتەوە پێشکەش کران.

ئەگەرچی بە درێژیی وەسفی لێکۆڵینەوەکان و بەهاکانیمان نەکردووە، بەڵام سیمینارەکە بە خۆی و بابەت و پێکهاتە جۆراوجۆرەکانییەوە، جەخت کردنەوەیەك بوو لەسەر ئەوەی کە زانستەکانی بواری شانۆ لە خۆرئاوا و تا هەشتاکانی سەدەی بیستەم، لە دیراسەکردنی کەلەپووری باڵای مایيرهۆڵدی گەورە دەرهێنەری ڕووسیدا گەیشتە ئاستێکی باڵا لە ڕووی بایەخدان بە لایەنە بەڵگەنەویستە تایبەتەکان بە داهێنانی هونەری و شێوازەکانی لە دەرهێنان و بایۆمیکانیك و بونیادگەریدا "کۆنسترۆکتفیزم"

### بایەخدانی مەنهەجیی خۆرئاوا بە شانۆی ماییرهۆڵد

لە سیمینارەکەدا جەدەلییەتێکی زۆر لەسەر ئەم پرسیارە کرا کە لە لایەن أ. ف فیفرالسکی لێکۆڵەرەوەی ڕووسی و یەك لە یاریدەدەرەکانی ماییرهۆڵدەوە داڕێژرابوو: "چی لە مایيرهۆڵدەوە فێر بوویت، ئەو هونەرمەندەی کە ڕاستەوخۆ دەستکەوتە زانستییەکان و داخوازییەکانی شانۆی هاوچەرخ و هونەری پەروەردەی شانۆیی پێکەوە گرێ دا؟"

زانستە شانۆییەکان لە خۆرئاوادا لە ڕێی ڕێنمایی وەرگرتنەوە لە فیکرە سەرەتاییەکانی مایيرهۆڵد سەبارەت بە ڕۆڵی گرنگ و یاریدەدەری ڕەخنە، بە شێوەیەکی بەرفراوانیش فیکری شانۆیی ئەو لە بونیادی شانۆیەکی نوێدا. هەموو ئەمانە لە دیراسەکردنی ئەم دەرهێنەرە لە سیاقی هاوچەرخی پرۆسێسی شانۆیی باودا دەگەنە مەسەلەیەکی زۆر گرنگ، ئەویش لەبەرئەو ڕۆڵە گەورەیەی کە بینیی لە چالاککردنی وزە و تواناکانی داهێنان لای کەسێتییە هونەرییەکانی وەك "پیتربرۆك" و "گرتوفسکی" و "ستریهلیر" و "شتاین" و دواتریش لەبەر دەستەبەرکردنی کەرەستەیەکی زۆر لە بارەی ئەزموونەکان لە بواری فێرخوازیی شانۆییدا.

پشکی خاوەن بەها و کێشی تایبەت لەم مەسەلەیەشدا دەگەڕێتەوە بۆ ئەو لێکۆڵینەوە شانۆییانەی کە بە زمانی ئینگلیزی نووسرابوون، چونکە لە دەستپێکی حەفتاکانەوە جیهانی شانۆیی بە ئینگلیزی نووسرا و پێشکەش کرا و بایەخێکی زۆری دایە ئیشە شانۆییەکانی مایيرهۆڵد، گەرچی لە شەستەکانیشدا هەمان ڕەوتی بایەخدان بە شانۆی مایيرهۆڵد دەرکەوتبوو. ئەم بایەخدانەش هەر تەنها لە زیادکردندا نەبوو، بەڵکو مۆرکی بە میتۆدبوونی لەخۆگرت، هەر لە بڵاوکردنەوەی بەرهەمەکانی ئەم دەرهێنەرەوە، تاکو پێشکەشکردنی لێکۆڵینەوەی هەمەگیر و زانستی

له بارەی داهێنانە هونەرییەکانی و تا دەگاتە دانانی لایەنە تیۆرییە تایبەتییەکان.

دواتر فێرگەی شانۆیی مایەرهۆڵدی کە بە زمانی ئینگلیزی کاردەکات، بووە فێرگەیەکی نموونەیی و خاوەن پێگەی زانستی، ئەویش لە ڕێی نمایشکردن و ڕێکخستنی بەرهەمە داهێنانە ئامێز و جیاوازەکانی زانایان و شانۆکاران و مامۆستایان و ڕاهێنەران، ئەوانەی کە لە چەندەها ڕووەوە دیراسەی ئیشەکانی مایەرهۆڵدیان کردووە و دواتریش سەرجەم هەوڵەکانیان لە یەك ئاراستەدا یەك خستووە، وەك بەرهەمەکەی "ڕۆبەرت لیچ"ی دەرهێنەری ئینگلیزی کە بە ناودارترین پسپۆڕ دادەنرێت سەبارەت بە کارەکانی مایەرهۆڵد.
دیارە سیمینارەکەی دوای ئەوەی ستۆکهۆڵمیش کە لە وێڵزی بەریتانیا لە ساڵی *1995*دا بەسترا، ئەویش جەختی لەسەر هەمان مەسەلەی پێشوو کردەوە. ئەم سیمینارەی دوایی لە لایەن نێوەندی جیهانیی لێکۆڵینەوە شانۆییەکانەوە ئامادە کرا، ئەم نێوەندە بەردەوام لەژێر ناونیشانی "مامۆستا دێرینەکان"دا سیمیناری لەو جۆرەی ساز دەدا. بەڵام لە سیمینارەکەی وێڵزدا ژمارەیەکی زۆر و لەبەرچاو لە لێکۆڵەرە ڕووسییەکان ئامادە بوون. چونکە ڕووسییەکان خۆیان بە یەکەمین یاخود بە داهێنەرە سەرەتاییەکان دادەنرێن لە بارەی هونەری مایەرهۆڵدەوە، هەر لەبەرئەوەش بوو کە لەم سیمینارەدا پشکی لەبەرچاویان هەبوو، ئەوەبوو دەسەڵاتی سۆڤێتی بەر لە "بیرۆسترۆیکا" ڕێگەی نەئەدا بە بەشداریکردنی پسپۆڕان لە سیمینارەکەی ستۆکهۆڵمدا "لەوانەش مامۆستا" قوستەنتین ڕودنیتسکی"ی خاوەنی کتێبی "مایەرهۆڵدی دەرهێنەر" بەڵام تەنها ڕێگە درا بە "فیفرالیسکی" کە ئامادەی ئەو سیمینارە بێت.

## ئەزموونەکانی ستۆدیۆکەی شەقامی بۆرۆدنیسکی

بە پێی زانستی هونەریی شانۆی ئەوروپی، بڕیار لەسەر ئەوە درابوو کە بەرهەمەکانی مایەرهۆڵد بکرێتە دوو قۆناغی مێژوویی، چالاکییەکانی بەر لە شۆڕشی ئۆکتۆبەر، و بەرهەمەکانی دوای شۆڕش. لەو بارەیەوە "ی. بێرگمان"ی توێژەرەوەی سویدی هۆی ئەم دابەشکردنە دەگەڕێنێتەوە بۆ شانۆکارە ئەوروپییە هاوسەردەمەکانی مایرهۆڵد، کە بایەخی تەواویان نەدا بە دوا گۆڕانکارییە بنەڕەتییەکانی شانۆی ڕووسی لە دوا قۆناغەکانی دەسەڵاتی سیزاریدا و تەنها بایەخیان بە پەرەسەندنە گەرمەکانی ساڵەکانی بیستەکان دا و بەوەش وا ڕاڤەی ئەو گەشەسەندنەیان کرد کە هیچ پەیوەندییەکی بە پەرەسەندنەکانی پێش خۆیەوە نەبووبێت، واتە بە گەشەسەندنەکانی دە ساڵەی یەکەمی سەدەی بیستەمەوە.
گرنگی ئەو "وەرزە ڕووسییانەی" کە "سێرجی دیاغلۆف" لە شاری پاریس ڕێکی خستن لەوەدا بوو کە بۆ زۆربەی شانۆکارانی خۆرئاوا و ئەوروپا ببنە تاکە نموونە و خستنە ڕووی هونەری شانۆی ڕووسیای بەر لە شۆڕش، چونکە لە لایەك شانۆی هونەریی مۆسکۆ و لە لایەکی دیکەشەوە هونەری بالێی ڕووسی، سەرجەمی ئاراستە و بەرهەمە هونەرییەکانی دیکەی لەبەر چاو و هۆشی ئەوروپییەکان حەشار دابوو، وێڕای شاردنەوەی هەموو تازەگەری و شتێکی نوێ لە هونەری نواندن و دەرهێنان لە هەردوو شاری مۆسکۆ و

پیترۆگرادا. بۆیە "ی. بێرگمان"ی تۆژەرەوەی سویدی پێی وایە کە لە ئەوروپادا ئەو سەردەمە تیمێکی کارکردن لە نوێخوازانی شانۆ، لە هونەرمەندانی تەشکیلی و مۆسیقی و ئەکتەرەکان لە ئارادا نەبوو کە هێندەی ئەو تیمەی دەوروبەری مایێرهۆڵد تۆکمە و یەکگرتوو بن.

ئەو نمایشەی کە مایێرهۆڵد کردی لە دەقی "أ. بلوك"ی شاعیری رووسیدا بە ناوی "بالاغانجیك" واتە نمایشی میللی، کە دیمەنەکانی لە لایەن "ن. سابۆتۆڤ" وموزیکی لە لایەن "م. کوزمین" وە جێبەجێ کران، لە راستیدا بریتی بوو لە دارشتن و قاڵبێکی نوێ و نموونەیی لە ئیشی شانۆی نوێدا، تەنانەت لە هەندێ بواری وەك بەکارهێنانی رووناکیدا، چونکە مایێرهۆڵد لەوەدا لە پێش زۆرێك لە هاورێ دەرهێنەرە ئەوروپییەکانیەوە بوو، بە تایبەتی لە شانۆیی "ژیانی مرۆڤێك"دا کە دەقی "ئەندیریڤ" بوو لە ساڵی *1906*دا نمایش کرا.. کە تیایدا مایێرهۆڵد بۆ یەکەمین جار بوو زانیارییەکانی "ئەدۆلڤ ئابیا"ی لە رووناکیدا جێبەجێ و رێکخست.

ئەزموونەکانی ئیشی مایێرهۆڵد لە ستۆدیۆکەی شەقامی "بۆرۆدنسکی" *1913-1917* لای خۆرئاواییەکان ناسراو نەبوو، لەم ئەزموونەیدا مایێرهۆڵد بە کارایی هەوڵی دا کە شانۆی خۆرهەڵات، شانۆی کابوکاو شانۆی "نو" لە فێرکردنی شانۆییدا بەکار بهێنێ، وێرای کۆمیدیای "دیل ئارتی"، بە مەبەستی دانانی بنەما ئایندەییەکانی سیستەمی بایۆمیکانیك.

شۆرش و رووداوە پرجۆشەکانی سەرنجی رای گشتیی جیهانی راکێشا و زۆر سەرنجدانە ولاتی سۆڤێت شانۆیشی خستە روو، بەڵام دەرهێنەر و رۆژنامەنووسانی خۆرئاوا زیاتر بایەخیان بە رەمزە سیاسییەکان دەدا کە لە میانەی ئیشە شانۆییەکانی ئەو سەردەمەوە بەرجەستە دەکران. بەڵام مایێرهۆڵد لەبەرئەوەی خۆی بەم لایەنی "ریکلامەوە" خەریك نەکردبوو، خواستی ناسینی خودی کەسێتی و ئیشە هونەرییەکانی ئێجگار کەم بوون، وێرای ئەوەیش، بەشی زۆری ئەوانەی سەردانی سۆڤێتیان دەکرد، زیاتر بایەخیان بە هەردوو فێرگەی سایکۆلۆژی و سرووشتگەرایی دەدا و ئەم دوو فێرگەیەش میتۆدی جووڵەییان بە هەند وەرنەگرتبوو. بۆیە دواتر هەندێك لە رەخنەگرانی خۆرئاوا زانیاریی هەڵەیان سەبارەت بە مایێرهۆڵد وەرگرت، هەروەك "جیمس رۆس"ی نووسەری ئینگلیزی لە کتێبەکەیدا "شانۆی ئەزموونگەری لە ستانسلافسکییەوە تا ئەمرۆ- *1963*"، بەشێکی ئەم کتێبە بۆ مایێرهۆڵد تەرخان کرابوو، بەڵام لە زانیارییەکاندا پشتی بەستبوو بەو نووسەرە بیانییانەی کە چووبوونە سۆڤێت لە سیەکاندا و بەو هۆیەی کە زمانی رووسییان لاواز بووە، نەیانتوانیوە لە راڤە و ئامانجی ئیشە شانۆییەکانی تێبگەن. هەروەها پشتیان بەستووە بە کتێبی "من و شانۆ"ی "أ. ف کمیسارجیفسکی" کە پەیوەندییەکی ناحەزانەی لەگەڵ مایێرهۆڵدا هەبووە.

ئێمە لەم بەشەدا یاخود لەم نووسینەدا زیاتر تیشك دەخەینە سەر چۆنێتیی "أستیعاب" کردنی کولتووری هونەریی مایێرهۆڵد لە لایەن زانستی هونەری شانۆی بە ئینگلیزی وتراو، پێگەیەکی تایبەتیش بۆ بابەتی بایۆمیکانیك تەرخان دەکەین.

### شەرە رەخنەییەکان لە دژی مایێرهۆلد لە یەکێتی سۆڤیێتدا

شــتیکی ئاشــکرایە کــە زاناکانی خۆرئاوا دەست پیشخەر بوون لـە مەسـەلەی بـەکارهینانی بایۆمیکانیکدا، چونکە ئەوان بەم رادە روونییـە بـەر لـە هاوکـارە رووسـییەکانیان لـە چلـەکان و پـەنجاکاندا باسـیان لـە میتـۆدی بایۆمیکانیک کردووە، ئەودەمـەی کـە ناوبـانگ و کـەلتووری مایـــیرهۆلد تەنانـــەت باسکردنیشـیان قەدەغـە بـووە. بەڵام تا چەندیك لـە دەرککردنـی زانستیدا بەم میتۆدە سەرکەوتوو بـوون، ئـەوەش مەسـەلەیەکە کـە ئاگادارییـەکی تایبـەتی دەویـت، چونکە بابەتەکە پەیوەندیی هەیە بـــە خـــودی فـــیرخوازیی ئەزموونگەرایی مایێرهۆلدەوە کە لـە دەرەوەی رووسـیادا بـە زۆری بڵاوبووبوویـــەوە. هـــەروەها دیراســـەکردنی هـــەندیك لـــە ئەزموونە شـانۆییەکانی دیکـەش دەخوازیت وەك میتـۆدی راهینـان لە شانۆی سـویدی "شـەهرەزاد" کـە ئەمـەیان بایـەخی دەدا بـە میتۆدەکـــانی جوولـــە و، چالاکییـەکانی "رۆبـرت لیـج"ی دەرهینەری ئینگلیزی و، هەروەها ئیش و چالاکییەکانی پەیمانگەی بـەرلین بـۆ نواندنـی بیدەنـگ، بـە تایبـەتیش لـە بـواری وەرشـەکانی مەشقکردن لەسەر بایۆمیکانیك، و ئەزموونـــە تایبـــەت و کەســیتییەکانی خــاوەنی ئــەم لیکۆلینەوەیـە لـە بـواری شـانۆی فــیرخوازیدا وەك دەرهینـــەر و راهینەر و لیکۆلەرەوە. چونکە من بۆ خۆم خواسـتیکی زۆرم هـەبوو لـــە بـــارەی دیراســـەکردنی ئەزموونـــەکانی مایـــیرهۆلد لـــە یـــەکیتی ســـۆڤیت، ئـــەویش بـــە مەبەســـتی بـــەدواداچوونی رەگوریشـــەکانی ئـــەم ئەزموونـــە بالایە لە خاکی رەسەنی خۆیدا.

ئـەزموونی بـالای مایـیرهۆلد رووبەرووی رەخنەی زۆر هاتەوە، دواتریـــش خـــودی خۆیشـــی دووچاری تەنگپیهەلچنین هـات و بە بریاری خـودی سـتالین تـیرۆر کـرا. چونکـە مایـیرهۆلد هـەولی زۆری دا بـــۆ بـــەدوورگرتنی هونەرەکەی لە بانگەشـەکردن بـۆ سیاسـەت کـە ئەودەمـە بەشـی زۆری هونـەرەکان کەوتبوونـە ئـەو زۆنگاوەوە. بەو هۆیەی کە ستالین خواسـتی بـوو هـەموو کردەکـانی داهینـــان بەگـــەر بخـــات لـــە پـیرۆزکردنی شۆرشـەکەیدا، بـە جۆریـــك کـــە شـــۆرش بـــەلای دامودەزگاکـــانی حـــزب و هەوالگرییەوە تەنها بریتی بوو لـە کەسـیتیی سـتالین خـۆی. بۆیـە ئەگەر لە یـەکیك لـە تیبینییـەکانی "ئانتلی کارثـەر"ی لیکۆلـەرەوەی ئـەمریکی وردبینـەوە کـە خـۆی چـەند جـاریك بۆتـە میوانـی مایێرهۆلد، بۆمان دەردەکەویت کە ئەم مرۆڤە –واتە مایێرهۆلد– بـە خۆی و سەرقاڵییەوە بە ئەزموونە هونەرییەکانییـــەوە هـــەرگیز نـــەدەکرا ببێتـــە کەرەنایـــەکی بانگەشە بۆ تاکەکەسێك لە هەموو رووسـیادا کـە وێنەکـەی هـەموو کونوکەلەبـەرێکی ئـەو وڵاتـەی تەنی بوو. لەم بارەیەوە "کارثـەر" دەڵێت "مایێرهۆڵد هەر بە رواڵەتی دەرەوەیـدا سـیما و سرووشـتی نـاوەوەی دەخوێنرایـەوە، پێڵـوە نیمچـە داخراوەکـانی، و دیـدە ئەفســووناوییەکانی، هەمیشـــە ئـەوەیان دەخسـتە روو کـە ئـەم هونەرمەندە سۆفی بێت. هـەرچی نێوچـــەوانی بەرزیشـــی بـــوو، ئاماژەی کارامـەیی و بلیمـەتیی لێ دەخوێنرایـــەوە، قـــژە لـــوول و پرەکەیشی ئاماژە بوو بۆ بـەتوانا و وزەداری لـە ژیـاندا، لوتیشـی هێمـابوو بـۆ توانـا و لێهاتنـە جۆراوجۆرەکـانی. بێگومـان لـە رەوت و جووڵـەی ژیـانی ئـەم مرۆڤەدا، بە ئاسانی هەست دەکرا بە وەڵامە هەستی و هەڵچوونەکان و خۆپرکـردن بـۆ جێبـەجێکردنی

ئامانجەکان بەدی دەکرا، گەرچی لە هەمان کاتدا برێك نائارامی لێ بەدی دەکرا.

**بەکارهێنانی ڕەگە دەمارەکانی ڕووخساری ئەکتەر، وەك بەشێك لە نەرمیی جەستەی**

پێشتر پرسیارکردنی سادە و ئاسایی سەبارەت بە بابەتێکی ئالۆزی وەك شانۆی ئەزموونگەریی مایێرهۆڵد، لە میانەی نائامادەگیی شرۆڤەی درووستی هەلومەرجەکانی دەرکەوتن و سەرهەڵدانی ئەمجۆرە شانۆییەوە ڕوون دەبوویەوە. هەروەها لە نائامادەگیی بۆچوونی شیاو بۆ پەرەسەندنی داهێنانەکان لە جۆرەها قۆناغەکانی چالاکییە هونەرییەکانیدا. بۆیە دەبینین نووسەرێکی وەك "جیمس رووس" هەمیشە دەڵێتەوە کە مایێرهۆڵد هەمیشە وەك بووکەڵەیەك یاخود گەمەیەك مامەڵەی لەتەك ئەکتەردا دەکرد و وەك جوڵێنەری بوکەڵەکان کۆنترۆڵی دەکردن". مایێرهۆڵد هەروەك خوازیاری ئەوە بووبێ، یاخود داوای متکردنی هەستەکانی لە ئەکتەرەکانی کردبێت، بۆ ئەوەی بەردەوام ڕەچاوی ئەو بنەمایانە بکەن کە پێشتر بۆیان دانراوە لەسەر بنەما و ڕێساکانی میکانیك، بە واتایەکی دی، دەبێ ئەکتەر بە چەشنی ئامێرێك ڕۆڵەکەی ببینێ هەروەك "ڕۆس" بۆئەوە چووە.

ڕاوبۆچوونەکانی مایێرهۆڵد سەبارەت بە پێگەی جووڵەی ڕەگە دەمارەکانی دەموچاو لە ئیشی هونەریدا دووچاری شێواندن هێنران. ئەو وای بۆ چووە کە گوایە دەبێ گرنگی زۆر بدرێت بە جووڵەی ڕەگە دەمارەکانی ڕووخسار لە کاتی ڕاهێنانی ئەکتەرەکانیدا. بەڵام لە ڕاستیدا ئەو تەواو پێچەوانەی ئەم حاڵەتە بووە و بە پشتبەستن بە بەکارهێنانی دەمامك هەمیشە لە دژی شێوازی جووڵاندنی ڕەگە دەمارەکانی دەموچاوی ئەکتەر بووە، بەڵکو مایێرهۆڵد وای دەبینی کە ڕۆڵی سەرەکی لەسەر تەختەی شانۆ دەبێ بگەڕێتەوە بۆ نەرمونیانی جەستەی ئەکتەر لە جووڵەدا. بۆ ئەو مەبەستەش مایێرهۆڵد تیۆری "ی. ب بافلۆف"ی خوێندبوو لە بارەی کردە پێچەوانەکانەوە. هەر بۆیەشە بەردەوام بایەخی زیاتری بە کاردانەوە دەدا وەك لە "ئاکشن/ فعل" بە کورتی، "ڕۆس"ی نووسەر هاوڕایە لەگەڵ "مارك سلۆنیم" کە هەمیشە شانازی بە وتەکانییەوە دەکات ئەودەمەی کە دەڵێت "لە هیچ کات و شوێنێکدا هێندەی سەردەمی لینین توانای مادی و دارایی بۆ ئەزموونگەراییەکان دابین نەکراوە". دیارە ناکرێت وتەیەکی لەم جۆرە بسەلمێنرێت، چونکە دواتر دەکرێت باس لەو تەنگپێهەڵچنینانە بکەین کە دووچاری ئەزموونی مایێرهۆلد هات بە هۆی خودی خۆیەوە نەك بە هۆی خودی ئەزموونەکەیەوە. دیارە گەیشتن بە ناسینی مایێرهۆڵدی دەرهێنەر، ڕاهێنەر، مامۆستا چەند هۆکارێکی دیکەی تەعبیرکردنی نوێ دەخوازێت، ئەویش لە میانەی گەڕانەوە بۆ بەرهەمەکانی و تێگەیشتن لە ئەزموونەکانی لە ڕووی تیۆرییەوە، دواتریش تێگەیشتن لە ئەزموونی هاوکارانی.

**کێشە لە نێوان کۆن و نوێدا دوای *17*ی ئۆکتۆبەر:**

هونەری مایێرهۆڵد بە شێوەیەکی گشتی بەسەر دوو قۆناغدا دابەش دەکرێت: قۆناغی پێش شۆڕش و قۆناغی دوای شۆڕش، ئەمەش دابەشکردنێکە بە پێی زۆرێك لەو کارانەی کە لە

بارەی دیراسەکردنی مێژووی شانۆی سۆڤێتی بە گشتی ئەنجام دراون.

"غ. ف تیتۆڤا"ی لێکۆڵەرەوەی رووسی لە تێزەکەیدا لە بارەی مێژووی هونەر و ئەدەبی سۆڤێتییەوە، رێگەیەکی دیکەی پێشنیار کردووە بۆ مامەڵەکردن لەگەڵ مەسەلەی نەریت و نوێخوازی لە شانۆی سۆڤێتیدا، ئەو پێی وایە کە شۆڕش لە قۆناغی سەرەتاییدا یارمەتیدەر دەبێت لە زیاترکردنی کێشەکان لە نێوان کەردەی نوێگەری و تەقلیدیدا نەك دانانی سنوورێك لە نێوانیاندا. بۆیە لەم بارەیەوە بە وردی تێگەیشتنی خۆی سەبارەت بە دەستکەوت و ئیشەکانی مایێرهۆڵد دەربڕیوە، چونکە ناکرێت بەبێ باسکردن لە پەرەسەندنی مێژوویی فیکرە هونەرییەکانی مایێرهۆڵد باس لە کردەی نوێگەری بکرێت لە بیستەکاندا.

شۆڕش نەبووە هۆی وەستاندنی ئەزموونی داهێنانکاریی هونەرمەندان و نەشبووە هۆی گۆڕینی فێرگە و ئاڕاستە هونەرییە نوێکان، چونکە دیالەکتیك سەبارەت بە کۆن و نوێ لە هونەردا بەر لە شۆڕشی *17*ی ئۆکتۆبەر سەری هەڵدابوو، بۆیە بۆچوونەکانی مایێرهۆڵد و ژمارەیەك لە داهێنەرانی تریش دەخرێنە چوارچێوەی نوێگەرییەوە بە ڕەچاوکردنی ئەو سەردەمەی کە تیایدا ژیاون کە هەندێکی بەر قۆناغی شۆڕش کەوتووە. لە ڕۆشنایی ئەم حاڵەتەشەوە دەکرێت ڕاڤەی سەرنەکەوتنی هەندێك لە ئیشە شانۆییەکانی مایێرهۆڵد بکەین، کە هۆکەی گەڕێنراوەتەوە بۆ کەمتەرخەمی لە ئامادەکردنی بینەران و هەروەها ئەو ڕەخنە توندوتیژانەی کە ئاڕاستەی هەوڵە نوێخوازی و جورئەتدارەکانی کرا، کە هەوڵێك بوون بۆ وەڵامدانەوەی دۆزەکانی ژیان لە میانەی شانۆوە.

### سەرچاوە

*ڕۆژنامەی القدس العربی، ژمار *2984*.

*ئەم بابەتە کورتەی لێکۆڵینەوەیەکی درێژی د. فاضل جافە سەبارەت بە ژیان و بەرهەمەکانی مایێرهۆڵد کە تیایدا پشتی بەستووە بەو زانستی شانۆییەی کە بە زمانی ئینگلیزی لەسەر مایێرهۆڵد نووسراوە، وێڕای دیمانەی تایبەت لەگەڵ "ولیام کارلستون"ی دەرهێنەری شانۆی شەهرەزادی سوێدی و ئەکتەری ناوداری ئەم شانۆیە "تۆم فیوردە فالك" لەگەڵ نووسەری سوێدی بۆ برسۆن و لێکۆڵینەوەیەکی "ماری ستینریت" لە ژێر ناونیشانی "جووڵە لە شوێندا *1988*" هەروەها ئیشەکانی "ل. ر. لیج"ی گەورە دەرهێنەری ئینگلیزی سەبارەت بە مایێرهۆڵد، و چەند دیمانەیەکی ڕاستەوخۆش لەگەڵ "لیج"دا لە شاری "بێرمنگهام".